# شکاری بیر

## صيد الخاطر

بەرگی دووەم

نووسینی
الإمام أبو الفرج عبد الرحمن ابن الجوزي

وەرگێڕانی
قاسم عەلی



دەزگای چاپ و پەخشی
نارین

# شكارى بير

(صيد الخاطر)

بەرگی دووەم

نووسینی

الإمام أبو الفرج عبدالرحمن إبن الجوزي

وەرگێڕانی

قاسم عەلی

دەزگای چاپ و پەخشی
ئاریەن

## ١٨٥- زیرەکی و دانایی

پێویستە کاری کەسی ژێر تێڕوانین بێت لە سەرەنجامەکان و خۆ بپارێزێت لەو شتەی کە دەکرێ ببێت.

هەڵەیە هەر ئێستات لەبەرچاو بێت کە باروگوزەران و تەندروستیت تەواو و بێ کێشەیە، ڕەنگە ئەوە تا سەر نەبێت و لێی بپچڕێت، پێویستە وەها کار بکات کە ئەو دۆخە دەگۆڕێت و کۆتایی پێ دێت، ئیتر خۆی بۆ گۆڕانکارییەکان ئامادە بکات.

هەروەها سەیری ئەو چێژە بکات کە تەواو دەبێ و نەنگی و گوناهەکەی دەمێنێتەوە، سەرنج بداتە ئەو تەنبەڵی و خۆش ڕابواردنەی ئێستا هەیەتی و ئەوەی دوای ئەوان دێت لە مانەوەی نەزانی.

هەروەها وەدەسهێنانی ئەو مەبەست و ئامانجانەی کە وەدی نایەن مەگەر بە وردەکاری و نەخشە و پلان نەبێ، بەتایبەتی ئەگەر بەرانبەرەکەت کەسێکی زیرەك بوو کە لە کەمترین ئاماژە تێ دەگات.

هەر کەسێك بیەوێ بەسەر کەسی زیرەکدا زاڵ بێت دەبێ ورد سەرنج بدات و خاوەن نەخشە و پلان بێت.

له کتێبەکانی زیت و زرنگیدا هەندێ شت باس کراون کە بیر و هزر تیژ دەکەن، هەندێکمان لە کتێبی (الاذکیاء) باس کردووە. بۆ نموونە: گێڕدراوەتەوە کە پیاوێك لە ئەشراف بۆ هیچ کەسێك هەڵنەدەستایەوە و لە کەسیش نەدەترسا، یەکێك لە وەزیرەکان بەلایدا تێپەڕی و سڵاوی لێ کرد، ئەویش نە وەڵامی دایەوە و نە هەستایەوە! (بێگومان وەرنەگرتنەوەی سڵاو ڕەوشتێکی ناشیرینە و نیشانەی خۆبەزلزانییە بەتایبەتی کە خوای گەورە لە قورئاندا فەرمانی کردووە بە وەڵامدانەوەی سڵاو.)

ئەو وەزیرە بە پیاوێکی گوت: بە فلان بڵێن من لەبارەیەوە لەگەڵ میری ئیمانداران قسەم کردووە و ئەو فەرمانی کردووە سەت هەزاری بدرێتێ، با بێت وەریگرێت.. پیاوەکە پێی وت، پیاوە شەریفەکە وتی: ئەگەر بە شتێك فەرمانی بۆ من کردووە ئەوا با بۆم بنێرێت، مەبەستی ئەو ئەوەیە کە بە هاموشۆکردنی لە پلە و پایەم دابەزێنێ!

هەر کاتێ مرۆڤ لەگەڵ زرنگێك لێی قەوما پێویستە خۆی لێ بپارێزێ و بە جۆرەها شێوە و ڕێگا خۆی لێ بدزێتەوە و سەیر بکات بزانێت چ شتێك ئەگەری ڕوودانی هەیە تا خۆی لێ بپارێزێ هەروەك چۆن یاریزانی شەترەنج سەرنجی جووڵاندنی بەردەکانی دەدات.

زۆرێك لە کەسە زیرەکەکان دەرەقەتی زرنگێك نەهاتوون بۆیە پوول و دراویان پێ بەخشیوە تا بە تەپکەیەوە بکەن، ئەگەر تێگەیشتنی کەم بووبێت ئەوا بە داوەوە

بووە، ئەگەریش لەوان زیرەکتر بووبێت ئەوا زانیویەتی ئەو ماستە مووەکی تێدایە بۆیە زیاتر خۆی پاراستووە.

لە هەمووان زیاتر دەبێ خۆت لەو کەسە بپارێزیت کە کەسێکی لێ کوژراوە و توانای تۆڵەکردنەوەی نییە، چونکە ئەگەر تۆ کەسێکت ئازاردا ئەوا لە دڵیدا دوژمنایەتییەکت چاندووە، ئەرخەیان مەبە لەوەی ڕۆژێك ڕقی خۆیت پێ بڕێژێ، گرینگیش بەو خۆشەویستی و دۆستایەتییە مەدە کە دەری دەخات تەنانەت ئەگەر سوێندیشی خوارد، ئەگەر لێی نزیك بوویتەوە وریابە.

ئەوە بێئاگاییە کەسێك سزا بدەیت یان خراپەیەکی گەورەی بەرانبەر بکەیت و بزانیت کە ئەوە دەبێتە هۆی نوێکردنەوەی ڕق و کینە، ببینیت ملکەچ و سەرکزە بۆت و وازی لە کردەوەکەی هێناوە و دەگەڕێتەوە لات و تۆش بە خۆشییەوە پێشوازی دەکەیت و ئەوەی بەرانبەرت کردووە لەبیری دەکەیت و پێت وایە هیچی لە دڵدا نەماوە! ڕەنگە داوت بۆ دابنێتەوە و سەرئێشەت بۆ دروست بکات هەروەك بۆ چەندان کەس ڕوویداوە.

نەکەیت لەگەڵ کەسێك لە شوێنێك نیشتەجێ بیت و بمێنیتەوە کە ئازارت داوە، بەڵکوو ئەگەر هەر ناچار بوویت ئەوا با لە دەرەوە بێت، چونکە ڕق و کینەکان جێی دڵنیایی نین.

هەر کاتێ دیتت دوژمنەکەت بێئاگاییەکی تێدایە ئەوا چاکەی لەگەڵ بکە دوژمنایەتییەکەتی بیردەچێتەوە و وا گومان نابات کە تۆ لە بەرانبەر کردەوە

ناشیرینەکەیدا شتێکت لە دڵ گرتووە، ئەو کات دەتوانیت دەستت بگات بە هەر شتێکی و مەبەستەکەت بێنیتەدی.

ئەوە لاوازییە دوژمنایەتی بۆ دوژمنەکەت دەرخەیت. باشترین ڕێوشوێن ئەوەیە لەگەڵ دوژمنان لەسەرخۆ و نەرم بیت تا ئەوەی دەتوانی هێز و توانایان تێك بشکێنیت، ئەگەر ئەوەش نەکرێت ئەوا نەرم و نیانی هۆکارێکە بۆ دوورخستنەوەی ئەزیەت و ئازارەکانیان، هەیانە شەرم لە کردەوەی باشت دەکات و دڵی بەرانبەرت دەگۆڕێ.

کۆمەڵێك لە پێشینان ئەگەر پێیان گەیشتبایە کە یەکێك جنێوی پێداون ئەوا دیارییان بۆ دەنارد و بەخششیان دەدایە، بەوە خۆیان لە خراپە و زیانیان دەپاراست و دڵیان دەگۆڕین، بەوەش مۆڵەتیان دەبوو کە ئەگەر بیانویستایە شتێکیان لێ بکەن پلان و نەخشەیەك دابنێن.

بیر و زەینێك کە سەیری سەرەنجامەکان بکات و سەرنجدانی هەموو مومکینێك بۆ مرۆڤ بەسە کە پەروەردە و تەنبێی بکات.

## ١٨٦- شاردنەوەی نهێنییەکان

دیتم زۆربەی خەڵك ناتوانن نهێنییەکانیان بڵاو نەکەنەوە و بپارێزن، کە بڵاویش بوویەوە گلەیی لەوانە دەکەن کە ئاشکرایان کردووە.

چەند سەیرە! چۆن خۆیان ناتوانن نهێنییەکەیان ڕابگرن و پاشان سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکەن کە بڵاوی کردۆتەوە؟!

لە فەرموودەدا هاتووە دەڵێ: ((استعينوا على قضاء حوائجكم بالكتمان فإن كل ذي نعمة محسود)) واتە: کاروبارەکانتان بەنهێنی و شاراوەیی ئەنجام بدەن چونکە هەموو بەهرەدارێك ئێرەیی پێ دەبردرێ.

بەدڵنیاییەوە نەفس شاردنەوەی شتی لەلا سەختە و بە ئاشکراکردنی هەست بە ئاسوودەیی دەکات بەتایبەتی ئەگەر نەخۆشی یان خەم یان عیشقێك بێت..وا پێویستە ئەم شتانە بشاردرێنەوە چونکە ئەگەر بەر لە تەواوبوونی کارێك ئاشکرا بوو ئەوا مەبەست و کارەکە پووچەڵ دەبێتەوە، ئەوەشی ئەم جۆرە کارە دەکات هیچ بیانوویەکی بۆ نامێنێتەوە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر ویستبای سەفەر یان غەزایەك بکات بە شتێکی تر پەردەپۆشی دەکرد.
ئەگەر یەکێك وتی: من قسە بۆ کەسێك دەکەم کە متمانەم پێیەتی.

پێی دەوترێ: هەر قسەیەك لە دوو كەس تێپەڕی بڵاودەبێتەوە(قسە كەوتە زارەكی كەوتە شارەكی)، ڕەنگە هاوڕێكەت نهێنی نەپارێزێ.پیاوی پەیت و گورج و دووربین ئەو كەسەیە كە نهێنییەكەی لێ دەرناچێ و بۆ كەسی ئاشكرا ناكات.

ئاشكراكردنی نهێنی بۆ منداڵ و ژن جۆرێكە لە دەستەوسانی. ماڵ و داراییش لە بابەتی نهێنییە و ئاگاداركردنی ژن و منداڵ لێی ئەگەر زۆربێت ئەوا خۆزگەی مردنی خاوەن میرات دەخوازن، ئەگەریش كەم بێت ئەوا بە بوونی خاوەن میرات بێزارن، ڕەنگە بە ئەندازەی زۆریی ماڵ و سامان داوای زۆر بكەن، ئیتر بە هۆی زۆر خەرجییەوە كابرا لەناوبچێت.

هەروەها شاردنەوەی بەڵا و نسكۆكان لە بابەتی شاردنەوەی نهێنییە چونكە دەرخستنی: نەیار دڵخۆش دەكات و دۆست ئازار دەدات.

هەروەها پێویستە ئەندازەی تەمەنیش بشاردرێتەوە چونكە ئەگەر گەورە بوو ئەوا بەپیری دادەنێن و ئەگەریش بچووك بوو ئەوا سووك سەرنجی دەدەن.

ئەوەی زۆرێك لە كەمتەرخەمان تێیدا ڕۆچوون ئەوەیە لەنێو هاوڕێكانیان باسی میر یان دەسەڵاتدارێك دەكەن ئەو قسەیەش پێی دەگاتەوە و دەبێتە هۆی تێداچوونی.

ڕەنگە پیاو لە هاوڕێیەکەیدا دڵسۆزییەکی تەواو بەدی بکات و نهێنییەکەی بۆ ئاشکرا بکات. شاعیر وتوویە:

إحذر عدوك مرة واحذر صديقك ألف مرة

فلربما انقلب فكان أدرى بالمضرة

واتە: جارێك وریای دوژمنەکەت بە بەڵام هاوڕێیەکەت هەزار جار، چونکە ئەگەر هاوڕێ هەڵگەڕێتەوە ئەوا مەترسیدارترە و باشتر دەتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ چونکە شارەزایی کەموکورتیی و خاڵە لاوازەکانتە.

ڕەنگە کەسێك نهێنیی خۆی بۆ ژنەکەی یان هاوڕێیەکەی ئاشکرا بکات بەوەش ببێتە دیلی دەستی ئەو و بوێری ئەوەی نەبێ ژنەکەی تەڵاق بدات و واز لە هاوڕێیەکەی بێنێت لە ترسی ئەوەی نهێنییە ناشیرینەکەی ئاشکرا بێت.

کەسی خاوەن بڕیار و دووربین ئەوەیە کە بە ڕواڵەت مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکات و نهێنیی خۆی بپارێزێت، ئەگەر ژن یان هاوڕێ یان خزمەتکار لێی جودا بوویەوە هیچ یەکێکیان نەتوانن شتێك لەبارەیەوە بڵێن کە پێی ناخۆش بێت.

لە گەورەترین نهێنییەکان کاتی تەنیاییە، با کەسی خاوەن بڕیار وریا بێت لەوەی بە بەرچاوی خەڵکەوە پێی لێ ڕاکێشێ و کراوە بێت..

هەرکەسێکیش هۆش و بیرێکی تیژی پێدرابێت ئەوا بەر لە ئامۆژگاری، ئەو بیروهۆشە ڕێگای ڕاستی نیشان دەدات.

## ١٨٧- لەبەرکردن و بیرهاتنەوە

هیچ شتێکم نەبینیوە لەسەر نەفس سەختتر بێت لە لەبەرکردن و دووبارەکردنەوەی زانست بەتایبەتی دووبارەکردنەوەی ئەو شتانەی لە دووبارەکردنەوە و لەبەرکردنیدا هیچ بەشێك بۆ نەفس نییە وەکوو مەسەلەکانی فیقه، بە پێچەوانەی شیعر و هەڵبەست ئەگەر گرانیش بێت هەر لە دووبارەکردنەوەیدا چێژ هەیە، چونکە جارێك و دووان چێژی لێ دەبینیێ، ئەگەر دووبارەکردنەوە زۆر بوو ئەوا لەسەری قورس دەبێ بەڵام وەکوو قورسیی فیقه و ئەوانیتر نا، دەبینیت نەفس ئارەزووی فەرموودە و شیعر و کتێب دانان و لەبەرگرتنەوە دەکات چونکە شتێکی نوێ دەبینیێ، لە واتاشدا وەکوو ئاوی ڕەوانە، چونکە بەش دوای بەشە، هەروەها ئەوەی ئەو شتە لەبەردەگرێتەوە کە حەز دەکات ببیستێ یان داینێت، چێژ لە نوێیەتی وەردەگرێت و لە ماندووبوونی دووبارەکردنەوە ئیسراحەت دەکات.

بەڵام بۆ کەسی ژیر وا پێویستە کە زۆربەی کاتی بۆ دووبارەکردنەوە بێت بەتایبەتی منداڵ و لاو، بابەتی لەبەرکراو وەها لە مێشکیان دەچەسپێ کە لانەچێت، ئەو کاتانەی لە دووبارەکردنەوە ماندوو دەبێ با بۆ لەبەرگرتنەوە بێت، ئەو کەسەی شت لەبەر نەکات لە کاتی وردبوونەوە و فەتوا پەشیمان دەبێتەوە..

له لەبەرکردندا خاڵێك هەیە دەبێ تێبینی بکرێ ئەویش ئەوەیە کە فەقیە وانەکە لەبەر دەکات و دووبارەی دەکاتەوە پاشان وازی لێ دێنێ و لەبیری دەچێتەوە، ئیتر بۆ لەبەرکردنی پێویستی بە کات و زەمانێکی ترە، بۆیە پێویستە لەبەرکردنەکە بەهێز بکات و زۆر دووبارەی بکاتەوە تاوەکوو بناغەی لەبەرکردن جێگیر و دامەزراو بکات.

(ئەم بابەتە هەندێکی زۆر کۆنە و لە ئێستادا ئەم شێوازە لە هیچ شوێنێك پەیڕەو ناکرێت بەتایبەتی لەبەرکردنی دەقە فیقهییەکان و لەبەرگرتنەوە کە مەبەست لە لەبەرگرتنەوە نووسینەوەی کتێبە بە دەست چونکە جاران چاپخانە نەبووە و کتێب بە دەست نووسراوەتەوە).

## ١٨٨- دووره‌په‌رێزی له‌ خه‌ڵك

وا نازانم شتێك هه‌بێ له‌ دووره‌په‌رێزی له‌ خه‌ڵك به‌سوودتر، به‌تایبه‌تی بۆ زانا و زاهید، به‌شی زۆری خه‌ڵك یان به‌ شكست و نووچدانت دڵخۆشه‌ یان ئێره‌یی به‌ نیعمه‌ت ده‌بات یان هه‌ڵه‌كانت ده‌ژمێرێ!

ئای دووره‌په‌رێزی و گۆشه‌گیری! چه‌نده‌ به‌چێژه‌!

له‌ غه‌یبه‌ت و خۆنواندن و له‌ناخه‌وه‌ دوژمنایه‌تیكردن و كات به‌فیڕۆدان...پاشان دڵ به‌ بیركردنه‌وه‌ مژوول ده‌بێ چونكه‌ پێشتر چێژی له‌ تێكه‌ڵبوون وه‌رگرتووه‌ و بێئاگا بووه‌، كاری دونیا و ئاخیره‌تی ڕێك ده‌خات، نموونه‌ی وه‌كوو پارێزیكردنه‌ كه‌ ده‌بێته‌ هۆی ساغ و سه‌لامه‌تی گه‌ده‌ و ڕیخۆڵه‌كان.

كه‌سم نه‌دیوه‌ وه‌كوو ئه‌وه‌ی كه‌سی تێكه‌ڵ ده‌یكات، چونكه‌ حاڵی ئێستای له‌ دیدار و قسه‌ی خه‌ڵكدا ده‌بینێ و له‌و كاره‌ی له‌به‌رده‌میه‌تی بێئاگا ده‌بێ وه‌كوو كه‌سێك وایه‌ كه‌ بیه‌وێ به‌م نزیكانه‌ سه‌فه‌رێك بكات، ئیتر له‌گه‌ڵ خه‌ڵكێك دابنیشێت و به‌ قسه‌كردن سه‌رقاڵی بكه‌ن تا كاتی سه‌فه‌ره‌كه‌ هات و كاروان به‌ڕێكه‌وت و ئه‌ویش هێشتا خۆی ئاماده‌ نه‌كردووه‌ و توێشووی سه‌فه‌ری ئاماده‌ نه‌كردووه‌!

ئەگەر لە گۆشەگیری و دوورەپەرێزیدا هیچ سوودێك نەبێ جگە لە بیرکردنەوە لە توێشووی سەفەر و سەلامەتیی لە خراپەی تێکەڵبوون ئەوا ئەوەندە بەسە.

پاشان لە ڕاستیدا گۆشەگیری تەنها زانا و زاهید تێی دەگەن و سوودی لێ دەبینن چونکە ئەوان مەبەستی دوورەپەرێزی دەزانن ئەگەر لە گۆشەگیریشدا نەبن.

زانا، زانستەکەی هاودەمیەتی و کتێبەکانی ئاخێوەرین و سەیرکردنی ژیاننامەی پێشینان هەڵسەنگێنەر و ڕاستکەرەوەن بۆی، بیرکردنەوە لە ڕووداوەکانی سەردەمی پێشوو دەروویەتی، ئەگەر بە زانستەکەیەوە بۆ پایەی مەعریفەی تەواوی خودا هەڵکشا و خۆی بە لچکی خۆشەویستیی ئەو هەڵواسی ئەوا چێژ و خۆشییەکانی چەند قات دەبنەوە و سەرقاڵ دەبێ لە بوونەوەر و ئەوەی تێیدایەتی، لەگەڵ خۆشەویستەکەی تەنها دەمێنێتەوە و دەکەوێتە خەڵوەت و بە گوێرەی زانستەکەی لەگەڵیدا کار دەکات.

هەروەها زاهید، خواپەرستییەکەی هاودەمیەتی و خوداکەی هاونشینیەتی، ئەگەریش شتێکیش لە خوداوە بۆی کەشف بوو ئەوا لە خەڵك بێئاگا دەبێ و ئەوانیش لێی بێئاگا دەبن.

ئەمە دوورەپەرێزییە لەو شتانەی مایەی ئازار و ناخۆشین، ئەوان لەنێو کۆمەڵیشدا هەر لە تەنهاییدان.

ئەم دوو جۆرە کەسە لە خراپەی خەڵك سەلامەت و پارێزراون و خەڵکیش لە خراپەیان پارێزراون، بەڵکوو ئەوان پێشەنگی خواپەرستان و مەشخەڵی ئەوانەن کە

ڕێی خودایان گرتووه، گوێگر سوود لە قسەیان وەردەگرێ و ئامۆژگارییەکانیان فرمێسك لە چاوان دەبارێنن و سام و شکۆیان لە کۆڕ و کۆمەڵگە بڵاو دەبێتەوە، هەر کەسێك بیەوێت چاو لە یەکێکیان بکات با ئارام لەسەر خەڵوەت و تەنهایی بگرێ ئەگەر پێشی ناخۆش بێت تاوەکوو ئارامگرتن هەنگوینی بۆ بەرهەم بێنێ.

پەنا بە خوا لە زانایەکی تێکەڵ بە دونیا و جیهان بەتایبەت تێکەڵبوون لەگەڵ ساماندار و دەسەڵاتداران کە بەدڵنیاییەوە کارلێك دەکەن و ڕەنگە تووشی فریوخواردن ببن، هەر شتێکی لە دونیا دەست بکەوێ ئیللا هاوشێوەی ئەم دەسکەوتنە بەشێك لە دینەکەی دەڕوات.

پاشان کوا سەربڵندی و خۆبەدوورگرتن لە زەلیلی بۆ لەڕێلادەران(فساق)؟!

ئەوەی بایەخ بەوە نەدا ئەو کەسەیە کە تامی زانست ناکات و نازانێ مەبەست لێی چییە، وەکوو ئەوەیە بکەوێتە خاکێکی قاقڕ و بیابانێکی وشکی لەناوبەر.

هەروەها زاهیدیش ئەگەر تێکەڵ بوو و تێکەڵ و پێکەڵی کرد ئەوا بەرەو ڕووپامایی و خۆنواندان و دووڕوویی دەچێت و دونیا و ئاخیرەتی لەدەست دەچێت، نە خۆشیی دونیای چنگ دەکەوێت و نە ئاخیرەت.

لە خودای گەورە دەپاڕێینەوە خەڵوەتێکی شیرین و دوورەپەرێزییەکی بەچێژی دووربوون لە خراپەمان بداتێ کە بە هۆیەوە چاك و شیاومان بکات بۆ موناجات و لاڵانەوەی و خواستی ڕزگاربوون بخاتە نێو دڵی هەر یەکێکمانەوە، هەر ئەو نزیك و نزاگیرایە.

## ١٨٩- خۆئامادەکردن بۆ دیداری خودا

ئەو کەسە چەند گەمژەیە کە نازانێ کەی مردن دێت و خۆیشی بۆ دیداری ئامادە ناکات!

لە هەموو خەڵك گەمژەتر و بێئاگاتر ئەو کەسەیە کە تەمەنی شەست ساڵی تێپەڕاندووە و لە حەفتا نزیك بۆتەوە — ئەوەی لە نێوان ئەم دوو تەمەنەدایە شەڕگەی مردنە، هەر کەسیش بچێتە نێو شەڕگەوە دەبێ خۆی ئامادە بکات — لەگەڵ ئەوەشدا لە خۆئامادەکردن بێئاگایە.

قالوا الشبابُ لعلنا في شَيبنا      نَدَعُ الذنوبَ فما يقولُ الاشيَبُ

لاوەکان دەڵێن بەڵکوو لە پیریدا واز لە گوناه بێنین...

سوێند بە خوا، پێکەنینی پیر هیچ واتایەکی نییە و گەمە و گاڵتەکردنی واتایەکی ساردوسڕی هەیە، گرینگیدانی بە دونیا — کە دونیا لە خۆیشی دوورخستۆتەوە — هێز و تواناکان لاواز و بیروبۆچوون سست دەکات.

ئایا بۆ کەسی شەست ساڵ ماڵێك ماوەتەوە؟!

ئەگــەر تــەما و ئــاواتی حــەفتا ســاڵەی هــەبوو ئــەوا بــە زەحمەتییــەکی زۆرەوە بــۆی بــەرز دەبێتــەوە: ئەگــەر هەســتایەوە دەســتی دەخاتــە ســەر زەوی و هەڵدەستێتەوە، ئەگەر ڕۆیشت هەناسەبڕکێی پێ دەکەوێت، ئەگەر دانیشت هەناسەی تەنگ دەبێت..حەز و ئارەزووەکانی دونیا دەبینێ و ناتوانێ بەدەستیان بێنێ، ئەگەر خواردی گەدەی ماندوو دەبێ و هەرسی قورس دەبێ، ئەگەر پەڕی ژنەکە ئازار دەدات و نەخۆش دەکەوێت و تا ماوەیەکی درێژ ناتوانێ ئەو هێز و توانایەی لە دەستی چووە وەدەست بێنێتەوە، وەکوو دیلێك دەژی.

ئەگەر تەما و ئاواتی هەشتا ساڵی بوو ئەوا وەکوو منداڵ بە گاگۆڵکە بۆی دەخشی.

وعَشرُ الثّمانينَ مَن خاضَها فإنّ المُلِمّاتِ فيها فُنونُ

هەر کەسێ بچێتە نێو تەمەنی هەشتا ساڵییەوە ئەوا ئەو تەمەنە جۆرەها کێشە و دەرد و بەڵای تێدایە.

ژێر ئەو کەسەیە لە کات و ساتەکانی زەمان تێگەیشتووە:

بەر لە پێگەیشتن منداڵێك بووە و هیچی لەسەر نەبووە مەگەر زیرەکییەکی پێ بدرێ، لە هەندێ منداڵ زیرەکییەك هەیە کە لە گچکەییەوە هانیان دەدات بۆ وەدەسهێنانی ئاکاری جوان و زانست و زانیاری.

کە پێگەیشت، با بزانێ ئەو تەمەنە سەردەمی دژایەتیکردنی ئارەزوو و فێربوونی زانستە.

ئەگەر منداڵی پێدرا ئەوا سەردەمی کارکردن و پەیداکردنی بژێوی و سەوداکردنە.

کە گەیشتە چل ساڵی، تێروتەواوییەکەی کۆتایی هاتووە و بەرەو شۆڕبوونەوەیە.

كأنَّ الفتى يرقى من العُمرِ سُلَّما          إلى أن يجوزَ الأربعينَ وينحطُّ

تەمەن وەکوو پلیکانەیەك وایە، کە تەمەنی چل ساڵیت تێپەڕاند بەرەو خوار دەبێتەوە.

پێویستە لە تەمەنی چل ساڵییدا هەموو هەوڵ و خەمی بۆ توێشوو کۆکردنەوە بۆ ئاخیرەت بێت و هەموو چاوی لەسەر داهاتووی بێت و ئامادەکاری بکات بۆ کۆچکردن..

ئەگەر گەیشتە شەست ساڵی، ئەوا خوای گەورە لە تەمەنیدا ئینسافی لەگەڵدا کردووە و زۆربەی تەمەنی بەسەربردووە، با بە هەموو توانایەوە ڕوو بکاتە کۆکردنەوەی زەخیرەی ئاخیرەت و ئامادەکردنی ئامراز و کەلوپەلی سەفەر و باوەڕی وابێت هەر ڕۆژێکی تێیدا دەژی دەسکەوتێکی حیساب بۆ نەکراوە بەتایبەتی ئەگەر لاوازی و بێتاقەتی زۆر بوو و بەسەریدا زاڵ بوو.

هەرچەند تەمەنى هەڵكشا پێويستە هەوڵ و كۆششى زياتر ببێت. كە گەيشتە هەشتا ساڵى، هيچ شتێك نامێنێ جگە لە ماڵئاوايى، ئەو تەمەنەى ماوەتەوە تەنها خەم و داخ و ئۆفە لەسەر كەمتەرخەمييەك يان خواپەرستييەك لەسەر لاوازى و سستى.

داواى لە خوداى گەورە دەكەين بێدارييەكى تەواوى وەهامان بداتێ كە نووستنى بێئاگايانمان لێ دووربخاتەوە و هەروەها كردەوەيەكى باشى وامان پێ ببەخشێ كە لە ڕۆژى دواييدا پەشيمان نەبينەوە.

## ١٩٠- كات بەفیڕۆدان لە لێكۆڵینەوەی بێكەڵك

پێشینان جڵەوگیرییان لە ڕۆچوون لە قسەكردن نەكردووە تەنها لەبەر شتێكی گەورە نەبێت ئەویش ئەوەیە مرۆڤ دەیەوێ بڕوانێتە هەندێ بابەت و لێیان بكۆڵێتەوە كە چاو و دیدەی وی توانای بەسەردا نییە، ڕەنگە بپەشۆكێت و بەرەو داخران و داپۆشین بچێت..چونكە گەر ئێمە سەرنجی زاتی بەدیهێنەرمان دا ئەوا ئاوەز (عقل) گومڕا و سەرگەردان دەبێ و هەستی تاساو دەبێ چوون شتێك نازانێ كە سەرەتای نەبێ! چونكە ئەو تەنها (جسم و جوهر و عرض) دەزانێ، سەلماندن و چەسپاندنی شتێك لەمانە دەرچێت تێی ناگات.

ئەگەر سەیری كردەوەكانی خودا بكەین دەبینین شتێك بنیات دەنێ پاشان هەڵیدەوەشێنێتەوە! ئێمەش لەو حیكمەتە تێ ناگەین.

بۆ كەسی ژیر وەها باشترە كە چاو نەبڕێتە ئەو شتانەی كە ناتوانێ سەرنجیان بدات و لێیان بكۆڵێتەوە.

هەر كاتێ ئاوەز بە دروستكراوەكانییەوە سەیری بەڵگەی بەدیهێنەری كرد و ناردنی پێغەمبەرانی بە ڕەوا زانی و پەرجووەكانی كردە بەڵگە و نیشانە ئەوا ئەوەندە بەسە و پێویست ناكات بچێتە بنج و بناوانی ئەو شتانەی پێویستی پێیان نییە.

ئەگەر بە بەڵگەی ئایەتی: قَالَ تَعَالَى: ﴿حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ﴾ (التوبة: ٦) وتی قورئان قسە و وتەی خودایە ئەوا ئەوەندە بەسیەتی.

بەڵام کەسێك لە وردەکاریی ناپێویستی ناو قورئان بکۆڵێتەوە ئەوا کات و زەمان بێ ئەوەی هیچی دەستکەوێت بەفیڕۆ دەدات، مەبەست لە خوێندنەوەی قورئان کارکردنە بەوەی تێی گەیشتووە.

گێڕدراوەتەوە کە پاشایەك نامەیەکی بۆ کاربەدەستەکانی لە هەرێمەکان نووسی و وتی: وا دێم بۆ لاتان، ئەمە و ئەوە بکەن! هەموویان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد تەنها یەکێکیان نەبێت، دانیشت هەر بیری لە نووسراوەکە دەکردەوە و دەیوت: ئایا دەبێ بە چی نووسیبێت؟! بە دانیشتنەوە نووسیویەتی یان بەپێوە؟! ئیتر هەر بیری لەمانە دەکردەوە تا پاشا هات و هیچ شتێك لە فەرمانەکانی جێبەجێ نەکردبوو! پاشا خەڵاتی هەموانی کرد و ئەمیشی کوشت..

## ١٩١- چێژی ڕاستەقینە

دونیاویستان لە چێژی نێو دونیا بێئاگا بوون، چێژیشی تەنها لە گەورەییی زانست و گوڵی پاکداوێنی و ژیانی سەربڵندانە و شکۆی قەناعەت و شیرینیی چاکەکردن لەگەڵ خەڵکدایە.

وەلێ چێژوەرگرتن لە خواردن و پەڕین (سەرجێی) کاری ئەو کەسەیە کە هیچ لە چێژ نازانێت، چونکە ئەمە لە خودی خۆیدا مەبەست و ویستراو نییە بەڵکوو دانانی جێگرەوەیە لە جەستە و منداڵدا و قەرەبووکردنەوەیانە (واتە نان و سەرجێی تەنها بۆ مانەوەی جەستە و خستنەوەی منداڵە).

چ چێژێك لە سەرجێی هەیە کە بەر لە کردن چێژ نییە، لە کاتی کردنیش شلۆق و ناجێگیرە، لە کاتی تەواوبوونیش وەکوو ئەوەیە نەبوویێت، پاشان دەبێتە هۆی لاوازیی جەستە؟!

ئەی چ چێژێك لە کۆکردنەوی ماڵدا هەیە کە جگە لە پێویستی، ئەو کەسە دەکاتە کۆیلە کە کۆی دەکاتەوە و هەڵیدەگرێت، بەردەوام لە خەمیدایە و وریایەتی، ماڵێکی کەم هانی دەدا بۆ زیاتر.

ئەی چ چێژێك لە خواردندا هەیە، لە کاتی برسێتیدا خۆش و ناخۆشی وەکوو یەکە، ئەگەر زۆری خوارد ئەوا ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە؟!

عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب خودا لێی ڕازی بێت وتوویەتی: فیتنە لەسەر سێ شت بنیات نراوە: ژنان کە داو و تەڵەی دانراوەی ئەهریمەنن، خواردنەوە کە شمشێری تیژیەتی، دینار و درهەم کە دوو تیری ژەهراوین.

هەر کەسێك بەرەو لای ژناندا شکاندیەوە ئەوا ژیانی خۆش نابێ، هەر کەسێکیش حەزی لە خواردنەوە بوو ئەوا سوود و بەهرە لە عەقڵی وەرناگرێ، هەر یەکێکیش دینار و درهەمی خۆشویست ئەوا تا لە ژیاندایە هەر کۆیلەیانە.

## ١٩٢- چوواندنی بەدیهێنەر بە بەدیهێنراوەکان

بنەچەی هەموو بەڵا و مەینەتییەك لە بیروباوەڕدا قیاسی کاری خودایە لەسەر حاڵوباری خەڵك.

هەر کەسێك قیاسی سیفەتی خودای لەسەر سیفاتی خەڵقدا کرد ئەوا بەرەو بێباوەڕی چووە.

هەروەها کار و بەڕێوەبردنی خودا، هەر کەسێ بە شێوەی عادەتی تێی گەیشت و لێکیدایەوە ئەوا پێی وایە سەربڕینی ئاژەڵ باش نییە و نەخۆشییەکان بە ناشیرین دەبینێ و دەوڵەمەندکردنی گەمژە و هەژاری ئازای عاقڵ بە پێچەوانەی حیکمەت دادەنێ.

ئەمە سەبارەت بە دۆخی نێوان خەڵق، بەڵام سەبارەت بە خودای گەورە ئەوا عەقڵ پەی بە حیکمەتی نابات.

بەڵێ، لە کن کەسی ژیر بوون و خاوەنداریێتی و حیکمەتی خودا سەلماوە و چەسپاوە، بەڵام باسکردنی وردەکارییەکان بە شێوەی عادەتی خەڵق ئەوا نەزانی و نەفامییە.

ئەی نابینی یەکەم ناڕازی و ڕەخنەگر کە ئیبلیسە چۆن مشتومڕی لەگەڵ خودا کرد و وتی: قَالَ تَعَالَى: ﴿أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ﴾ (الأعراف: ١٢) واتە: من لە ئادەم باشترم..
هەروەها (ئەبوو عەلائی مەعەڕری) جێنشینی ئیبلیس وتوویە:

رأى منكَ ما لا يشتهي فتَزَندقا

مرۆڤ شتێکی لە تۆ بینیوە کە پێی خۆش نەبووە بۆیە بێباوەڕ بووە..

ئایا ئێمە زێدەباری پەیبردن بە زاتی خودا دەتوانین کردەوەکانی لێکبدەینەوە و شی بکەینەوە و هۆدۆزی بۆ بکەین؟! ئیتر چۆن کاروباری وی لەسەر حاڵوباری خۆمان قیاس بکەین؟!

ئەگەر بینیمان کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) داوا لە خودا دەکات ڕێی پێ بدات داوای لێخۆشبوون بۆ دایك و باپیری بکات و لێی قەبووڵ ناکرێ و لە برسان تلاوتل دەکات و دونیاش لەبەردەستیدایە، هاوەڵەکانی دەکوژرێن و سەرکەوتنیش بە دەست خوداکەیەتی، ئایا ئەمە مایەی سەرسامی نییە؟! ئیتر ئێمە چین تا ڕەخنە لە خودایەکی خاوەن موڵك بگرین کە حیکمەتی سەلماوە و موڵکی دامەزراوە و جێگیر بووە؟!

## ١٩٣- پلەی بەرز بە ماندووبوون نەبێ وەدەست نایەت

سەرنجی شتێکی سەیرم دا ئەویش ئەوەیە کە هەموو شتێکی بەهاداری گرینگ ڕێگاکەی دوور و درێژە و وەدەسهێنانی ماندووبوونی زۆرە.

زانست کە بەڕێزترینی شتەکانە، بە ماندووبوون و شەونخوونی و دووبارەکردنەوە و پشتکردنە خۆشی و چێژ و ئیسراحەتەکان نەبێ وەدەست نایەت، تەنانەت زانایەك وتوویەتی: سالآنێك بوو حەزم لە هەریسە دەکرد نەمدەتوانی چونکە کاتی فرۆشتنی کاتی گوێگرتن لە وانە بوو!

وەدەسهێنانی سامان و پارەش بە هەمان شێوەیە، پێویستی بە سەرچڵی و سەفەر و ماندووبوونی زۆرە.

هەروەها وەدەسهێنانی شەرەف و گەورەیی بە بەخشندەیی و نانبدەیی پێویستی بەوەیە لە بەخشینی شتی خۆشەویست و لە دڵدا شیرین جیهادی نەفس بکەیت، ڕەنگە بەخشندەیی ببێتە هۆی هەژاری.

هەروەها ئازایەتی، بە خۆخستنە مەترسییەوە نەبێ وەدەست نایەت.

(المتنبی)ی شاعیر وتوویە:

لَوْلا المَشَقّةُ سَادَ النّاسُ كُلُّهُمُ    الجُودُ يُفْقِرُ وَالإقدامُ قَتّالُ!!

ئەگەر سەختی و ناخۆشی نەبووایە ئەوا هەموو خەڵك دەبوونە گەورە و پێشەوا، بەخشندەیی مرۆڤ هەژار دەخات و سینگ دەرپەڕاندن و بەرەو مەیدان چوون بکوژە.

هەر لەم بابەت و جۆرە وەدەسهێنانی پاداشتە لە ئاخیرەت، ئەو پاداشتە بە ئەندازەی هێزی کۆشش و خواپەرستی زیاد دەبێت یان بە ئەندازەی کاریگەری ماڵی بەخشراو لەسەر نەفس، یان بە ئەندازەی ئارامگرتن لەسەر لەدەستدانی کەسی خۆشەویست و ڕێگرتن لە نەفس لە بێتاقەتی و ناڕەزایی.

هەروەها زوهدیش پێویستی بە ئارامگرتنە لە ئارەزوو. پاکداوێنیش بە گرتنەوەی چڵێسی نەبێ نابێت. ئەگەر ئەو چەرمەسەرییانەی گرفتاری بوو نەبووایە بە یوسف نەدەوترا: ﴿أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ﴾ (یوسف: ٤٦) واتە: ئەی ڕاستگۆ..

خەڵكێك هەن بە وەدەسهێنانی هەموو ڕەوشتە باشەکان نەبێ ڕازی نابن، لە هەموو زانستێك زیادەڕەوی دەکەن و لە هەموو کارێکدا کۆشش دەکەن، لەسەر هەموو کار و ڕەوشتێکی جوان بەردەوام دەبن، ئەگەر لە هەندێ لەمانە جەستەیان لاواز و سست بێت ئەوا نییەت و نیازەکانیان جێیان دەگرنەوە و دەسپێشخەری و پێشبڕکە دەکەن.

تێروتەواوترین حاڵوباریان پشتکردنیانە لە کردەوەکانیان، لەگەڵ ئەوەی بەتەواوی ئەنجامی دەدەن بەڵام هێشتا بە کەم و سووکی دەزانن و لە کەمتەرخەمییەکان داوای لێبووردن دەکەن. هەیانە لەمە زیاتر دەکات، لەسەر یارمەتیدان بۆ ئەوە بە

سوپاسگوزاری سەرقاڵ دەبێ. هەیانە هەر ئەوە نابینێ کە کردوویەتی چونکە پێی وایە خۆی و کردەوەکەی بۆ گەورەکەیەتی.

پێچەوانەی ئەوانەی باسمان کرد حاڵی ئەهلی تەنبەڵی و چلێسی و ئارەزووەکانە، ئەگەر خۆشییەکی کاتییان وەرگرت وێڕای ماندووبوون گرفتاری هەموو خەم و پەژارەیەك دەبن.

هەر کەسێك سەرنجی ئارامگرتنی حەزرەتی یوسف و پەلەپەلی (ماعزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی) بدات جیاوازییەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە و لە قازانج و زەرەر تێ دەگات.

(ماعز ئەو پیاوە بوو کە زینای کرد و خۆی هاتە کن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دانی بەتاوانەکەیدا نا و سزای خۆی وەرگرت).

سەرنجم دایە دەست خستنی مرواری لە دەریا، دیتم دوای ماندووبوون و ناخۆشییەکی زۆر وەدەست دێت.

هەر کەسێك بیربکاتەوە لەوەی باسم کرد نموونەکانی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

سەرکەوتوو ئەو کەسەیە سەرنج بداتە کورتی وەرزی کارکردن و درێژیی ئەو کات و زەمانەی کۆتایی نییە، تەنانەت ساتێکیش بێت دەیقۆزێتەوە و هەموو ڕەوشتێکی باش وەدەست دێنێ چونکە ئەگەر ئەوانە لەدەست چوون ئەوا پێ گەیشتن و وەدەسهێنانەوەیان بۆ نییە.

ئەی لە فەرمووددەدا نەهاتووە کە ((لە ڕۆژی دوایی بە مرۆڤ دەوترێ: بخوێنە و بەرزبەوە، شوێن و جێت لە کن دوا ئایەتە کە دەیخوێنیت)) حسن صحیح، ئەحمەد و ئەبوو داوود و چەندانی تر گێڕایتیانەوە.

ئەگەر بیر بەڕاستی لەمەدا کار بکات ئەوا بەخێرایی هەموو قورئانی لەبەردەکرد.

## ١٩٤- حەقیقەتی ئیمان

ئیماندار ئەو کەسە نییە کە تەنها بە رووکەش فەرزەکان ئەنجام دەدات و لە قەدەغەکراوەکان دوور دەکەوێتەوە!

ئیماندار ئەو کەسەیە کە ئیمانی تێروتەواوە، گلەیی و نارەزایی لە دڵیدا نییە، لەوەی ڕوودەدات و دەگوزەرێ هیچ وەسوەسەیەك ناچێتە دەروونیەوە، هەرچەند بەلا و ناخۆشی بەسەربێت و لەسەری توند بێت ئیمانی زیاد دەبێ و تەسلیمبوونی بەهێز دەبێ، کە دوعای کرد و هیچ گیرابوونێکی هەست پێ نەکرد ئەوا لە ناخەوە هیچ ناگۆڕێ چونکە دەزانێ ئەو موڵکی ئەو خودایەیە کە بە گوێرەی ویست و ئیرادەی خۆی ڕەفتار دەکات. ئەگەر پەلپ و گلەییەك بە دڵیدا گوزەری کرد ئەوا لە پایەی بەندایەتی بەرەو پایەی مشتومڕ دەچێت هەروەکوو بۆ ئیبلیس ڕوویدا.

ئیمانی بەهێز لە کاتی هێزی بەلا و ناسۆریدا ڕوون دەبێتەوە و دەردەکەوێ.

بەڵام ئەگەر نموونەی یەحیای کوڕی زەکەریامان بینی بەدکارێك بەسەریدا زاڵ بوو و فەرمان بە سەربڕینی دەکات و سەردەبڕدرێت! ڕەنگە شتێك بە دڵدا بێت و بڵێت: با ئەو زاتەی کردوویەتی بە پێغەمبەر بەرگری لێ بکات؟!

هەروەها هەموو زاڵبوونێکی بێباوەڕان بەسەر پێغەمبەران و ئیمانداران و بەرگری لێ نەکردنیان!

ئەگەر ئەوەی بە بیردا هات کە توانای بەرپەرچدانەوەیانی نییە ئەوا ئەوە بێباوەڕییە. وە ئەگەر بزانێ کە توانای هەیە بەرپەرچیان بداتەوە و بەرپەرچیان ناداتەوە و ئیمانداران برسی و بێباوەڕان تێر دەکات و گوناهباران ساغ و لەخواترسان نەخۆش دەخات ئەوا جگە لە تەسلیمبوون بە خودای خاوەن موڵك هیچی تر نەماوەتەوە ئەگەر ئازاریش بچێژێ و بشسووتێ.

حەزرەتی یوسفی کوڕی حەزرەتی یەعقووب ڕۆیشت و باوکی هەشتا ساڵ گریا پاشان بێهیوا نەبوو، کە کوڕەکەی تری ڕۆیشت وتی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٨٣﴾ (یوسف: ٨٣) واتە: بەڵکوو خودا هەموویانم بۆ بگەڕێنێتەوە.

پێغەمبەر مووسا دوعای لە فیرعەون کرد دوای چل ساڵ گیرا بوو، فیرعەون پێغەمبەرانی سەردەبڕی و توانای مەزنی خودا بەرپەرچی نەدەدایەوە، جادووگەرەکانی لە خاچ دا و دەستەکانی بڕین.

چەندان بەلا تووشی کەسانی ڕێزدار بوو و ئەو بەلایەش زیاتر بووە هۆی تەسلیمبوون و ڕەزامەندی!

لێرەوە واتای ئەم ئایەتە ڕوون دەبێتەوە: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾ (البينة: ٨) واتە: خودا لێیان ڕازی بوو..

ئا لێرەدا ئەندازەی هێزی ئیمان دەردەکەوێت نەك لە چەند ڕەکاتێك.

حەسەنی بەصری وتوویەتی: خەڵك لە لەشساغیدا وەکوو یەکن، کە بەلا هات جیاواز دەبن.

## ١٩٥- ترسناکیی زانستی کەلام لەسەر ڕەشۆکییان

موتەکەلیمەکان لە هەموو کەس زیاتر زیان بە ڕەشۆکییان دەگەیەنن، ڕەشۆکییان بیروباوەڕیان بەو شتانەی لەوانی دەبیستن تێکەڵ و پێکەڵ دەکەن.

ناشیرینترین شت ئەوەیە ڕەشۆکی کە پایەکانی نوێژ و سوو لە فرۆشتندا نازانێ ئامادەی کۆڕی ئامۆژگاری ببێت و موتەکەلیم لە سستی و تەنبەڵیکردن لە نوێژدا نەهی لێ نەکات و فێری ڕزگاربوون لە سووی لێ نەکات بەڵکوو پێی بڵێ: قورئان سەربەخۆیە و ئەوەی لەبەردەستمانە مەخلووق و خوڵقێنراوە!! قورئان لە لای ئەو ڕەشۆکییە سووك بکات و ئەویش سوێندی درۆی پێ بخوات.

واوەیلا بۆ موتەکەلیم! ئەگەر تێگەیشتنی هەبووایە دەیزانی خوای گەورە هەندێ نیشانەی داناوە تا دڵەکان هۆگری بن و پێی دڵنیا و دڵئارام بن، وەکوو کەعبە کە ناوی ماڵەکەی خۆی لێ ناوە، عەرش کە باسی ئیستیوابوونی خۆی لەسەری کردووە، وە باسی سیفەتەکانی خۆی کردووە وەکوو دەست و بیستن و بینین و چاو، وە بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێ و پێدەکەنێ، هەموو ئەمانە بۆ هۆگری و دڵئارامیی دڵ و دەروونەکان، خودا

لەوە گەورەترە ئەم سیفەتانەی ئەندام و دەست و قاچ لەخۆبگریّ. هەروەها خودا شان و شکۆی قورئانی گەورە کردووە و نەهی کردووە لەوەی کەسی بیّ دەسنویّژ دەستی لیّ بدات، بەداخەوە هەندیّ لە موتەکەلیمەکان وایان لیّ هات ریّ بدەن بەوەی خەڵك خۆ بە قورئان پاك بکەنەوە ! !

ئەوانە دژایەتی و ململانێی شەریعەت دەکەن چونکە سووکایەتی بەو شتە دەکەن کە شەرع گەورەی کردووە. ئایا ڕۆچوون و قوڵبوونەوە لە کەلام دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستییانەی کە ناکریّ پێچەوانەی بکریّ؟! زۆر دوورە! ئەگەر وابووایە ئەوا لەنێوان موتەکەلیمەکان ناکۆکی ڕووی نەدەدا.

ئەوە نییە نەوەی یەکەم لەبارەی هیچ شتێك لەمە قسەیان نەکردووە ئەگەرچی باسی هەندێك ئوصوڵیان کردووە؟! پاشان فەقیهانی شارەکان هاتن و نەهییان کرد لە ڕۆچوون لە کەلام چونکە دەیانزانی چی دەهێنریّ و لە چی دوور دەکەونەوە!

هەر کەسێك قەناعەت بە عەقیدەی وەکوو هاوەڵان نەکات و بە ڕێگای وەکوو ڕێگای ئەحمەد و شافیعی قایل نەبیّ لە وازهێنان لە ڕۆچوون ئەوا هەر کەسێك بێت نابیّ بە هیچ.

پاشان بۆ خاتری خوا سەرنج بدەن، بەم ئایەتە وازهێنان لە سوو پێویست نەکراوە: ﴿لَا تَأْكُلُوا الرِّبَوٰا﴾ (آل عمران: ١٣٠) واتە: سوو مەخۆن.

وه دوورکەوتنەوه لە داوێنپیسی: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ﴾ (الإسراء: ٣٢) واتە: لە داوێنپیسی نزیك مەبنەوه.

ڕێگای پێشینان ڕوونترین ڕێبازە، چونکە ئێمە وەکوو چاولێکەری وا نالێین بەلکوو بە بەلگەوه، بە بەلگەی نەقل لەگەل هاوکاریی عەقل بۆ گەڕان و لێکۆلینەوه لە شتێك کە پێویستمان پێی نییە. ئێرەش شوێنی ڕوونکردنەوەی ئەمە نییە.

## ١٩٦- حەقیقەتی مردن

له خەمخواردن بۆ مردنی کەسوکار و منداڵ هێشتا لەسەر نەریتی خەڵك بووم و تەنها خەیاڵی ڕزینی جەستەکانم له گۆڕدا دەکرد، بۆ ئەوەش خەمبار دەبووم.

چەند فەرموودەیەکم بەرچاو کەوت کە جاری تریش بەرچاوم دەکەوت و بیرم لێ نەدەکردەوە، وەکوو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (إنما نفس المؤمن طائر تعلق في شجر الجنة حتى يرده الله عزوجل الى جسده يوم يبعثه) صحيح، رواه مالك و ابن ماجه و النسائي ..واتە: ڕۆحی ئیماندار وەکوو باڵندەیەك وایە لە درەختەکانی بەهەشت دەگەڕێ و دەخوات تا ڕۆژی زیندووبوونەوە خوای گەورە دەیگەڕێنێتەوە بۆ جەستەی..

دیتم ڕۆیشتن بۆ پشوودان و حەسانەوەیە و ئەم جەستەیەش هیچ نییە چونکە لێك هەڵدەوەشێت و خراپ دەبێت و ڕۆژی زیندووبوونەوە سەر لە نوێ دروست دەکرێتەوە، پێویست ناکات بیر لە ڕزیبوونی بکەینەوە و با دەروون دڵنیا بێت لەوەی کە ڕۆحەکان بەرەو پشوودان و حەسانەوە ڕۆیشتوون، خەمی گەورە نامێنێ و بەم نزیکانە بە دیداری خۆشەویستان شاد دەبێت.

داخ و خەفەت بۆ پەیوەستبوونی خەڵکە بە شێوە و ڕووکەش، مرۆڤ هیچ نابینیٚ تەنها جەستەیەکی بەرچاو نەبێت کە هەڵوەشاوەتەوە، ئیتر بۆ هەڵوەشانەوەی خەفەت دەخوات.

ئەمە بەوە دابنیٚ کە ددانێکی کاکیلە(خڕیٚ)ت هەڵکێشاوە و فڕێت داوەتە ناو قۆرتێك، ئایا هیچ هەواڵێکت هەیە لەوەی لە ماوەی ژیانت چی دووچار دەبوو؟! حوکمی جەستەکانیش حوکمی ئەو کاکیلەیە، نەفس و ڕۆح نازانیٚ چی دووچار دەبیٚ.

پێویست ناکات خەم بۆ ڕزین و پارچە پارچەبوونی جەستەی خۆشەویست بخۆیت و خۆشگوزەرانیی ڕۆحەکان و نزیکبوونەوەی نوێبوونەوە و زوو بەیەکگەیشتنەوەت لەبیربێت، بیرکردنەوە لە هاتنەدی ئەمە خەم و خەفەت سووك دەکات و کارەکە ئاسان دەکات.

## ١٩٧- پاراستنی زمان

پێویستە بۆ کەسی ژیر کە لە تەنهاییدا لەبارەی هیچ کەسێك هیچ شتێك نەڵێت تا ئەو شتە دیار و ئاشکراکراو دەبێت، پاشان سەیر بکات چی دەچنێتەوە !

ڕەنگە یەکێك متمانە بە هاوڕێیەکی بکات و لەبەردەمیدا قسەیەك لەبارەی دەسەلاتدارەوە بکات، ئەمەش بگاتەوە دەسەلاتدار و لەناوی ببات. یان لەبارەی هاوڕێیەکیەوە و قسەکەی پێ بگاتەوە و کارەسات ڕوو بدات.

هەروەها پێویستە مەزهەب بشاردرێتەوە چونکە دەرخستنی جگە لە دژایەتی و دوژمنایەتی چیتری لێ ناکەوێتەوە.

کاتێ (شەریف ئەبوو جەعفەر) لە سەردەمی (موقتەدا) دژایەتیی خۆی بۆ ئەشعەرییەکان ئاشکرا کرد گیرا و حەپس کرا تا مرد، مەبەست نەهێشتنی فیتنە و چاککردنی میللەت بوو، چونکە ئەمە بۆ دەسەلاتدار گرینگترە لە دەمارگیری بۆ مەزهەب.

## ١٩٨- تەسلیمبوون بە حیکمەتی خودا

زۆرێك لە بێئاگایانم بینی نارەزایی و توورەیی لە قەدەریان پێوە دیارە، تێیاندایە ئیمانی کەمە و ڕەخنە و پەلپ دەگرێ! تێیاندایە بەرەو بێباوەڕی چووە و پێی وایە ئەوەی دەگوزەرێ و ڕوودەدات وەکوو بێهوودە وایە و وتوویە: سوودی لەناوبردن دوای پەیداکردن و خولّقاندن چییە؟ تاقیکردنەوە لە لایەن زاتێك کە پێویستی بە ئازاردانمان نییە کەڵکی چییە؟

بە هەندێك لەوانەی هێمایان بۆ ئەمە دەکرد وتم: ئەگەر هۆش و دڵت ئامادە بوو قسەت لەگەڵ دەکەم، ئەگەریش بە بێ تێڕوانین و ئینسافەوە قسە دەکەیت ئەوا گفتوگۆکردن لەگەڵت خۆڕایی و بێهوودەیە. ماڵوێران! هۆشت ئامادەکە و گوێ بگرە چی دەڵێم!

ئەی ئەوە نەچەسپاوە کە خودای گەورە دارا و خاوەن موڵك (مالك)ە، خاوەن موڵکیش بۆی هەیە چی بیەوێت بیکات؟! ئەی نەسەلماوە کە ئەو دانا و حەکیمە، داناش کاری بێهوودە و گاڵتە ناکات؟!

من دەزانم لەم وشەیە شتێك لە دڵتدایە، چونکە گوێمان لە جالینۆس (پزیشکێکی یۆنانییە) بووە وتوویە: نازانم، ئەو دانایە یان نا؟! هۆکاری ئەم قسەیەشی ئەوەیە: کە دوای دروستکردن و پێکەوەنان هەڵوەشانەوەی بینیوە، ئەم حاڵەی قیاسی سەر

ئەحواڵی خەڵق کردووه، واته ئەوەی شتێك دروست بكات پاشان هەڵیوەشێنێتەوه بێ هیچ واتایەك ئەوا دانا و حەكیم نییه.

ئەگەر ئامادە بووایە وەڵامەکەی ئەوەیە کە بوترێ: بە چی بۆت ڕوون بوویەوە کە هەڵوەشانەوە حیكمەت نییه؟ ئایا بەو عەقڵەت نییە کە خودای خولقێنەر پێی بەخشیویت؟ چۆن بیرێکی تەواوت دەداتێ و خۆشی تەواو نەبێ؟!

ئەمە ئەو تاقیکردنەوەیە بوو کە بۆ ئیبلیس ڕوویدا، ئەو بە عەقڵی خۆی ڕەخنەی لە حیكمەتی خودا دەگرت، ئەگەر بیری کردبایەوە دەیزانی کە عەقڵبەخش بەرزترە لە عەقڵ و، حیكمەتی خودا لە هەموو حەکیمێك تێروتەواوترە، چونکە بە حیكمەتی تەواوی خۆی عەقڵەکانی دروست کردووه.

ئەگەر کەسی بەئینساف سەرنجی ئەمە بدات ئەوا گومانی نامێنێ.

خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ ئەمە کردووه: ﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ﴾ (الطور: ٣٩) واته: خودا کچی هەیە و ئێوەش کوڕ؟!

مەبەستی ئەوەیە ئێوە کە مێینە بە مایەی شەرم و کەموکورتی دادەنێن خوا ئەو ناتەواوانەی بۆ خۆی داناوه و تێروتەواوەکانیشی بە ئێوە داوه؟!

تەنها ئەوەمان بۆ ماوەتەوە کە دان بنێین بەوەی خۆمان لە شتەکان بەباشی تێ ناگەین و بڵێین: ئەمە کاری زانایەکی دانا و حەکیمە بەڵام واتاکەیمان بۆ ڕوون نابێتەوه.

ئەمەش سەیر نییە، حەزرەتی مووسا حیكمەت لە کونکردنی کەشتییەکە و کوشتنی منداڵە جوانەکەی لێ ون بوو، کاتێ (خدر) حیكمەتەکەی بۆ ڕوون کردەوە ملکەچ بوو.

با لەگەڵ خودای خوڵقێنەر وەکوو مووسا بین لەگەڵ خدر.

چ ڕێگرییەك هەیە لەوەی کە کاری خودا نهێنییەکی هەبێ و ئێمە نەیزانین؟!

نەزانترین نەزان ئەو بەندە کۆیلەیەیە کە داوا دەکات ئاگاداری نهێنیی ئاغاکەی بێت، چونکە ئەرکی سەرشانی وی تەسلیمبوونە نەك ڕەخنە و ناڕەزایی.

ئەگەر لە تاقیکردنەوەدا هیچ شتێ نەبووایە تەنها ملکەچی و تەسلیمبوونی عەقڵ نەبێ ئەوا بەس و کافیە.

بێگومان سەرنجی حاڵەتێکی سەیرم دا، کە ڕێی تێدەچێ مەبەست لە مردن ئەمە بێت، ئەویش ئەوەیە کە خودای گەورە غەیبە و هەست دەرکی پێ ناکات، ئەگەر ئەو ئەم پێکهاتەی مرۆڤی بە مردن هەڵنەوەشاندایەتەوە ئەوا مرۆۆ وا خەیاڵی دەکرد کە ئەو بێ خوڵقێنەر دروست بووە، کە مردن ڕوویدا ئەوا نەفس ئەو نەفسەی خۆی دەناسێ کە نەیدەناسی لەبەرئەوەی لە جەستەیەکدا بووە و دوای ڕۆیشتنی، دەرك بە شتە سەیروسەمەرەکان دەکات، کە بۆ جەستە گەڕاێندرایەوە بە زەرورەت دەزانێ کە مەخلووقی ئەو زاتەیە کە دووبارە زیندووی کردۆتەوە و حاڵوباری خۆی لە دونیا بیردەکەوێتەوە، چونکە چۆن جەستەکان دووبارە زیندوو دەکرێنەوە بیروهزرەکانیش ئەوها زیندوو دەکرێنەوە، لەو ڕۆژەدا یەکێك لە مرۆڤەکان دەڵێ: ﴿إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾ (الطور: ٢٦) واتە: ئێمە پێشتر لە دونیا لەنێو کەسوکارمان لە خودا دەترساین..

هەر کاتێ نەفس ئەو شتانەی بینی کە لەبارەی ڕووداوەکانی ئاخیرەت بەڵێنی پێدراوە ئەوا یەقینێکی بێ گومانی بۆ دروست دەبێ، ئەمەش تەنها بە زیندووکردنەوەی مردوو نایەتەدی، بەڵکوو بە دیتنی ئەمە تێیدا دێتەدی، ئیتر بە جۆرێك بنیات بنرێتەوە کە بمێنێتەوە و لە بەهەشتێکدا نیشتەجێ بێت کە کۆتایی نەیەت، بەم یەقینە شیاوی ئەوە بێت ببێتە دراوسێی خودای هەق، چوون ئیمانی

هێناوه به بەڵێنی خودا و ئارامی لەسەر تاقیکردنەوه و ناخۆشییەکان گرتووه و تەسلیمی قەدەرەکانی بووه بێ ڕەخنه و پەڵپگرتن، پەند و وانەی لە غەیری خۆی پاشان له خۆی وەرگرتووه، ئا ئەمەیه پێی دەوترێ: ﴿ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ۝٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ۝٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ۝٣٠﴾ (الفجر: ٢٨ - ٣٠) واته: بە ڕازیبوون و لێڕازیبوونەوه بگەڕێوه لای پەروەرێنت، بڕۆ نێو بەندەکانمەوه و بڕۆ نێو بەهەشتەکەمەوه.

وەلێ گومانکار و بێباوەڕ شیاوی چوونه ناو ئاگر و مانەوه تێیدان، چونکه بەڵگەکانیان بینیوه و سوودیان لێ وەرنەگرتووه و ملەیان لەگەڵ خوای حەکیم کردووه و ڕەخنەیان لێ گرتووه، نەگبەتیی بێباوەڕییان چرای دڵیانی کوژاندۆتەوه و وەکوو خۆی ماونەتەوه، کاتێ له دونیا سوودیان له بەڵگه وەرنەگرت ئەوا سوود له مردن و زیندووبوونەوەش وەرناگرن، بەڵگەی مانەوەی پیسی و چەپەڵییش له دڵەکان ئەم ئایەتەیه: ﴿قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ﴾ (الأنعام: ٢٨) واته: ئەگەر بگەڕێنەوه دونیا ئەوا دەگەڕێنەوه سەر ئەو کردەوانەی نەهییان لێ کرابوو.

داوای عەقڵێك له خودا دەکەین که سنووری خۆی بزانێ و ڕەخنه و پەڵپ له خوڵقێنەری نەگرێ..پاشان واوەیلا بۆ ڕەخنەگر! ئایا ڕەخنەگرتنەکەی قەدەرەکان بەرپەرچ دەداتەوه؟! جگه له ڕیسوایی چیتری دەست ناکەوێ..پەنا بە خوا له کەسێك که ڕیسوا کراوه..

## ١٩٩- پاداشتی ئاخیرەت دڵنەوایی هەموو ناخۆشییەکە

پێویست ناکات ئیماندار لە نەخۆشی یان مردن جاڕس و بێتاقـەت بێـت، ئەگەرچـی تەبیات بەدەست خۆت نییـە وەڵێ پێویسـتە تـا توانـای هەیـە ئـارام بگـرێ: یـان بـۆ پاداشت بە هۆی ئێش و ئازارەکان یان بۆ ڕوونبوونـەوەی شـوێنەواری ڕازیبـوون بـە بڕیاری خودا، ئەمەش تەنێ چەند ساتێکە و پاشان تێدەپەڕێ.

ئەو کەسەی لە نەخۆشی چاك بووەتەوە با بیر لەو سات و کاتانە بکاتەوە کـە تێیـدا نیگەران بوو: کوا ئەو لە کاتی لەشساغی؟! بـەڵا و ناخۆشـی ڕۆیشـت و پاداشـتیش دەسـت کـەوت، هـەروەکوو خۆشـی و شـیرنایی چـێژە قەدەغـەکراوەکان دەڕۆن و گوناهەکە دەمێنێتـەوە، کـات و سـاتی نـاڕەزایی لـە قـەدەرەکان دەڕوات و گلـەیی خودا دەمێنێتەوە.

ئایـا مـردن تـەنێ چـەند ئێشـێك نییـە کـە زیـاد دەبـێ و نـەفس بەرگـەی نـاگرێ و دەڕوات؟!

با نەخۆش ئەو حەسـانەوەیە بێنێتـە بەرچـاو کـە دوای ڕۆیشـتنی نـەفس دێتـەدی و ئەوەی تووشـی بـووە ئاسـان دەبـێ و لەبیردەچـێتەوە هـەروەك دوای خواردنـەوەی دەرمانێکی تاڵ چاکبوونەوە و لەشساغی وێنا دەکات.

پێویست ناكات به بیرهاتنەوه و باسكردنی ڕزیبوونی جەسته دوای مردن بێتاقـەت و وەڕس بێـت چـونكه ئـەوه جەسـتەیه وای لێ دێـت بـەلاَم ڕۆح لـه بەهەشـتدایه یـان دۆزەخ، بەڵكوو پێویسـته هـەموو بایەخـدانێكی بـۆ ئـەوه بێـت پلەوپایـەی كـردەوه باشەكانی بەرز و زیاد بێت بەر لەوەی پەكی بكـەوێت، بەختـەوەر ئـەو كەسـەیه كـه سوودی له سەردەمی لەشساغی وەرگرتووه و سـەركەوتوو بـووه، پاشـان لـه كـاتی ئەم سوودوەرگرتنەدا وەدەسهێنانی باشترین و باشترین هەڵدەبژێرێ، با بزانێ پلەی بـەرزی بەهەشـت پەیوەسـته بـه ئەنـدازەی زیـادكردنی كـار و كـردەوەی بـاش لـه دونیادا، تەمەن كورته و كار و كردەوەی چاك زۆر، با له دەسپێشخەریدا زیادەڕەوی بكات، ئیتر بۆ ماوەیەكی درێژ لـه ماندوویـەتی دەحەسـێیتەوه و خـەمبار دڵخـۆش و شـادمان دەبـێ. هـەر كـاتێ بـەردەوامبوونی خۆشـی و چێژی نـەبڕاوەی بەهەشـتی هێنایه بەرچاو ئەو كات هەموو بەلاَ و ناخۆشییەكی له كن ئاسان و سووك دەبێ.

## ٢٠٠- بێئاگایی بەسوود و زیانبەخش

ڕۆژێك ئامادەی جەنازەی لاوێك بووین کە لەوپەڕیی خۆشیی دونیادا مردبوو، دیتم خەڵك بە هۆی ئەم ڕووداوەوە زەمی دونیا دەکەن و ڕەخنە لەوانە دەگرن کە دڵیان بە دونیا خۆشە و بێئاگان لە خۆئامادەکردن بۆ ئەم ڕۆژە، وتم: قسەکانتان جوان و باشن، بەڵام شتێك لە من ببیستن کە نەتانبیستووە!

سەیروسەمەرەترین شت ئەوەیە کە مرۆڤی ژیر کاتێ زانی مردنی لێ نزیك بووەتەوە ئەوا عەقڵ و هۆشی لەسەری پێویست دەکات دەست بکات بە کار و کردەوە و پەشۆکان و ترسان.

ئەو بیر و بۆچوونە بەتوندی تووشی هەندێ کەس بوو، هەڵوەدای چۆڵ و بیابان بوون و ڕۆژگارییان بە برسێتی بەڕێ کرد و لەسەر شەونخوونی بەردەوام بوون و بوونە هاونشینی گۆڕستانەکان، ئیتر خێرا و زوو لەناوچوون.

سوێند بە خوا، ئەوەی لێی ترسان شایستەی لەم کردەوەیە زیاترە. بەڵام دەبینین کە ئەو عەقڵەی ئەم ترس و پەشۆکانەی سەپاندووە فەرمانی کردووە بە شتێك کە ئارامی و ئۆقرەگرتن دەسەپێنێ و، وتوویە: ئەم جەستەیە خولقێنراوە بۆ ئەوەی نەفس هەڵگرێ هەروەکوو وشتر مرۆڤ هەڵدەگرێ، پێویستە ئاگاداری وشترەکە بین و

لەگەڵیدا نەرم و لەسەرخۆ و میهرەبان بین تاوەکوو بتوانێ ڕێ بکات و بمانگەیەنێتە مەنزڵ. شەونخوونیی بەردەوام و ترس و پەشۆکانی دوور و درێژ بۆ عەقڵ باش نییە چونکە کار دەکاتە سەر جەستە و زۆربەی ئامانج و مەبەستەکە لەدەست دەچێ. چۆن نا لە کاتێکدا جەستەی مرۆڤ بە ناسکی و نیانی خولقێنراوە، ئەگەر وازی لە چەوری هێنا ئەوا مێشك وشك دەبێتەوە و ئەگەر لەسەر شەونخوونی بەردەوام بوو ئەوا وشکییەکە زیاد و بەهێز دەبێ، ئەگەر بەردەوام خەمبار بوو ئەوا دڵ نەخۆش دەکەوێ؟! کەواتە دەبێ لەگەڵ جەستە نەرم و میهرەبان بین بە خواردنی ئەوەی بۆی باشە، وە بە دڵیش نیان و بەسۆز بین بەو شتانەی خەم و پەژارەی ئازاربەخشی لێ دوور دەخەنەوە، وەگەرنا هەر کات شتە ئازاربەخشەکان بەردەوام بوون ئەوا لەناوچوونیش بەخێرایی دێت.

پاشان شەرعیش بەو ئامۆژگاری و ڕێنماییانەوە دێت کە عەقڵ وتوویە و، دەڵێ: (( إن لنفسك عليك حقا، وإن لزوجك عليك حقا، فصُم وأفطِر، وقُم ونَم)) واتە: نەفست مافی بەسەرتەوە هەیە، هاوسەرەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە، هەندێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە و هەندێکیش بەڕۆژووش مەبە، شەونوێژ بکە و بشخەوە.

وە دەڵێ: ((كفى بالمرء اثما أن يضيع من يقوت)) واتە: ئەوەندە تاوانە بۆ مرۆڤ بەس و کافییە کە ماڵ و منداڵ و ئەوانەی لەژێردەستیدان فەرامۆش بکات و بەڕێکوپێکی بەخێویان نەکات.

هەروەها هانی ژنهێنان و شووکردن دەدات. ترس و پەشۆکان و وشکیی بەردەوام ژن وەکوو بێوەژن و منداڵ وەکوو هەتیو لێ دەکات، هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ مەشغوولبوون بە زانست لەگەڵ ئەم ترس و نیگەرانییە.

هەر کەسێك بەڵگەی ڕاستیی ئەم قسانەی منی دەوێت با سەرنج بداتە دۆخی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەو بەردەوام بە گەمە و گاڵتە ئەم ترسەی خۆی دەڕەواندەوە و پێشبڕکێی لەگەڵ عائیشەدا دەکرد و ژنی زۆری دێنا و ئاگاداری جەستەی خۆی بوو و ئازاری نەدەدا، ئەو ئاوەی هەڵدەبژارد کە شەو دەمایەوە و بۆ بەیانی سارد دەبوو، حەزی لە شیرینی و گۆشت بوو.

ئەگەر هاونشینیی جۆرێك لە بێئاگایی نەبووایە ئەوا زانایان کتێبیان نەدەنووسی و زانست نەدەپارێزرا و لەبەرنەدەکرا و فەرموودە نەدەنووسرایەوە، چونکە ئەوەی دەڵێ: ڕەنگە ئەمڕۆ بمرم چۆن دەنووسێ و چۆن گوێ دەگرێ و کتێب دادەنێ؟!

سەرسام مەبن لەوەی دەبینن خەڵك لە مردن بێئاگایە و بەتەواوی یاد و باسی ناکەن، چونکە ئەوە نیعمەتێکە لەلایەن خوداوە، بە هۆیەوە کاروباری دونیا بەڕێوە دەچێ و دین شیاو و گونجاو دەبێ.

بەڵکوو ئەو هێزی بێئاگاییە زەم دەکرێ کە دەبێتە هۆی کەمتەرخەمی و پشتگوێخستنی لێپرسینەوەی نەفس و کات بەفیڕۆدان، ڕەنگە ئەو بێئاگاییە ئەوەندە بەهێز بێت ببێتە مایەی ئەنجامدانی تاوان و گوناه.

ئەگەر ئەم بێئاگاییە بە ئەندازە بوو ئەوا وەکوو خوێی ناو چێشتە و پێویستە هەبێ، ئەگەر زۆر بوو ئەوا دەبێتە ژەهرێکی کوشندە.

بێئاگایی ئەگەر بە ئەندازە بوو ئەوا ستایش کراوە هەروەکوو ڕوونمان کردەوە، هەر کاتێکیش زیاد بوو ئەوا زەمکردن ڕوودەدات.

تێ بگە لەوەی وتم و مەڵێ: فلان زۆر بەئاگا و بێدارە و شەوان ناخەوێ، وە فیسار بێئاگایە و زۆربەی شەوان دەخەوێ، چونکە بێئاگاییەك ببێتە مایەی سوودی جەستە و دڵ زەم ناکرێ.

## ٢٠١- زوهدی درۆزنانه

تەنیا دەسبەتاڵ و بێکار حەزی بە کۆبوونەوە لەگەڵ خەڵکە، چونکە ئەوەی دڵی بە خوداوە مژووله لە خەڵك ڕادەکات، هەر کاتێ دڵ لە ناسینی خودای هەق بەتاڵ بوو ئەوا بە خەڵك پڕدەبێتەوە، ئیتر بۆ ئەوان و لەپێناو ئەوان کاردەکات، بێ ئەوەی بزانێت بە ڕووپامایی لەناودەچێت.

ئەز سەرنجی هەندێ لەوانە دەدەم کە خۆیان بە بەرگی هەژاری و تەسەووف داپۆشیوە جلکێك لەبەر دەکەن کە دینارێك ناهێنێ و دارایی زۆریشی هەیە و خۆی بە خواردنی خۆش هەڵمساندووە و بەتڕزلی و لووتبەرزییەوە ڕەفتار دەکات، نزیکی دونیاپەرستان دەبێتەوە و سووك سەرنجی زانیار و زانستدۆستان دەدات و سەردانی لەوان نزمتر دەکات. ئەوەی پێی دەدرێ ڕەتی دەکاتەوە تاوەکوو ناوی وەکوو زاهید بڵاوبێتەوە کەچی لە فرتوفێڵیدا وەکوو ڕێوییە و بۆ وەدیهێنانی مەبەستەکانی لە ناخەوە سەگێکی بەهەڵمەتە. دەڵێم: پاکوبێگەردی بۆ خودا! تەنها لە جلوبەرگدا زوهدی کردووە!

ئایا دەبێ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) نەبیستبێت: ((إن الله يُحِبُّ أن يرى أثَرَ نعمتهِ على عبده)) حسن صحيح رواه الترمذي والحاكم. واتە: خوای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری نیعمەتی بەسەر بەندەکەیەوە ببینێ.

پەنا بە خوا لە خـودبينی و خـەڵكبينی: هـەر كەسـێك خـۆی بينـی ئـەوا خۆبـەزلزان دەبێ و خۆبەلزانيش گەمژەيە، چونكە بە هـەر شـتێك خـۆی بـە گـەورە بزانـێ ئـەوا غەيری وی لەم زياتری هەيە. هەر كەسيش ڕووپامايی بۆ خەڵك كرد ئەوا بێ ئـەوەی بزانێ پەرستوونی!

بەڵام ئەوەی كار بۆ خودا دەكات ئەوا لـە خـەڵك دوورە، ئەگـەر لێـی نزيـك بوونـەوە ئەوا حاڵوباری خۆی بە جۆرێك لێيان دەشارێتەوە كە ببێتە هۆی دووريان لێی.

خـەڵكمان بينيـوە كـە بـێ ئـەوەی بزانـێ ڕووپامـايی كـردووە، بـە بـازاڕدا نـاڕوات و سەردانی براكان ناكات و هيچ شتێك بە خـۆی نـاكڕێ! ئـەو وەهمـە دەداتـە نەفسـی خۆی گوايە من حەز بە تێكەڵاويی خەڵكی بازاڕی ناكەم!! بەڵكوو ئەمـە پلەوپايـەی خـۆی لـەنێو ڕەشـۆكييان بـەرز دەكاتـەوە چـونكە ئەگـەر تێكـەڵيان ببێـت ئـەوا پلەوپايەی نامێنێ و دەست ماچكردنی دەپووچێتەوە!

(بيشری حافی) لە كۆڕێكی لای بۆنفرۆشێك دادەنيشـت. لـە هـەموو ئەمانـە گـرينگتر پێغەمبەرمان (صلی الله عليه وسلم) پێداويستييەكانی خۆی دەكڕی و هەڵيدەگرت و دەيبردەوەماڵەوە.

عەلی كوڕی ئەبی تاڵيب كە ميری ئيمانداران بـوو خـۆی چـووە بـازاڕ و كراسـێكی بـۆ خۆی كڕی.

(تەڵحەی کوڕی موصەڕڕیف) قورئان خوێن و فێرکاری قورئان لە شاری کوفە، کاتێ خەڵك زۆر ڕوویان تێ کرد چووە لای (ئەعمەش) و قورئانی لە کن خوێند، ئیتر خەڵك ڕوویان کردە ئەعمەش و وازیان لە تەڵحە هێنا.

سوێند بە خوا ئەمە گۆگردی سوور و ئیکسیرە، نەك ئەوەی لە کیمیا بە ئیکسیر دادەنرێ.. مامەڵەکردن لەگەڵ خودا ئەوها دەبێ.

(گۆگردی سوور کانزایەکی بەنرخە و وەکوو شتێکی دەگمەن و دانسقە بە نموونە دەهێنرێتەوە. ئیکسیر وشەیەکی یۆنانی عەرەبێنراوە، کیمیاییە کۆنەکان پێیان وابوو ماددەیەکە کانزای سادە دەگۆڕێت بۆ کانزای بەنرخ).

بەڵام دژی ئەم حاڵە، حاڵەتی خواپەرستێکی ڕیاکاری خەڵکە. ئەمەش زۆربەی خەڵکی گرتۆتەوە، دوور لە پێشینان.

## ٢٠٢- قێزەونترین گوناه

هەموو گوناه و تاوانەکان ناشیرینن و هەندێکیان لە هەندێك قێزەونترە:

داوێنپیسی (زینا) لە قێزەونترین گوناهەکانە، نێوان ژن و مێرد تێك دەدات و ڕەچەڵەکەکان تێکەڵ و پێکەڵ دەکات و دەیانگۆڕێت.

جا زینا لەگەڵ دراوسێ قێزەونترە: بوخاری و موسلیم لە زاری ئیبن مەسعوودیان گێڕاوەتەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا چ تاوانێك گەورەترینە؟ فەرمووی: ((**خوا کە تۆی خوڵقاندووە تۆش بچیت هاوبەشێکی بۆ دابنێیت؟!**)). وتم: پاشان چیتر؟ فەرمووی: ((**منداڵەکەت بکوژیت لەبەرئەوەی نانت لەگەڵ دەخوات**)). وتم: پاشان چیتر؟ فەرمووی: ((**داوێنپیسی لەگەڵ هاوسەری دراوسێیەکەت بکەیت**)).

هەروەها بوخاری لە کتێبەکەیدا (التأریخ الکبیر) فەرموودەیەکی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) هێناوە کە فەرموویەتی: ((**پیاو زینا لەگەڵ دە ژن بکات ئاسانتر و سووکترە لەوەی زینا لەگەڵ ژنی دراوسێیەکەی بکات، لە دە ماڵ دزی بکات سووکتر و ئاسانترە**

**لەوەی دزی لە ماڵی دراوسێیەکی بکات))**. ئەمەش لەبەرئەوەیە چونکە ئەمە لە پاڵ سەرپێچیکردنی خودا پێشێلکردنی مافی دراوسێیشە.

لە قێزەونترین تاوانەکان زیناکردنی پیاوی پیرە، لە فەرموودەدا هاتووە: ((**خودا پیرەپیاوی زیناکەر دەبوغزێنێت**)) چونکە شەهوەتی ئاسایی و سروشتی مردووە و هێزێکی وای تێدا نەماوە، بە خۆی دەیبزوێنێ و زۆر لە خۆی دەکات بۆیە سەرپێچیکردنەکەی لاساری و کەللەڕەقییە.

لەو سەرپێچی و تاوانانەی لە لاساری و کەللەڕەقی دەچن ئەوەیە پیاو ئاوریشم و زێڕ لەبەر بکات، بە تایبەتی ئەو ئەڵقە زێڕەی پیرەپیاو لە پەنجەی دەکات، ئەمە لە ساردوسڕترین کار و ناشیرینترین تاوانەکانە.

هەر لەم جۆرە سەرپێچییانە: ڕووپامایی و ملخوارکردن و دەرخستنی زوهد بۆ خەڵك، ئەمە وەکوو پەرستشە بۆیان لەپاڵ پشتگوێخستنی لایەنی خودای گەورە.

هەروەها مامەڵەکردن بە سووی ئاشکرا و دیار، بە تایبەتی لە لایەن پیاوی دەوڵەمەند و پارەدارەوە.

لە ناشیرینترین شتەکان ئەوەیە پیرەپیاوی بەتەمەن نەخۆشییەکەی درێژە بکێشێ و تەوبە نەکات و واز لە گوناه نەهێنێ، لە هەڵە داوای لێبووردن نەکات و قەرزێك نەداتەوە و وەسییەت نەکات بە دانەوەی ئەو مافەی لەسەریەتی!

لە گوناهە قێزەونەکان ئەوەیە کە دز یان ستەمکار تەوبە بکەن و مافی خەڵك نەگەڕێننەوە. یان کەمتەرخەم لە دانی زەکات یان نوێژکردن و قەزایان نەکاتەوە.

لە تاوانە ناشیرینەکان سوێند بە تەڵاق بخوات و بیشکێنێت پاشان بچێتەوە کن ژنەکەی و لەگەڵی جووت بێت!

قیاسی لەسەر ئەوانەی باسم کرد بکە، تاوان و گوناه و سەرپێچی زۆرن و ناشیرینترینیان بزر و ون نابێ.

ئەم ناشیرینکراوانە - وێرای قێزەونەکان - بە لاساری و ملهوڕییکردن لە فەرمانــدەر دەچێت و خاوەنەکەی شیاوی تووك و نەفرەت و سزای بەردەوامە.

من پێم وایە خواردنەوەی مەی و بادە لەو جۆرەیە، چونکە هەروەك باس دەکرێ مەی لەبەر زات و بۆن و تامی حەزلێکراو نییە، بەڵکوو چێژەکەی - هەروەك دەوترێ - دوای چەشتنی تاڵییەکەیەتی، چوون بەرەو پیری ئەوەی تەبیات و سروشت داوا دەکات - تا ئەوەی دەگاتە چێژ وەرگرتن - ئەوا لاساری و ملهوڕییە.

لە خودا داواکارین ئیمانێکی وامان بداتێ کە ببێتە بەربەست لە نێوان ئێمە و سەرپێچیکردنی و یارمەتیشمان بدات بۆ ئەو کارانەی دەبێتە هۆی ڕەزامەندیی ئەو، ئێمە بە هۆی ئەوەوە هەی و هەر بۆ ئەویشین.

## ٢٠٣- خودسەرسامی، ئافەتی زانایانە

ڕەخنەم لە زۆربەی زانا و زاهیدان ئەوەیە کە لە ناخیاندا خۆبەلزانی هەیە: ئەمە تەماشای پلەوپایەی خۆی و بەرزی غەیر بەسەریدا دەکات و، ئەوە سەردانی نەخۆشێکی هەژار ناکات و خۆی پێ لەو باشترە...تەنانەت من خەڵکێکی دیارم بینی کە ئاماژەیان بۆ دەکرا:

هەبوو دەیوت: لەو شوێنە بمنێژن کە گڵکۆی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی تێدایە ! دەشیزانی لەو شوێنە جێگا نەماوە دەبێ گۆڕی دیکە هەڵدەنەوە و ئێسکی مردووەکان بشکێنن، پاشان خۆی بە شیاوی ئەو بەرز و بالاییە دەبینێ.

هەیانە دەڵێ: لە تەنیشت مزگەوتەکەم بمنێژن! گومانی وایە کە دوای مردنی وەکوو مەعرووفی کەرخی دەبێتە مەزار و نزرگە.

ئەمەش ڕەوشتێکی خراپ و لەناوبەرە و نازانن! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : ((هەر کەسێك گومانی وایە کە لە غەیری خۆی باشترە ئەوا خۆبەلزانی نواندووە))..

(بەداخەوە نووسەر ئەمەی وەکوو فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناوە بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەك وەکوو فەرموودە بوونی نییە !).

ئەوانەی بینیومن کەمیان هەبووە ئیللا بەخۆی نازیوە و خودبین بووە!

سەیروسەمەرە بۆ ئەو کەسانەیە کە خودبینن و شانازی بەخۆوە دەکەن! ئایا بە چی شانازی بە خۆیانەوە دەکەن؟! ئەگەر بە زانست بێت ئەوا زانایان پێشی کەوتوون، ئەگەر بە خواپەرستی بێت ئەوا خواپەرستان پێشیان داوەتەوە، ئەگەر بە ماڵ و سامان بێت ئەوا خودی ماڵ و سامان نابێتە هۆی فەزیلەتێکی دینی.

ئەگەر وتی: لە سەردەمی خۆمدا ئەوەندەی من زانستم زانیوە غەیری من نەیزانیوە، ئەوانەی پێشووش هیچیان لەسەر من نییە و، چ ئیشم پێیانە؟!

پێی وترا: ئەی قورئانلەبەر، فەرمانت پێ ناکەین لە لەبەرکردندا خۆت وەکوو ئەو کەسە ببینی کە نیوەی قورئانی لەبەرە، ئەی فەقیە و زانا لە زانستیش وەکوو ڕەشۆکی خۆت مەبینە، بەڵکوو لەوە لێت دەترسین کە خۆت لەو کەسە ئیماندارە باشتر ببینیت ئەگەر زانستیشی کەم بێت، چاکی و باشی بە واتایە نەك بە شێوەی زانست و پەرستش، هەر کەسێ سیفەت و گوناهەکانی خۆی ببینێت دەزانێ بەدڵنیاییەوە ئەو کەمتەرخەمی و گوناهی هەیە و بۆ حاڵی غەیریش گومانی هەیە کە گوناهیان هەبێ، ئەوەی شیاوی لێ ترسان و وریاییە خودسەرسامی و ئەوەیە پێت وابێت لە ئەحواڵی ئاخیرەت لە پێش ئەوانیترەوەیت.

ئیماندار هەمیشە و بەردەوام نەفسی خۆی سەرزەنشت دەکات و سووك سەرنجی دەدات. بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیان وت: ئەگەر مردیت لە ژووری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەتنێژین. وتی: ئەگەر بە هەموو گوناهێك جگە لە شیرك

بگەمەوە لای خودا پێم خۆشترە لەوەی خۆم بە شیاوی ئەوە بزانم لە ژووری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بمنێژن.

گێڕدراوەتەوە کە ڕاهیبێك لە خەوندا کەسێکی بینی پێی دەوت: فلان پینەدۆز لە تۆ باشترە! لە خەڵوەتگاکەی هاتە دەرەوە و چووە لای و لە کار و کردەوەی پرسی، باسی هیچ کار و کردەوەیەکی گەورەی نەکرد! دیسان لە خەوندا پێی وترا: بگەڕێوە لای و پێی بڵێ: بۆچی ڕووخسارت زەرد هەڵگەڕاوە؟ گەڕایەوە لای و لێی پرسی؟ وەڵامی داوە: هەر موسڵمانێکم دیتبێ ئیللا پێم وابووە لە من باشترە... پێی وترا: ئا بەمە بەرزبۆتەوە.

## ٢٠٤- ئارامگرتن لە ئانی تووڕەبوونی کەسێك

هەر کاتێ بینینت هاوڕێکەت تووڕە بووە و دەستی بە قسەی نەشیاو و پڕوپووچ کردووە پێویست ناکات قسەکانی بە جیددی و گرینگ وەربگریت، چونکە حاڵی وەکوو حاڵی سەرخۆشە، نازانێ چی دەگوزەرێ. بەڵکوو ئارام بگرە و قسەکانی بەهەند مەگرە، چونکە شەیتان بەسەریدا زاڵ بووە و تەبیاتی هار بووە و عەقڵیش خۆی شاردۆتەوە و ون بووە.

هەر کاتێك قسەکانت بەجیدی گرت یان بە گوێرەی ڕەفتارەکەی وەڵامت دایەوە ئەوا وەکوو عاقڵێك وایت ڕووبەڕووی شێتێك بووبێتەوە، یان وەکوو کەسێکی بەئاگا و بێدار سەرکۆنەی لەهۆشچوویەك بکات، گوناهەکە هی تۆیە.

بەڵکوو با چاوی بەزەییەوە بۆی بڕوانە و سەرنجی کار و هەڵسوکەوتی قەدەر بۆی بدە و سەیری گەمەکردنی تەبیات پێی بکە، بزانە کە بە ئاگا هاتەوە ئەوا پەشیمان دەبێتەوە لەوەی گوزەراوە و پێزانینی بۆ ئارامگرتنت هەیە.

کەمترین شت بۆی بکەیت لێی گەڕێ با لە کاتی تووڕەییەکەیدا بە چی ئاسوودەیە ئەوە بکات.

ئەم حاڵەتەش پێویستە منداڵ لە کاتی تووڕەبوونی باوك هەستی پێ بکات و ژن کاتێ پیاو تووڕە دەبێ، لێیگەڕێ با ناخی بەتاڵ بکات و چی دەڵێ با بڵێ و لێی بە هەند مەگرە، دواتر پەشیمان دەبێتەوە و داوای لێبووردن دەکات.

هەر کاتێ ڕووبەڕووی ئەم حاڵەتە و قسەکانی بوویتەوە ئەوا دەبێتە هۆی دوژمنایەتی و ناخۆشی. زۆربەی خەڵك لەسەر غەیری ئەم ڕێگایەن: هەر کاتێ کەسێکی تووڕە ببینن بە هەمان شێوەی قسە و کردەوەکانی ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەمەش بە پێی حیکمەت نییە بەڵکوو حیکمەت ئەوەیە کە باسم کرد: ﴿وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴿٤٣﴾﴾ (العنكبوت: ٤٣) واتە: تەنها زاناکان تێی دەگەن.

## ٢٠٥- متمانە بە دۆستایەتیی ئەوانە مەکە کە ئازارت داون

لە دونیادا هیچ کەسێك لەوە گەمژەتر نییە کە خراپە دەرهەق کەسێك دەکات و دەزانێ کە ئازاری بە دڵی گەیاندووە پاشان بە ڕووکەش ئاشت دەبنەوە و وا دەزانێ ئەو شوێنەواری ئازارە بە ئاشتبوونەوە سڕاوەتەوە! بەتایبەتی پاشایان، چێژی هەرە گەورەیان ئەوەیە کەس لەوان بەرزتر نەبێ و هیچ ئامانج و مەبەستێکیان شکست نەهێنێ، ئەگەر شتێك لەوە ڕوویدا ئەوا چاك نابێتەوە.

لەمەدا پەند لە (ئەبوو موسلیمی خوراسانی) وەربگرە، بەر لەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست لە قەدر و ڕێزی ئەبوو جەعفەری مەنصووری دالەنگاند، ئەویش ئەوەی لە دڵ گرت و کە بووە خەلیفە ئەبوو موسلیمی کوشت.

هەر کەسێك تەماشای مێژوو بکات کۆمەڵێك کەس دەبینێ کە نموونەی وایان بەسەرهاتووە.

کەسێك کە خراپەیەکی بەرانبەر دەسەڵاتدارێك کردووە نابێ بکەوێتە دەستی، چونکە ئەگەر ویستی خۆی قوتار بکات ناتوانێ، ئەوا پەشیمانبوونەوەی لە خۆنەپاراستنی و خەمخواردنی لەوەی بێخەم لێی پاڵداوەتەوە بەسفتوسۆترە لە هەموو ئەو سووکایەتی و ئازارەی تووشی دەبێ.

لەم جۆرەش هاورێیە هاوشێوەکانە، تۆ هەر کاتێ ئازاری یەکێکت دا و ئازارەکە گەیشتە دڵی ئیتر متمانە بە دۆستایەتی و خۆشەویستییەکەی مەکە، چونکە ئازاردانەکەی تۆ بەردەوام لەبەرچاویەتی، ئەگەر داو و تەڵەشت بۆ دانەنێتەوە ئەوا هەر لەگەڵت ساف و خاوێن نابێت. تێکەڵ کەس مەبە تەنها ئەوە نەبێ کە چاکەت لەگەڵدا کردووە و جگە لە خێر و چاکە چیتری لێ نەبینیویت، ئیتر ئەوە دەچێتە ناو دڵیەوە.

هەروەها منداڵ و هاوسەر و سەوداکارانیش بە هەمان شێوە. زیاتر لەمە دەڵێم: پێویست ناکات دژایەتی هیچ کەسێك بکەیت و دەرهەقی قسە بکەیت، چونکە ڕەنگە ببێتە خاوەن پایە و دەسەڵات و تۆڵەت لێ بکاتەوە، ڕەنگە پێویستت پێی بێت.

کەسی ژیر هەموو مومکینێك دێنێتە بەرچاو و ڕق و خۆشەویستی لە دڵیدا دەشارێتەوە و لەگەڵ ڕق و کینە مادەلایی (مداراة) دەکات.

ئەمە ڕاوێژ و مەشوەرتی دڵە ئەگەر قەبووڵی بکات.

## ٢٠٦- ژیر سەرنجی سەرەنجام دەدات

هەر کەسێك سەرنجی سەرەنجامەکان نەدات و خۆی ئامادە نەکات بۆ ئەو شتانەی دەکرێ ڕووبدەن ئەوا کەسێکی تەواو ژیر نییە !

ئەمە لە هەموو حاڵوبارێکدا لەبەرچاو بگرە ! وەکوو ئەوەی بە گەنجێتی هەڵبخەڵەتێ و لەسەر تاوان و سەرپێچییەکان بەردەوام بێت و تەوبەکردن دوابخات، ڕەنگە لەپڕ مردن یەخەی بگرێ و هێشتا بە بەشێك لە هیوا و ئاواتەکانی نەگەیشتووە. هەروەها ئەگەر کار و کردەوە یان لەبەرکردنی زانستی دواخست چونکە کات بە دواخستن و ئەمڕۆ و سبەی کردن دەڕوات و بەسەردەچێ و مەبەست و ئامانجیش لەدەست دەچێت. ڕەنگە بڕیاری کارێکی خێری دا یان شتێك لە ماڵ و داراییەکەی کردە وەقف بەڵام دوای خست و جێبەجێی نەکرد و مردنیش لەناکاو بەربینگی گرت.

ژیر ئەو کەسەیە لە وێناکردنی ئەوەی ئەگەری ڕوودانی هەیە گورج و چاپووکە و بە گوێرەی ئەوە کار دەکات، ئەگەریش تەمەن درێژ بوویەوە ئەوا زیانی پێ نەگەیشتووە، ئەگەریش ئەوەی لێی دەترسا ڕوویدا ئەوا ئەو ئامادەکاری و خۆپارێزی کردووە.

پەیوەست بە دونیا: مەیلی بە لای دەسەڵاتدارەوە بێت و خراپە لەگەڵ هەندێ لە دەستوپێوەندەکانی بکات، ڕەنگە ئەو دەسەڵاتدارە بگۆڕێت و دوژمنەکەی بەرزبێتەوە و تۆڵەی لێ بسێنێتەوە. ڕەنگە دژایەتی هەندێ هاوڕێ بکات و بەلایەوە گرینگ نەبێت چونکە لە حاڵی ئێستادا ئاستی ئەو لەم نزمترە، ڕەنگە پێچەوانە ببێتەوە و پایەی ئەو بەرزبێتەوە، ئیتر تۆڵەی کردەوە خراپەکانی بە زیادەوە لێ بکاتەوە.

ژیر ئەو کەسەیە سەیری ئەوە بکات کە ئەگەری ڕوودانی هەیە و دژایەتی هیچ کەسێك نەکات: ئەگەر شتێك لەنێوانیاندا هەبوو کە دەبووە مایەی دوژمنایەتی ئەوا دەیشارێتەوە، ئەگەر بۆی لوا دابەزێتە سەر دوژمنەکەی و تۆڵەیەکی وەهای لێ بکاتەوە کە شەرع ڕێی پێ داوە ئەوا دروستە بەڵام لە بواری ژیان و گوزەراندا لێخۆشبوون باشتر و شیاوترە.

لەبەرئەوە پێویستە بێکار خزمەت بکرێ چونکە ڕەنگە کار بکات و ئەو کات ئەو خزمەتەی لەبەرچاو بێت..

ئیتر هەموو حاڵوبارەکان لەسەر ئەو نموونەیەی باسم کرد قیاس بکە.

## ٢٠٧- دووربوون له دەسەڵاتداران

بە ئەندازەی بەرزبوونەوەی مرۆڤ لە دونیا، ئاستی لە ئاخیرەت نزم دەبێتەوە. ئەمە قسەی ئیبن عومەرە کە وتوویە: سوێند بە خوا هەر کەسێك شتێك لە دونیا بەدەست بێنێ ئیللا لە لای خودا پلە و ئاستی دادەبەزێ ئەگەر لای ئەو ڕێزداریش بێت.

بەختەوەر ئەو کەسەیە کە بەوەندە ڕازی بێت کە بەشی پێویستییەکانی بکات، کات لەوە بەنرخترە کە لە خواستنی دونیا بەفیڕۆ بدرێت ئیللا ئەگەر لە کار و کاسبیدا خۆپارێز بێت و دوور بێت لە تەماع و چڵێسی و مەبەستی هاوکاریی ئەهلی چاکە و خێرکردن بە هەژاران بێت، ئەم کار و کەسابەتە لە بێکاری و دەسبەتاڵی باشترە..بەڵام ئەو بەرزبوونەوەیەی بە هۆی تێکەڵبوونی دەسەڵاتدارانەوەیە ئەوا زۆر دوورە دینی لەگەڵدا سەلامەت بێت، ئەگەر بە ڕواڵەتیش سەلامەت بێت ئەوا سەرەنجامەکەی ترسناکە.

(ئەبوو محەمەدی تەمیمی) وتوویەتی: خۆزگەم بە کەس نەخواستووە ئیللا (شەریف ئەبوو جەعفەر) نەبێ لەو ڕۆژەی (ئەلقائیم بیئەمریللا) مرد، بە دەستی خۆی شووشتی و هاتە دەرەوە و سەرقۆڵی کراسەکانی دادوەشاند، لە مزگەوت دانیشت و

لای بە لای کەسدا نەکردەوە، ئێمەش هەموو بێتاقەت و نیگەران بووین نەماندەزانی چیمان بەسەردێت! !

ئەوە لەبەرئەوە بووە چونکە تەمیمی پەیوەست بووە بە دەسەڵاتداری پێشوو، نامە و پەیامی وی دەگەیاند، لە سەرەنجامی ئەو نزیکییە ترسا.

کۆمەڵێك لە زانایانمان بینی تێکەڵی سوڵتان بوون، ئیتر چارەنووس و سەرەنجامیان خراپ بوو.

سوێند بە خوا ئەوان بەدوای حەسانەوە و خۆشی بوون بەڵام ڕێگاکەیان هەڵە کرد، چونکە خەمەکانی دڵ هاوشانی چێژی ماڵ و چێژی خواردن نییە، ئەمە لە دونیا بەر لە ئاخیرەت.

هیچ ژیانێك خۆشتر و پاکتر نییە لە ژیانی ئەو کەسەی تاك و تەنیا لە گۆشەیەك دانیشتووە و تێکەڵی دەسەڵاتداران نابێت، بە لایەوە گرینگ نییە خواردنەکەی خۆشە یان نا، پارچە نانێك و قومە ئاوێکی هەر دەست دەکەوێ، پاشان ئەو دوور و پارێزراوە لەوەی قسەیەکی پێ بوترێ ئازاری بدات، یان شەرع یان خەڵك ڕەخنەی لێ بگرن کاتێ دەچێتە لای دەسەڵاتدارانەوە.

هەر کەسێك سەرنج بداتە حاڵی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە کاتی دابڕانی و حاڵی کوڕی ئەبی دوئاد و یەحیای کوڕی ئەکسەم ئەوا جیاوازیی نێوان خۆشیی ژیان لە دونیا و سەلامەتی لە ئاخیرەت دەزانێ.

ئیبن ئەدهەم چەند جوانی وتووە: ئەگەر پاشا و شازادەکان بیانزانیبا ئێمە لە چ خۆشییەکی ژیانداین ئەوا بە شمشێر شەڕیان لەسەر ئەو ژیانە خۆشە لەگەڵدا دەکردین.

ئیبن ئەدهەم ڕاستی وتووە، سوڵتان ئەگەر شتێکی خوارد دەترسێ ژەهری تێکرابێت، ئەگەر نووست دەترسێ تیرۆر بکرێت، ناتوانێ بۆ خۆشی و پشوودانێك بچێتەدەر، ئەگەر دەرچوو لە نزیکترین کەس لێی نیگەرانە، تام و چێژەکان لە لای ساردوسڕن، چێژ لە خواردن و پەڕین وەرناگرێ، هەر کە خواردنێکی پێ خۆش بوو زۆری دەخوات و گەدەی پێ تێك دەچێ، هەر چەند کەنیزەکەکان نوێ دەکاتەوە و هی تازە دێنێ زۆر لێیان دەپەڕێ و هێز و توانای دەڕوات، لەبەرئەوەی زۆر دەپەڕێ و پشوو نادات بۆیە زۆر چێژ لە پەڕین نابینێ، چونکە چێژی پەڕین بە ئەندازەی ماوەی نێوان دوو کاتی پەڕینە، هەروەها چێژی خواردن، هەر کەسێ لەسەر تێری خواردی و هەروەها بێ ئەوەی ئارەزوویەکی تەواوی هەبێ پەڕی ئەوا ئەو چێژە تێروتەواوە نابینێ کە هەژار دەیبینێ کاتێ برسی دەبێ و زگورتی دەیبینێ کە ژنێکی دەست دەکەوێ. پاشان هەژار بە لایەوە ئاساییە شەوێ لە دەرەوە و لەسەر ڕێگا بخەوێ، بەڵام دەسەڵاتداران لە چێژی ئاسایش بێبەشن، چێژیان ناتەواوە و لێپرسینەوەشیان زیاترە.

سوێند بە خوا کەسم نەناسیوە بە سەربەرزی ژیابێت و گەیشتبێتە ئەو چێژانەی کە کەسی تر نەیگەیشتووەتێ ئیللا زانا دڵسۆزەکان نەبێ وەکوو حەسەن و سوفیان و ئەحمەد و، خواپەرستە ڕاستگۆکان وەکوو مەعرووفی کەرخی. چونکە چێژی زانست

له هەموو چێژێك زیاتره، زیانیشیان ئەگەر برسی بووبن یان به ئازارێك تاقیكرابنەوه ئەوا ئەوه زیاتر بەرزی كردوونەتەوه، هەروەها چێژی خەڵوەت و خواپەرستی.

ئەمه مەعرووف: به تاك و تەنیا خەریكی پەرستنی پەروەرێنی بوو، ژیانی لەگەڵیدا خۆش بوو، تام و چێژی له خەڵوەت و چلەكێشی وەردەگرت، پاشان چوار سەت ساڵ لەمەوبەر كۆچی دوایی كرد (٢٠٠ كۆچی)، ڕۆژ نییه چەند بەشێك له قورئانی بۆ هەدییه نەكرێ! كەمترینی ئەوەیه كەسێك لەسەر گۆڕەكەی سورەتی (الإخلاص): ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ٤﴾

بخوێنێت و پێشكەشی بكات، دەسەڵاتداران لەبەردەم گۆڕەكەیدا بە زەلیلییەوه دەوەستن، ئەمه دوای مردن، ڕۆژی حەشریش ئەو ڕێز و شكۆیانه بڵاو دەكرێنەوه كه وەسف ناكرێن! هەروەها گۆڕی زانا ڕاستگۆیەكان.

كاتێ خەڵكانێك گرفتاری تێكەڵبوونی دەسەڵاتداران بوون ئەوا ئەو لێڵبوونە كار دەكاتە سەر هەموو ئەحواڵیان، سوفیانی كوڕی عویەینە وتوویە: لەوەتەی ماڵی فلان دەسەڵاتدارم وەرگرتووه ئەو تێگەیشتنەی بۆ قورئانم هەبوو لێم قەدەغە كراوه.

ئەمه ئەبوو یوسفی قازی دوو كەسیش سەردانی گۆڕەكەی ناكەن!

(به داخەوه دانەر سەردانی گۆڕی كەسەكان دەكاتە بەڵگەی باشی و خراپییان! لە كاتێكدا سەردانی گۆڕستان تەنها بۆ بیركەوتنەوەی مردن و پەشیمانبوونەوه لە گوناهەكان ڕێپێدراوه نەك بۆ قورئان لەسەر خوێندن و بەرەكەت).

ئـارامگرتن لـه تێکـەڵبوونی دەسـەڵاتداران – ئەگەرچـی ببێتـە هـۆی دەسـتەنگی و سەختیی ژیان لـە ڕوویەکـەوە – بـەڵام لـە چـەند ڕوویەکـەوە دەبێتـە هـۆی ژیـانی خۆش، لەگەڵ تێکەڵبوون مەبەستەکە نایەتەدی، هەر کەسێکیش بڕیاری دا دەبێـت یەکلاکەرەوە بێت.

ئەبولحەسەنی قەزوینی تەنها کاتی نوێژ لە ماڵ دەردەچوو، ڕەنگە سـوڵتان هاتبایـە و دادەنیشت چاوەڕێی دەکرد تا سەلامی لێ بکات.

قسەکردنی زۆر لـەم بارەیـەوە ڕەنگـە خوێنـەر بێـزار بکـات، ئـەوەی تـامی کردبێـت دەزانێ چ چێژی چۆنە!

## ٢٠٨- زۆربەی خەڵك لەسەر ڕاستەڕێ نین

هەر کەسێك وەکوو پێویست شەرع بناسێ و شارەزای حاڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەحواڵی هاوەڵان و زانا گەورەکان بێت ئەوا دەزانێ کە زۆربەی خەڵك لەسەر ڕاستەڕێ نین بەڵکوو لەگەڵ عادەت دەڕۆن..

سەردانی یەکتر دەکەن و هەندێکیان غەیبەتی هەندێك دەکەن و هەر یەکێکیان بە دوای عەیب و عاری براکەیدا دەگەڕێ و ئێرەیی پێ دەبات ئەگەر نیعمەتێکی هەبێ و دڵی خۆش دەبێ ئەگەر ناخۆشیی و گرفتارییەکی هەبێت و، ئەگەر ئاماۆژگاری بکات فیزی بەسەردا دەکات و بۆ وەدەسهێنانی شتێکی دونیا فریوی دەدات و تا بتوانێ کەموکورتی و خەوشەکانی لێ دەگرێ...

هەموو ئەمانە لەنێوان ئەو کەسانەدا ڕوودەدات کە خۆیان بە زاهید دادەنێن نەك کەسانی گەجەر و گوجەر..

ئەو کەسەی خودای گەورە و شەرع و ژیاننامەی پیاوباشانی پێشینی ناسیوە وا شیاوترە لە هەمووان دابڕێت.

ئەگەر ناچار بوو دیداری یەکێك لەوانە بکات کە خۆیان داوەتە پاڵ زانست و چاکەوە ئەوا دەبێ وریا و بەئاگا بێت و زۆر قسەی لەگەڵدا نەکات، پاشان بەپەلە بگەڕێتەوە لای کتێبەکان کە لێکدانەوەی چوارچێوەی کەماڵیان تێدایە.

## ٢٠٩- هۆکارەکانی کەماڵ

کـەماڵ و تێروتـەواوی دژوارە و کەسـی کامـڵ بـوونی کەمـە. یەکـەم هـۆی کـەماڵ: ڕێکوپێکی و گونجـاویی ئەنـدامانی جەسـتە و، جـوانیی وێنـە و شـێوەی ناوەوەیـە، شێوەی جەستە پێی دەوترێ خولّقانـدن (خَلْق) و وێنـەی نـاوەوەش پێـی دەوتـرێ ڕەوشت (خُلُق).

بەڵگەی کەماڵی شێوەی جەستە: جوانیی قەدوقامەت و بەکارهێنانی ئەدەبە.

بەڵگـەی وێنـەی نـاوەوەش: تـەبیات و ڕەوشـتی جوانـە، تـەبیات: پاکـداوێنی و دەسـپاکی و خـۆ بـەدوورگرتن لـە جـەهل و چڵێسـی. ڕەوشـتەکان: بەخشـندەیی و باودان (الایثار) و داپۆشینی عـەیب و عـار و دەسپێشـخەری چـاکە و لەسـەرخۆیی و پشوودرێژی لەگەڵ نەفام.

هـەر کەسـێ ئـەم شـتانەی پـێ درا بـەرەو کـەماڵ بـەرزی دەکاتـەوە و بـەڕێزترین ئاکارەکانی لێ وەدەردەکەوێ، ئەگـەر ئاکارێـك کـەم بـوو ئـەوا کەموکورتییـەك چـێ دەبێت.

## ٢١٠- تەسلیمبوون بە بڕیاری خودا و ڕازییوون بە قەدەر

لە دونیادا گەمژەتر لەو کەسە نییە کە دەیەوێ لەسەر گەیشتن بە مەبەست و ئامانجەکانی مامەڵە لەگەڵ خودا بکات. کەواتە بەڵا و تاقیکردنەوە کوا؟!

هەر کەسێك دەیەوێت سەلامەتی بۆ بەردەوام بێت و سەرکەوێت بەسەر دوژمنانیدا و لە بەڵا و ناخۆشی بەدوور بێت ئەوا واتای تەکلیفی نەزانیوە و لە مانای تەسلیمبوون تێ نەگەیشتووە.

ئەی ئەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەبوو ڕۆژی بەدر سەرخرا پاشان ڕۆژی ئوحود چی بەسەرهات؟!

ئەی لە سەردانیکردنی کەعبە ڕێگری لێ نەکرا و ناچاری گەڕانەوە کرا؟!

هەر دەبێ باش و خراپ هەبێ، باش سوپاسگوزاری پێویست دەکات و خراپیش بەرەو داوا و دوعا دەتبزوێنێ، ئەگەر وەڵام نەبوو بەردەوامیی بەڵا و تەسلیمبوون بە بڕیاری خودا ویستراوە.

ئا لێرەدا ئیمان ڕوون دەبێتەوە و لە تەسلیمبووندا جەوهەر و ناوەڕۆکی پیاوان دەردەکەوێت. ئەگەر تەسلیمبوون لە ناوەوە و دەرەوە هاتەدی ئەوا ئەوە کاری

مرۆڤی کامڵە. ئەگەریش لە ناوەوە دڵگوشرانێك لە بڕیارەکە نەك بڕیاردەرەکە – سروشتی مرۆڤ حەزی بە ئازاردەر نییە – هەبوو ئەوا نیشانەی لاوازیی مەعریفەتە.

ئەگەر کارەکە بەرەو ڕەخنە و ناڕەزایی بە زمان ڕۆیشت ئەوا پەنا بە خوا ئەوە حاڵی نەفامانە.

## ٢١١- ئارامگرتن لەسەر بەلا و ناخۆشی

بەلای گەورە ئەوەیە مرۆڤ لە شوێنێك دانیشێت كە شوێن و مەقامی وی نەبێت. وەكوو ئەوەی پیاوچاكێك ناچار بێت مادەلایی بۆ ستەمكارێك بكات و هاموشۆی بكات، یان تێكەڵی كەسانی نەشیاو و نەگونجاو بێت یان كارگەلێك بكات كە شیاوی ئەو نەبێت یان ناچاری شتگەلێك بێت كە لەو ئامانجەی هەیەتی دایبڕێنێت.. وەكوو ئەوەی بە زانایەك بوترێ: هامۆشۆی دەسەڵاتدار بكە وەگەرنا دەترسێن ستەمت لێ بكات و ئازارت بدات! ئیتر ئەویش هاموشۆی بكات و شتانێكی نەشیاو ببینێت و نەتوانێ نكوولّییان لێ بكات..یان پێویستی بە شتێك لە دونیا ببێت — مافەكەشی لێ زەوت كراوە — پێویست بكات باسی ئەوە بكات یان ئاشكرای بكات بۆ ئەوەی هەندێ مافی دەست بكەوێت، وە پێویستی بە مودارات و مادەلاییی ئەو كەسانە بێت كە موداراتیان دژوارە، بەڵكوو هەوڵ و هیممەت و خەمی بۆ ئەو شتە پێویستانە پەرشوبڵاو دەبێت..هەروەها پێویستی بەوە دەبێ بچێتە نێو هەندێ كارەوە كە شیاوی ئەو نییە، وەكوو ئەوەی پێویستی بە كەسابەت و ئیشكردن بێت و هاتوچۆی بازاڕ بكات یان خزمەتی ئەو كەسە بكات كە كرێی دەداتێ! ئەمەش بە هۆی تێكەڵبوونی خڵتە و پڵتەوە دڵێك بەرگەی ناگرێ كە هەمیشە خودای لەبیر و لەبەرچاوە.. یان خێزانێكی هەبێ و هەژاریش بێت و بیر لە دەوڵەمەندكردن و بێنیازكردنیان بكاتەوە، بەو هۆیە بچێتە نێو هەندێ شوێنەوە كە هەموویان بە لای

ئەمەوە گوناهی گەورەن.. ڕەنگە تووشـی لەدەسـتدانی خۆشەویسـتانی ببێـت یـان بەلایەك بەسەر جەستەیدا بێـت یـان مەبەسـتەكانی پێچـەوانە بێتـەوەو دوژمنـەكانی بەسەریدا زاڵ بن، ببینێـت لـەڕێلادەر (فاسـق) بەسـەریدا زاڵ دەبـێ و سـتەمكاریش زەلیلی دەكات، هەموو ئەم شتانە ژیانی لێ دەشێوێنێ و نزیكە دڵ بهەژێنێ.

لـە تووشـبوون بـە تاقیكردنـەوە و بـەلا هـیچ شـتێك نییـە جگـە لـە تەسـلیمبوون و پەنابردنە بەر خـودا تـا دەروویـەكت لێ بكاتـەوە، ئـیتر دەبینـرێ مرۆڤـی ئیمانـداری ڕەند و مەرد لە بەرانبەر ئەم بەلایە گەورانە دامەزراو دەبێ و دڵـی نـاگۆڕێ و زمـانی هیچ ناڕەزاییەك دەرنابڕێ.

ئەی ئەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نـەبوو پێویسـتی بـەوە بـوو بڵـێ: ((كـێ پەنام دەدا و دەمحەوێنێتەوە؟ كێ یارمەتیم دەدات و سەرم دەخات؟))

وە پێویستی بەوە بوو لە پەنای بێباوەڕێكدا بچێتەوە نـاو مەككـە و ورگـی حوشـتر فڕێ دەدرایە سەر پشتی و هاوەڵانی دەكوژران و موداراتی نەوموسڵمانەكانی دەكرد و زۆر برسی دەبوو بەڵام ئارام بوو و نەدەگۆڕا؟!

ئەوە تەنها لەبەرئەوە بوو دەیزانی كە دونیا خانەی تاقیكردنەوەیە بۆ ئـەوەی خـودا سەیر بكات مرۆڤەكان چی دەكەن.

ئەوەی ئەم شتانە سووك و ئاسان دەكات ئەوەیە بەندە بزانێ چ پاداشتێكی هەیە و ئەوەش مەبەستی خودای حەقە.

## ٢١٢- ماڵ و سامان زۆر کەسی کردە کۆیلە

نکوولّی لەوە ناکرێت کە سروشتی مرۆڤەکان حەز بە ماڵ و دارایی دەکەن چونکە هۆکاری مانەوەی جەستەکانە بەڵام خۆشەویستیی ماڵ و دارایی لە هەندێ دڵدا زیاترە، تا وای لێ دێت ماڵ و پارە لەبەر خودی خۆی خۆشەویست دەبێ نەك بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئامانجەکان! دەبینی کەسی قرچۆك شتی سەیروسەمەرە دەخاتە ئەستۆی خۆی و نەفسی لە خۆشی و چێژەکان قەدەغە دەکات و چێژ تەنها لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دەبینێ!

ئەمەش خوویەکە لە خەڵکێکی زۆردا هەیە و سەیریش نییە کە لە نەفاماندا هەبێ بەڵکوو سەیر ئەوەیە لە ئەهلی زانستدا هەبێ. پێویستە زانایان دژایەتی و سەرپێچی ئەم خووە بکەن، بەتایبەتی لەو کردەوانەی بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی پێویستن، یان ئەوەتا زانا لە ڕووە ناشیرینەکان و گوماناوییە بەهێزەکانەوە ماڵ و سامان بە ڕژدییەکی توند و بە زەلیلی لە داواکردن کۆدەکاتەوە، پاشان لە زەکات وەری دەگرێ کە لەگەڵ پێویستنەبوون بۆی حەڵاڵ نییە پاشان هەڵی دەگرێ و سوودی لێ نابینێ، ئەمە سیفەتێکی ئاژەڵییانەیە و لە ئادەمیبوون دەری دەکات بەڵکوو ئاژەڵییەت هیچ لۆمەیەکی لەسەر نییە چونکە بە ڕاهێنان و وەرزین سروشتی

دەگۆڕێ بەڵام ئەمانە نە ڕاهێنان و وەرزین گۆڕیونی، نە زانستیش سوودی پێ گەیاندوون!

(ئەبولحەسەن بەستامی) لە خانەقای بەستامی نیشتەجێ بوو کە لەسەر ڕووباری عیسا بوو (لقە ڕووبارێکی فورات بوو لە سەرووی شاری بەغدا)، هاوین و زستان تەنها جلکی خوری لەبەر دەکرد، خەڵك ڕێزیان دەگرت و سەردانیان دەکرد، دوای مردنی زیاتر لە چوار هەزار دیناری زێڕی لە پاش بەجێما!!

پیرەپیاوێکمان بینی کە تەمەنی گەیشتبووە هەشتا ساڵ، نە ژنی هەبوو نە منداڵ، نەخۆش کەوت و خۆی خستە کن هاوڕێیەکی، ئەو پیاوە بۆ شتێك کە ئەو حەزی پێ دەکرد ڕووی لە خەڵك دەنا و پێی چاکیش نەبووەوە، مرد و ماڵ و سامانێکی زۆری لە دوای خۆی بەجێهێشت!

(صەدەقەی کوڕی حوسەین)مان دیت کە بەردەوام زەمی زەمان و خەڵکی دەکرد و لە داواکردن لە خەڵك زیادەڕەوی دەکرد و بە تەنیا لە مزگەوت دەمایەوە و کەس نەبوو خزمەتی بکات، کە مرد سێ سەت دیناری زێڕی لە پاش بەجێما!

(ئەبوو تالیب کوڕی موئەییەدی صۆفی) هاوڕێیەتی دەکردین و پارە و سامانی کۆدەکردەوە، نزیکەی سەت دیناری لێ دزرا، ئەوەندە خەفەتی لێ خوارد تا بووە هۆی مردنی.

وه له ئەحواڵی خەڵك تۆ خەڵكانێك دەبینی لەسەر سەكۆی خەڵك دانیشتوون و داوای كرانەوه دەكەن، پاره و پوولی زۆریان بۆ دێت و پێی دەوڵەمەند دەبن، كەچی واز له وەرگرتنی زەكات و داواكاری ناهێنن!

هەروەها چیرۆكخوێنەكان بە وڵاتدا دەگەڕێن و داوای پارە دەكەن، پارە و سامانێكی زۆریان دەست دەكەوێ بەڵام هەر واز له نەریتی داواكردن ناهێنن.

پاك و بێگەری بۆ خودا! زانست چ سوودێكی پێ گەیاندن؟! بەڵكوو نەزانی و نەفامی بۆ ئەمانه ئینسافترە!

له قێزەونترین حاڵوباریان پابەندبوونیانە بەو هۆكارانەی دونیایان بۆ دەردەست دەكات وەكوو: سەركزكردن و خواپەرستی له ڕواڵەت و بەردەوام هاندانی گۆشەگیری له تێكەڵبوون!

هەموو ئەمانە دوورن له شەرع. سەرنجی هەندێكیانم داوه كه ئەوەندە تانەی له هاوشانەكەی داوه تا گەیشتۆتە ئەوەی دووچاری لەناوچوونی بكات.

واوەیلا بۆیان! چەندە كەم چێژ له ڕواڵەتەكانی دونیا دەبینن! ئەگەرچی خودا دڵەكانی له خۆشویستنیان وەرچەرخاندووه – چونكه خودا دڵەكان تەنها بە لای دڵسۆزان وەردەگێڕێت –، دونیای ڕاستەقینەیان لەدەست چوو و تەنها شێوەی داروپەردوویان دەست كەوت!

داوای عەقڵێك له خودا دەكەین دونیامان ڕێك بخات و ئاخیرەتمان بەدەست بێنێ، خوای ڕۆزیدەر تواناداره.

## ٢١٣- بەهادارترین شتی دونیا

بۆ کەسێك کە گەورەیی و شەڕەفی بوونی زانیوە پێویستە باشترین هەبوو(مەوجوود) بەدەست بێنێت.

ئەم تەمەنە وەرزێکە و بازرگانییەکانیش جیاوازن و خەڵك بە گشتی دەڵێن: ئەوە بکەن کە باری سووکە و نرخی زۆرە، پێویستە کەسی بەئاگا تەنها داوای بەنرخترین بکات.

بەهادارترین شتیش لە دونیا ناسینی خودای گەورەیە.

خواناسی ڕێبوار هەیە هەر لە ڕێگای سەفەر بە ئامانجەکەی گەیشتووە. هەیانە هیممەتی پەیوەستە بە خواستنی قازانجەکەی. هەیانە تەماشا دەکات چ شتێك خۆشەویست ڕازی دەکات و دەیهێنێتە بواری مامەڵەوە و بە نرخی قەبووڵ ڕازییە و پێی وایە هەموو کاڵاکان بەشی هەقی پەیمان و ئەمان ناکات.

هەیانە پێی وایە پێویستە لە هەڵبژاردنی ئەم گرتنەبەری ڕێیە سوپاسی خودا بکات و دان دەنێ بە دەستەپاچەیی خۆی.

خەڵکێکیش لەم ئەحواڵە بەرز بوونەوە و پێیان وابوو کە تەنها پاڵپشتیی خودا مەشغوولیان دەکات لە سەیرکردنی کار و کردەوە.ئەمانە ژمارەیان کەمترە..

## ٢١٤- ساتەکان بقۆزنەوە و خۆتان بۆ مردن ئامادە بکەن

هەرکەسـێ زانـی بەجێهێشـتنی مەککـە نزیـك بۆتـەوە ئـەوا تـەواف زیـاتر دەکـات بەتایبەتی ئەگەر ئومێدی گەڕانەوەی نەبێ لەبەر گەورەیی تەمەن و بێهێزی.

بە هەمان شێوە ئەو کەسەی بە هۆی هەڵکشانی تەمەنیەوە لە کـەناری مـردن نزیـك بۆتەوە پێویستە ساتەکان بقۆزێتەوە و کات بەفیڕۆ نەدات و چـاوەڕێی مـردن بکـات بەو جۆرەی بۆی بـاش و گونجـاوە، مـرۆڤ لـە تەمـەنی گەنجییـدا بـەهێز و بەتوانایـە بەڵام دواتـر وردە وردە بـەرەو بێهێـزی و لاوازی دەچـێت تـا ئـەوەی لـە سـەردەمی پیریـدا تـەواو کـز و سسـت دەبـێ، ئـیتر هـیچ شـتێکی لەبـەردەم نـامێنێ تـەنها تەسلیمبوون بە جەنگاوەری مردن نەبێ.

کەواتە بۆ خاتری خودا پەلە و دەسپێشخەری بکەن بۆ خۆ پاککردنەوە تاوەکوو بـە پاکژییەوە بچیتەوە لای خودا.

چ ژیانێك لە دونیـا خـۆش و بەچـێژە بـۆ کەسـێك ڕۆژە سـاغەکانی لـە مـردن نزیکـی دەخەنەوە و هەڵکشـانی تەمـەنی دابەزینـە لـە ژیـان و زۆر مانـەوەی کەمکردنـەوەی ڕادە و ئەندازەی ماوەی تەمەنە؟!

ئیتر با بیر لە داهاتووی بکاتەوە و ئەمە گرینگترینە لەوەی باسمان کرد.

ئەی لە فەرموودەی صەحیحدا نەهاتووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((هەر یەکێك لە ئێوە بەیانیان و ئێواران شوێنەکەی لە بەهەشت یان دۆزەخ پێ نیشان دەدرێ و پێی دەوترێ: ئەمە شوێنەکەتە تا خودا زیندووت دەکاتەوە.)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە.

ئاخ و ئۆف بۆ کەسێکی گەفلێکراو کە بەر لە کوژران چەند کەس دەکوژێت! خۆشیی ژیان بۆ کەسێکی بەڵێن پێدراو بە زۆرترین ئاوات و خۆزگە!

ئەو کەسەی تەمەنی لە حەفتا نزیك بۆتەوە با بزانێ کە نەفەسی بۆتە ناڵە!

خوای گەورە یارمەتی ئەو کەسە بدات کە کۆسپی تەمەنی بڕیوە لە مردنی لەناکاو.

## ٢١٥- گەورەیی پێغەمبەرمان

هەر کەسێك ویستی لە کردەوەکانیەوە حەقیقەتی ڕازیبوون لە خوداوە بزانێ و دەرکی ئەوە بکات کە ڕەزامەندی لەکوێوە پەیدا دەبێ با بیر لە ئەحواڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکاتەوە.

چونکە هەر کاتێ مرۆڤ بەتەواوی خودای خوڵقێنەری ناسی دەبینێ و دەزانێ کە خوڵقێنەر خاوەندار (مالك)ە، خاوەنداریش مافی ڕەفتارکردنی لە موڵکەکانی هەیە، وە بە حەکیمی دەبینێ کە هیچ شتێك بێهوودە و لەخۆڕا دروست ناکات و وەکوو کۆیلەیەك خۆی تەسلیمی دەستی حەکیمێك دەکات، ئیتر سەیروسەمەرەکان بەسەریدا دێن و هیچ گۆڕانکارییەك لێی ڕوونادات و ئاخ و ئۆفێك ناکات و بە زمانی حاڵ ناڵێ: ئەگەر ئاوا بووایە ! بەڵکوو چۆن شاخ بەرانبەر با و زریان ڕادەوەستێ و ناهەژێ ئەویش ئەوها لە هەمبەر قەدەرەکان دامەزراو دەبێ.

ئەمە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) گەورەی پێغەمبەران تەنها بۆ خەڵك نێردراوە و بێباوەڕییش هەموو دونیای گرتبووەوە، وای لێ هاتبوو لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر هەڵدەهات و خۆی لەنێو ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم دەشاردەوە، ئەگەر بهاتبایە دەرەوە لێیان دەدا و بریندداریان دەکرد و هەناوی حوشتریان فڕێ دەدایە سەر پشتی، ئەویش بێدەنگ و ئارام بوو.. هەموو وەرزێکی

حـەج دەچـووە کەعبــە و دەیـوت: ((کـێ پــەنام دەدات و دەمحەوێنێتــەوە؟ کـێ یارمەتیم دەدات؟))..پاشان لە مەککە دەرچوو، نەیتوانی بگەڕێتەوە ئیللا لە پــەنای بێباوەڕێك نەبێت.

وێڕای هەموو ئەمانەش نە داخ و ئۆفێکی کرد نە لە ناخەوە ڕەخنە و پەڵپێکی گرت، ئەگەر غەیری وی وای بەسەرهاتبایە ئەوا دەیگوت: ئەی پەروەردگارم! تۆ خـاوەنی هەموو خەڵکیت و لە هەمووان بەتواناتریت بۆ یارمەتیدان و سەرخستن، ئـیتر بۆچـی من زەلیل بکرێم؟! هـەروەکوو عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـە ڕۆژی ڕێککـەوتنی حودەیبیەدا گوتی: ئەی ئێمە لەسەر هەق نین؟!ئیتر بۆچـی نزمـی لـە ئاینەکـەمان قەبووڵ بکەین؟! کاتێ ئەمەی وت پێغەمبەر (صلی الله علیـە وسـلم) پێـی فـەرموو: ((من بەندەی خوام و ئەویش دەسبەردارم نابێ و پشتم بەرنادات)).. ئـەو دوو وشـە بنچینەییەی کۆکردەوە کە باسمان کرد: فەرمایشتی ((من بەندەی خوام)) دداننانـە بە مولکایەتی و خاوەندارییەتیی خـودا، وەك ئـەوەی بڵـێ: مـن مـوڵکی خـودام چـی بیەوێت پێم دەکات. وە فەرمایشتی ((دەسبەردارم نابێ)) ڕوونکردنەوەی حیکمەتی خودایە و واتە ئەو هیچ شتێکی بێهوودە و لەخۆڕا ناکات.

پاشـان گرفتـاری برسـێتی دەبـێ و بـەرد لەسـەر سـکی خـۆی دەبەسـتێ..هەموو گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەویش هی خودایە.

هـاوەڵانی دەکـوژرێن و ڕووخسـاری برینـدار دەکـرێ و ددانـی دەشـکێنرێ و تـەرمی مامی ئەتك دەکرێ، ئەویش بێدەنگە.

پاشان کوڕێکی پێ دەبەخشرێ و لێی دەسەنرێتەوە و خۆی بە حەسەن و حوسەین دڵخۆش دەکات و پێیان دەڵێ کە چییان بەسەردێت.

دڵی بە حەزرەتی عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) خۆش دەبێ کەچی ئەم خۆشییەی بە تۆمەتبارکردنی بە زینا لێ تێک دەدرێ. چەندان پەرجوو (موعجیزە) نیشان دەدات و لەم لاوەش (موسەیلەمەی درۆزن) و (ئەسوەد ئەلعەنسی) ( ئیبن صەییاد)ی لێ قیت دەبنەوە و داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن.

شەریعەتی ئەمانەت و ڕاستگۆیی دادەمەزرێنێ و پێی دەوترێ: درۆزن و جادووگەر!

پاشان تووشی نەخۆشی دەبێت و هێندەی دوو کەس ئێش و ژانی دەبێت بەڵام ئارام و بێدەنگە. پاشان مردن یەخەی دەگرێ و لەنێو کراس و شەرواڵێکی خوری ئەستور و زبر ڕۆحی پاکی لێ دەسەنرێتەوە، تەنانەت سووتەمەنییەکیان نییە چرای پێ داگیرسێنن!

هیچ پێغەمبەرێکی پێش خۆی نەیدەتوانی وەکوو پێویست ئارام لەسەر شتێکی وەها بگرێت تەنانەت گەر فریشتەش گرفتاری ئەمانە بووایە ئارامیان نەدەگرت.

ئەمە ئادەم (سڵاوی خوی لێ بێت) هەموو بەهەشتی بۆ حەلاڵ دەکرێ تەنها درەختێك نەبێ کەچی ئارامی لەسەر ناگرێ و دەکەوێتە هەڵەوە! پێغەمبەریشمان (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئەو شتانەی لە دونیا ڕێپێدراون دەفەرموێت: ((من و دونیا کوجا مەرحەبا؟!)) واتە من دونیام بۆچییە؟!

ئەمە نوح (سلاوی خوی لێ بێت) لەو کێشــە و ناخۆشــییانەی لەدەســت گەلەکەیــەوە تووشی دەبێـت هاواری لێ هەڵدەستێ و لە خــەم و خەفــەتان هــاوار دەکــات: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾﴾ (نــوح: ٢٦) واتــە: خودایــە هــیچ بێباوەڕێـك لەسەر زەوی مەهێڵەوە و هەموویان لەناوببە.

کەچی پێغەمبەری ئێمە (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((اللهم اهد قومي فإنهم لا يعلمون)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە. واتە: خودایە هیدایــەتی گەلەکــەم بــدە چونکە ئەوان نازانن.

ئەمە حەزرەتی موسا (سلاوی خوی لێ بێت)، لە کاتی پەرستنی گوێرەکە لە لایەن گەلەکەیەوە لە بەرانبەر قەدەر هاواری لێ هەڵدەستێ و داوای فریاکەوتن دەکات و دەڵێ: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ﴾ (الأعراف: ١٥٥) واتە: خودایە ئەمە تەنها تاقیکردنەوەیەکە لە لایەن تۆوە..

فریشتەی مردن دێتــە لای و چــاوێکی دەردێنــێ و، حــەزرەتی عیســاش دەڵــێ: ئــەی خودایە ئەگەر مردن لە کەسێك دوور دەخەیتــەوە ئــەوا لــە منــی دوورخەوە..کەچــی پێغەمبەری خۆمان (صلى الله عليه وسلم) کە لــە نێــوان مانــەوە و مردنــدا سەرپشــك دەکرێ چوون بۆ لای خوای گەورە هەڵدەبژێرێ.

ئەمە حەزرەتی سولەیمان (سلاوی خوی لێ بێــت) دەڵــێ: ﴿وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ﴾ (ص: ٣٥) واتە: موڵکێکی وام پێ بدە کە دوای مــن بــە هــیچ کەســێکی تــر ڕەوا نەبێ.

کەچی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا)) واتە: خودایە ڕۆزی کەسوکاری موحەممەد تەنها ئەوەندە بێت بەشی ژیانیان بکات.

سوێند بە خوا ئەمە کردەوەی کەسێکە بوون و بوونهێنەری ناسیوە، مەبەست و ئامانجە کەسییەکانی مردووە و پەڵپ و ڕەخنەکانی نەماون، حەز و ئارەزووەکانی بەپێی خواستی خوداکەی بووە.

## ٢١٦- هيچ ژنێك بێ خەوش نییە

زۆربەی ئارەزووەکانی بەرهەست، ژنانن. مرۆڤ ژنێکی پۆشتە دەبینێ و وا خەیاڵ دەکات کە لە ژنەکەی خۆی جوانترە یان بیر لە ژنانی جوان دەکاتەوە و بیریشی تەنها بۆ ژنی جوان دەچێ، ئیتر هەوڵی ژنهێنانی تر دەدات، ئەگەر کارەکەی بۆ مەیسەر بوو ئەو جارە سەیری خەوش و نەنگییەکانی دەسکەوتووەکەی دەکات کە پێشتر بیری لێ نەدەکردەوە و بێزار دەبێ و داوای هیتر دەکات و نازانێ دەسکەوتنی ئامانج و مەبەستەکانی لە ڕواڵەت ڕەنگە چەندان مەینەتی و دەردەسەری تێدابێت، وەکوو ئەوەی ژنی دووەم دینی نەبێ یان عەقڵ، یان خۆشەویستی نەبێ یان بەڕێوەبردن، ئیتر بەم جۆرە زیاتر لەو سوود و خۆشییانەی دەستی دەکەوێ شت لە دەست دەدات!

هەر ئەم هۆیەشە زیناکەرانی تووشی کاری بەد کردووە چونکە کە لەگەڵ ژنەکە دادەنیشن کەموکورتییەکانی داپۆشراوە و جوانییەکانی بەدەرەوەیە، ئیتر لەم ساتەدا چێژ وەردەگرن، پاشان دەچنە لای یەکێکی تر.

کەسی ژیر با بزانێ کە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستی تەواو هەروەکوو ئەو دەیەوێ، ﴿وَلَسْتُم بِآخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ﴾ (البقرة: ٢٦٧) واتە: وەریناگرن مەگەر چاوی لێ بنووقێنن.

به جوانتر لەم وتەیەی خودا عەیب لە ژنانی دونیا نەگیراوە: ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ (البقرة: ٢٥) واتە: لە بەهەشتدا هاوسەری پاك بۆ ئیمانداران هەیە.

کەسی نەفسبەرز خۆی بەدوور دەگرێ لە شێوەی پیس و خەوشی ڕەوشت، مرۆڤ با بەوە ڕازی بێت کە ناوەوەی دینە و دەرەوەشی خۆداپۆشین و قەناعەتە، ئەو کات بە دڵێکی خۆش و پاك و ئارام دەژی. هەر کات ژنی زۆری هێنا ئەوا ئەو کات سەرقاڵبوونی دڵ و تەنکیی دینی زۆرتر دەکات.

## ٢١٧- هەر كەسێك و بۆ شتێك

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی هەر کەسێکی بە هونەر و کارێك مژوول کردووە تا چاوەکان لە دونیادا بخەون.

سەبارەت بە زانستەکانیش، ئەم قورئانە و ئەم فەرموودە و ئەم نەحوەی خۆشەویست کردووە... چوون ئەگەر ئەوە نەبووایە ئەوا زانستەکان لەبەر نەدەکران و نەدەپارێزران.

یەکێکی کردۆتە نانەوا و یەکێکیش دروستکەری هەریسە، ئەمە درك و داڵ لە بیابانەوە دێنێ و، ئەمەش زیپکە خاوێن دەکاتەوە...هەموو ئەمانە بۆ ئەوەی کاروباری خەڵك بەڕێوە بچێت، بۆ نموونە ئەگەر هەموو خەڵکی کردبایە نانەوا ئەوا ئەو هەموو نانە خەسار دەبوو! یان هەموو ببووناپە دروستکەری هەریسە ئەوا هەریسە وشك دەبوو! بەڵکوو ئیلهامی ئەمە و ئەوە بە ئەندازە دەکات تاوەکوو کاروباری دونیا و کاروباری ئاخیرەت ڕێککەوێت..

ئەو خەڵکانە دەگمەنن کە خودا ئیلهامی کەماڵ و داوای باشترین و کۆکردنەوەی زانست و کار و مامەڵەکانی دڵیان بکات... خاوەنی ئەم حاڵانەش جیاوازن..

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی چی بوێت دەخوڵقێنێ و هەڵدەبژێرێ.

داوای لێبووردنی لێ دەکەین ئەگەر ڕەزامەندی نەبێ و سەلامەتی لێ دەخوازین ئەگەر شیاوی مامەڵە نەبین.

## ٢١٨- ناسینەوەی فەرموودەی ڕاست و هەڵبەستراو

فەرموودەزانی (علم الحديث) بریتییە لە شەریعەت، چونكە ڕوونكەرەوەی قورئان و ڕۆشنكەرەوەی حەلاڵ و حەرام و دەرخەری ژیاننامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانیەتی.

بەڵام فەرموودە درۆی تێكەڵ كراوە و شتی زۆر ناشیرینیان تێ خستووە. ئەگەر زاهید و ئامۆژگار یارمەتی بدرێن و سەركەوتوو بن ئەوا تەنها ئەو فەرموودانە باس دەكەن كە شایەتی ڕاست و دروستییان دراوە. ئەگەریش لە یارمەتی و سەركەوتن بێبەش كران ئەوا زاهید بە هۆی گومانباشیی بە گێڕەرەوەكان ئەوا كار بە هەر فەرموودەیەك دەكات بیبیستێ! ئامۆژگاریش بە هۆی ناشارەزایی لە ڕاستاندن(تصحيح) هەر شتێك ببینێ دەیڵێت! ئیتر ئەحواڵی زاهید تێك دەچێ و بێ ئەوەی بزانێت لە ڕاستەڕێ لادەدات.

چۆن ئەمە ڕوونادات لە كاتێكدا زۆربەی ئەو فەرموودانەی ئاماژە بە زوهد دەكەن ساغ نەبوونەتەوە و نەسەلماون!؟ وەمو ئەو فەرموودەیەی لە زاری پێشەوا عومەر گێڕدراوەتەوە: ((هەر مرۆیەكی موسڵمان ئارەزوویەكی بزوا و ئارەزووەكەی ڕەتكردەوە و لەسەر نەفسی باویدا ئەوا خودا لە گوناهەكانی خۆش دەبێ)) ئەمە

فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە، شتگەلێك لە مرۆڤ قەدەغە دەکات کە ڕێی پێدراوە بیانکات تاوەکوو توانای خواپەرستی و تاعەتی خودای هەبێ.

یان وەکوو فەرموودەی: ((هەر کەسێك جلکێکی جوانی لەبەرکرد..)).

هەروەها گێڕاپتیانەوە گوایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوو پێخۆریان لە پێش داناوە، فەرموویەتی: ((دوو پێخۆر لە جامێکدا؟! پێویستم پێی نییە، پێم ناخۆشە خودا لەبارەی شتە زیادەکانی دونیا لێم بپرسێت)).

لە صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گندۆرەی بە خورما خواردووە.

ئەگەر بەدواداچوون بکرێ وێنەی ئەمە زۆرە!

لەسەر هەڵە و نارەوا بیروباوەڕیان بنیات ناوە بۆیە ئەحواڵی ئامۆژگار(واعین) و ئامۆژگاریکراو بەد و خراپ بوو، چونکە قسەکانی لەسەر شتگەلی گەند و بەد و ئەستەم هەڵدەچنێ.

کۆمەڵێك لە زاهیدان کاریان لەسەر فەرموودەگەلێکی ناڕاست دەکرد، ئیتر کاتیان لە نارەوا و نادروست بەفیڕۆ دەچوو، پاشان ڕەخنەیان لە زانایان دەگرت لەوەی کە شتە ڕێپێدراوەکان بەکاردێنن و پێیان وایە کە وشکی واتە دین!

هەروەها ئامۆژگارەکان بە فەرمووده‌گەلێکی ناڕاست کە هیچ پەیوەندییەکی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانیەوە نەبوو قسەیان بۆ خەڵك دەکرد، مەحاڵ لە کنیان ببووە شەریعەت.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی ئەم شەریعەتەی بە قسە و وتەی پیاوچاکان پاراستووە، دەسکاریکردنی توندڕەوان و خۆ بە خاوەن زانینی پووچگەرایانی لێ دوور دەخەنەوە.

## ٢١٩- (مسند)ی ئیمامی ئەحمەد

هەندێ لە فەرموودەزانان لێیان پرسیم: ئایا لە (مسند أحمد) فەرموودەی ناڕاست هەیە؟ وتم: بەڵێ.

ئەم قسەیە بە لای کۆمەڵێك لەوانەی سەر بە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بوون قورس و ناخۆش بوو! وام لێکدایەوە کە ئەوان ڕەشۆکیین و باش لەمە تێ ناگەن بۆیە چیتر بیرم لێ نەکردەوە. کاتێکم زانی دەستیان کردووە بە فەتوا نووسین، کۆمەڵێك لە خەڵکی خۆراسان — وەکوو ئەبولعەلائی هەمەدانی — ئەم قسەیان گەورە کردووە و ڕەتیان کردۆتەوە و هێرشی ناشیرینیان کردۆتە سەر ئەو کەسەی کردوویەتی!

سەرم سوڕما و حەپەسام و لە دڵی خۆمدا وتم: سەیرە! ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ زانست و خۆیان بە زانا دادەنێن وەکوو خەڵکی ڕەشۆکییان لێ هاتووە! ئەوەش لەبەرئەوەیە ئەوان فەرموودەیان بیستووە و لە ڕاست و ناڕاستیان نەکۆڵیوەتەوە و وا گومانیان بردووە هەر کەسێك قسەی منی وتبێتەوە ئەوا تانەی لەو فەرموودانە داوە کە ئیمامی ئەحمەد گێڕایتیەوە، بەڵام وانییە!

ئیمامی ئەحمەد فەرموودەی (مەشهوور) و خراپ و باشی گێڕاوەتەوە، پاشان زۆرێك لەوانەی گێڕایتیەوە ڕەتکردۆتەوە و نەیکردۆتە مەزهەبی خۆی.

ئـەی هـەر ئـەو نییـە لـەبارەی فـەرموودەی دەسـنوێژگرتن بـە مـەی وتوویـە: نەناسراو(مجهول)ە؟!

هـەر كەسـێك تەماشـای (كتـاب العلـل) بكـات كـە (ئەبووبـەكر ئەلخـەللال) داینـاوە فەرموودەگەلێكی زۆر دەبینێ كە هەموویان لە (المسند)ن و ئیمامی ئەحمەد تانەی لێداون.

(القاضي أبي يعلى بن الحسين الفرّاء) وتوويە: ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەكەیدا ئەو فەرموودانـەی گێڕاوەتـەوە كـە ناوبـانگی هەبووە(مشـهور) و مەبەسـتی ڕاسـت و ناڕاست نەبووە، بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە كە عەبدوڵڵای كوڕی وتوویـەتی: بـە بـاوكم وت: لەبارەی ئەو فەرموودەیە چی دەڵێیت كە (ربعی كوڕی حـراش) لـە حوزەیفـەی گێڕاوەتەوە؟ وتی: ئەوەی (عبـدالعزیز كـوڕی أبـی رواد) دەیگێڕێتـەوە؟ وتم: بـەڵێ. وتی: فەرموودەكان پێچەوانەی ئەون..وتم: لـە (المسـند) باسـت كـردووە؟ وتـی: لـە (المسـند) مەبەسـتم فـەرموودەی مەشـهوور بـووە، ئەگـەر تـەنها ئەوانـەم مەبەسـت بووایە كە پێم ڕاستن ئەوا شتێكی زۆر كەمم لە (المسند) دەهێنا، بەڵام كوڕەكەم تۆ ڕێبازی من لە فەرموودە دەزانی، دژایەتی ئەو فەرموودە لاوازانـە ناكـەم ئەگـەر لـەم بابەتەدا شتێك نەبێ دووری بخاتـەوە. (القـاضـي) وتوویـە: ئیمـامی ئەحمـەد باسـی ڕێبـازی خـۆی لـە (المسـند) كـردووە، هـەر كەسـێ بیكاتـە بنچینەیەك بـۆ ڕاسـت و دروستی ئەوا پێچەوانەی وی كردووە و دەسبەرداری مەبەستەكەی بووە.

وتم: لەم سەردەمەدا ئەوە خەمباری کردووم کە زانایان بە هۆی کەمتەرخەمییان لە زانست وەکوو ڕەشەخەڵکەکەیان لێ هاتووە، ئەگەر فەرموودەیەکی هەڵبەستراویان بەرچاو بکەوێت دەڵێن: گێڕدراوەتەوە ! پێویستە بۆ هیممەتنزمییان بگرین.

## ٢٢٠- هەندێ کەس تەنها پێستیان بنیادەمە

پێم گەیشت کە هەندێ لە ڕێلادەرانی کۆن دەیگوت: ژیان جگە لە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووی نەفس – جا هەڵە بێت یان ڕاست – چیتر نییە!

لە دۆخی ئەمە ڕامام، دیتم نەفسمردووە، نە غیرەتێکی لەسەر ئابڕووی خۆی هەیە نە ترسی عەیبە! نموونەی ئەمە لە پێستی ئادەمیزاد نییە.

مرۆڤ ڕەنگە کاری کوشتن ئەنجام بدات نەوەك بوترێ: ترسنۆکە. باری قورس هەڵدەگرێ نەوەك بگوترێ کەمتەرخەمی کردووە. لە عەیبە دەترسێ و ئارام لەسەر هەموو دەردێکی هەژاری دەگرێ و ئەوە دەشارێتەوە تاوەکوو بە چاوێکی کەم نەبینرێ. تەنانەت نەزان ئەگەر پێی بوترێ ئەی نەزان! تووڕە دەبێ. وە ئەو دزانەی ئامادەی حەرامن ئەگەر یەکێکیان بەویتر بڵێ: قسە مەکە، خوشکەکەت ئەمە و ئەوە دەکات! غیرەت دەیگرێ و خوشکەکەی دەکوژێ. هەر کەسێك نەفسی هەبێت لە شوێنی تۆمەت ناوەستێت نەوەك گومانی پێ ببرێ.

بەڵام ئەوەی بێباکە لەوەی بە سەرخۆشی ببینرێ و خەمی نییە لەناو خەڵك دەنگ بداتەوە و ببێتە بنێشتەخۆشە و باسکردنی خەڵك بۆی بە خراپە ئازاری نادات ئەوا ئەوە لە ڕیزی ئاژەڵانە.

ئەمەی دەیەوێ نەفس بە دوای ئارەزووەکانی بکەوێت چێژ وەرناگرێ مەگەر لە ئازار و گوناه و سەرزەنشت نەترسێ و هیچ ئابڕوویەکی نەبێ ئاگاداری بێت، ئەمە ئاژەڵێکە لە پێستی مرۆڤدا.

وەگەرنا ئەمە چ ژیانێکە بۆ کەسێك کە مەی بخواتەوە و دوای ئەوە بگیرێت و لێی بدرێ و لەناو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە کە چی پێ کراوە؟! ئەوە چێژەکەی دێنێتەدی؟! نا، بەڵکوو چەندان هێندە زیاترە. ئەوە چ ژیانێکە بۆ ئەو کەسەی تەنبەڵ و تەوەزەل لێی پاڵداوەتەوە ئەگەر دیتی هاوتەمەنەکانی لە زانستدا هەڵکشاون و ئەویش نەزانە، یان بە بازرگانیکردن دەوڵەمەند بوون و ئەویش هەژارە؟! ئایا چێژ وەرگرتن لە تەنبەڵی و ئیسراحەت هیچ واتایەکی دەمێنێتەوە؟! ئەگەر زیناکەر بیر بکاتەوە لەو قسانەی لەبارەیەوە دەکرێن یان سزادانی بێنێتە بەرچاو دەستی هەڵدەگرت، بەڵام ئەو، چێژە بەردەستەکە وەکوو تیشکی بروسکەیەك دەبینێ..ئای ئەم کارە چەندە شووم و بەدە کە خەم و خەفەتێکی زۆری بەدواوەیە!

هەموو ئەمە لە دونیا، بەڵام لە ئاخیرەت ناخۆشی و ئازاری سزاکە بەردەوام و هەمیشەییە﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا﴿١٨﴾﴾ (الشورى: ١٨) واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لێی دەترسن.. واتە لە ئاگری دۆزەخ دەترسن.

داوا لە خودا دەکەین لە ئاکار و کارە ناشیرینەکان دوورمان بخاتەوە و بۆ ڕەوشت و کردەوە جوانەکانیش توانا و هیممەتمان پێ ببەخشێ، ئەو نزیکی وەڵامگۆیە.

## ٢٢١- وریای سەرەنجامی گوناهەکان بن

ڕەنگە سزاکان لەناکاو بێن و لەوانەشە لەسەرخۆیی و حیلمی(خودا) دوای بخەن. ژیر کەسێکە ئەگەر هەڵەیەکی کرد یەکسەر و بێ دواکەوتن تەوبە بکات.

چەندان کەسی دەسخەڕۆ و لەخۆبایی بە مۆڵەتدانی تاوانکاران، مۆڵەتی نەدرا!

لە هەموو ئەو تاوانانەی زووتر سزای بۆ دێت ئەوەیە کە لە چێژێکەوە بوو بێت کە عەقڵ و هۆش لە بیر بباتەوە، ئەم تاوانەش وەکوو ڕەقەکاری و ملەکردن و شەڕکردنە لەگەڵ خودا، ئەگەر لەوانە بێت کە پەڵپ و ڕەخنەگرتنە لە خودای خوڵقێنەر یان ململانێیە لە گەورەیی ئەو، ئەوا ئەوەیانە کە قەرەبوو ناکرێتەوە بەتایبەتی ئەگەر لە خواناسێك ڕووبدات ئەوا پشتگوێخستنی دەگمەنە.

(عەبدولمەجید کوڕی عەبدولعەزیز) وتوویە: لە خۆراسان پیاوێکمان لە کن بوو قورئانێکی بە سێ ڕۆژ نووسییەوە، پیاوێك تووشی بوو، وتی: لە ماوەی چەند ئەمەت نووسییەوە؟ ئامارەی بە سێ پەنجەی دەستی کرد و وتی: بە سێ ڕۆژ ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ (ق: ٣٨) هیچ پێوەشی ماندوو نەبووین! هەر سێ پەنجەکەی وشك بوو ئیتر نەیتوانی سوودیان لێ وەربگرێت.

هەندێ لە ڕەوانبێژان وای بە خەیاڵدا هات کە دەتوانێ وەکوو قورئان بڵێت! چووە ژوورێکەوە و وتی: سێ ڕۆژ مۆڵەتم بدەن! دوای سێ ڕۆژ چوون سەریان لێدا دەستی بە قەڵەمەکەوە وشك ببوو و مردبوو.

عەبدولمەجید وتوویەتی: پیاوێکم دیت لە کاتی بێنوێژی (سووڕی مانگانە) دەچووە لای ژنەکەی، پیاوەکە تووشی خوێنبەربوون بوو، کاتێ خوێنبەربوونەکەی زۆر بوو تەوبەی کرد و خوێنەکەی وەستا.

هاوشێوەی ئەمەش ئەوەیە مرۆڤ تانەی کردەوەیەك لە کەسێك بدات و گەورەترینیان ئەوەیە تانەی بە شتێك لێ بدەیت کە تێیدا نییە و بڵێ: ئەی کوێر! ئەی ناشیرین! ئیبن سیرین وتوویەتی: تانەی هەژاریم لە پیاوێکدا، لەسەر قەرزێك حەپس کرام.

ڕەنگە سزاکە دوابکەوێت و لە کۆتایی تەمەندا بێت، ئیتر بە هۆی ئەو تاوانانەی لە سەردەمی گەنجێتیدا کردووتە ئەوا لە پیریدا تووشی ناخۆشی و کێشەی زۆر دەبیت. بۆیە تکایە وریا و ئاگادار بن لە سەرەنجامی تاوان و گوناهەکان، زوو بە زوویی دەسپێشخەری بکەن بۆ سڕینەوەیان بە تەوبە و گەڕانەوە، چونکە کاریگەریی قێزەونیان هەیە، ئەگەر پەلەت کرد باشە وەگەرنا کۆدەبنەوە و سزا دێت.

## ٢٢٢- میانەڕەوی لە کۆکردنەوە و خەرجکردنی ماڵ

بزانە کە ئادەمیزاد بۆ کار و ئەرکێکی مەزن خولقێنراوە و داوای لێکراوە بە بەڵگەوە خودای خولقێنەری بناسێت و چاولێکەری بەس نییە، ئەوەش پێویستی بەوەیە هەوڵ و کۆشش بکات بۆ گەڕان و دۆزینەوەی ئەم بەڵگانە، هەروەها داوای لێکراوە فەڕزەکان جێبەجێ بکات و لە قەدەغەکراوەکان دوور بکەوێتەوە، ئەگەر هیممەتی بەرز بووەوە بۆ گەڕان و داوای زانست ئەوا پێویستی بە هەوڵ و کۆششی زیاترە.

بەختەوەرترین خەڵك ئەو کەسەیە کە نان و خۆراکێکی بەردەوامی بەپێی پێویست هەیە و قەناعەتی پێ دەکات، نەك لە منەت و سەدەقەی خەڵك.

بەڵام ئەگەر نانی پێویستی نەبوو ئەوا خەم و خەیاڵی کە دەیەوێ لەو شتانەدا کۆی بکاتەوە پەرتوبڵاو دەبێ و وای لێ دێ بۆ کۆکردنەوەی نان بەدوای فرتوفێڵدا دەگەڕێ، ئیتر تەمەن لە وەدەسهێنانی خۆراکی ئەو جەستەیە بەفیڕۆ دەچێت کە مەبەست لە مانەوەیدا لە دەست دەچێ و دەبێتە شتێکی تر، ڕەنگە ئاتاج بە کەسانی هیچ و پووچ بێت.

شاعیر وتوویە:

حَسبِي مِنَ الدهرِ ما كفاني ... يصونُ عِرضي عنِ الهَوانِ

مخافةَ أن يقولَ قوم فَضلُ فُلانٍ على فلانِ

لە ڕۆژگار ئەوەندەم هەبێ کە ئابڕووم لە ڕیسوایی بپارێزێ بەسمە، دەترسم خەڵکێك بڵێن فەزڵ و چاکەی فلان بەسەر فلانەوە.

پێویستە کەسی عاقڵ کە ئەگەر نان و خۆراکێکی پێدرا یان شتگەلێکی هەبوو ئەوا بیپارێزێت تاوەکوو خەم و خەیاڵی جەم بێت، نابێ لەوەدا دەسبڵاو بێت چونکە دواتر ئاتاج دەبێت و خەم و خەیاڵی پەرشوبڵاو دەبێت، نەفسیش ئەگەر خۆراك مسۆگەر بوو ئەوا دڵنیا دەبێ. ئەگەر ماڵ و سامانی نەبوو ئەوا بەپێی پێویست کار دەکات و زیادەڕەوی ناکات بۆ ئەوەی هاوسەنگیی بکات لە نێوان خەمی خۆراك و پێویستیدا. با بە کەم قەناعەت بکات، چونکە هەر کاتێ هەوڵ و هیممەتی بۆ زێدەماڵ بەرز بووەوە ئەوا ئەوەی لێی دەترسا لە پەرش و بڵاوی ڕوودەدات، چونکە پەرشوبڵاوی لە یەکەمدا بۆ نەبوونییە، ئەم پەرشوبڵاوییە بۆ سووربوون لەسەر زێدەماڵ دەبێ، ئیتر تەمەن بە ساردی دەڕوات:

ومَن يُنفقُ الايام في حفظِ مالهِ مخافةَ فَقرٍ فالذي فعلَ الفَقرُ

واتە: ئەوەی ڕۆژگاری تەمەنی لە پاراستنی ماڵەکەیدا لە ترسی هەژاری خەرج بکات ئەوا ئەوەی کردوویەتی خودی هەژارییە.

ئەی خاوەن هیممەت لە داواکردنی کار و ڕەوشتە باشەکان لەمە تێ بگە، چونکە تۆ گەر خۆراکی منداڵەکان دابین نەکەیت ئەوا دڵت پەرتوبڵاو دەکەن و سروشتی خۆشت منداڵە، خەم و خەیاڵت لە داوای هاوکاریکردنی خاڵیکە و قەدری شەڕەفی

ئەو ماڵ و سامانە بزانە کە جەمکردنی خەم و خەیاڵی پێویست کردوویت و ئابڕووی لە خەڵك پاراستوویت، نەکەیت بەخشندەیی هەڵتبنێ لەسەر زێدە خەرجی وەکوو ئەو هەژارەت لێ بێت کە دەست لەبەر خەڵك پان دەکاتەوە.

قەناعەت بەوەی پێویستە و وازهێنان لە چاوبڕین بۆ زیادە بنچینەی بنچینەکانە.

سەربەرزی و شکۆمەندی لە هەموو چێژێك بەتامتر و خۆشترە و، دەرچوون لە کۆت و بەندی منەت باشترە.

## ٢٢٣- دڵی دوژمنان بە خۆت خۆش مەکە

حەزی خۆ بە باشتر زانین لەسەر هاوڕەگەزان لە سروشتی مرۆڤدا چێنراوە، هیچ کەسێك نییە ئیللا حەز دەکات لە غەیر پلەی بەرزتر بێت.

ئەگەر شکستییەك ڕوویدا و بووە هۆی هاتنەخوارەوەی لە ئاستی ئەوانیتر ئەوا پێویستە بە شاردنەوەی ئەو شکستە ئازایەتی پیشان بدات بۆ ئەوەی بە چاوی کەم نەبینرێ و، با کەسی دەسپاك و داوێنپاك ئارام بگرێ تا بە چاوی بەزەییەوە بۆی نەڕوانرێ، با نەخۆش بەرگەی نەخۆشی بگرێ نەوەك لەشساغەکان دڵیان پێی خۆش بێت.

لە کاتی چوونیان بۆ مەککە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تووشی تا بوون، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ترسا دوژمنان دڵیان بەمە خۆش بێت کاتێ بینی هاوەڵان بە هۆی نەخۆشییەوە بێتاقەتن بۆیە پێی فەرموون: ((ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی ئازایەتی و ئارامگرتن لە خۆی نیشان دەدا)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە..ئیتر دوای ئەمە گورج و گۆڵ و چالاك بوونەوە.

هۆکارەکە نەماوە بەڵام حوکمەکەی ماوە بۆ ئەوەی هۆکارەکە بیربکەوێتەوە و واتاکەی تێ بگەن.

خەڵکێك ئیزنیان خواست لەسەرەمەرگدا سەردانی مەعاوییە بکەن، بە خێزانی وت: دامنیشێنن! بەدامەزراوییەوە دانیشت و وای پیشاندا کە لەشساغ و سەلامەتە، کاتێ سەردانکاران ڕۆیشتن وتی:

وتجلدي للشامتين أريهم ... أني لريب الدهر لا أتضعضع

وإذا المنية أنشبت أظفارها ... ألفيت كل تميمة لا تنفع

ئەگەر کارەساتێکت بەسەرهات ئازایەتی و ئارامگرتن نیشانی دوژمنانت بدە کە بەم کارەساتەت دڵخۆشن و بە زمانی حاڵ پێیان بڵێ کە من بۆ بەڵا و ناسۆرییەکان سەرکز ناکەم. ئەگەر مردنیش چرنووکەکانی دەرخست ئەوا هیچ نووشتەیەك سوودی نییە.

(دێڕی یەکەم هی شاعیر (أبو ذؤيب الهذلي)یە کە شاعیرێکی سەردەمی جاهیلی بووە).

کەسە ژیرەکان هەمیشە لە کاتی موسیبەت و هەژار و بەڵادا ئازایی و ئارامی دەردەخەن نەوەك لەگەڵ موسیبەتەکانیش دڵخۆشبوونی دوژمنانیشیان بکەوێتە ئەستۆ، ئەوەش لە هەموو بەڵایەك سەختتر و ناخۆشترە. بۆیە هەژاریان وەکوو دەوڵەمەند خۆی نیشان دەدا و نەخۆشیان وای دەردەخست ساغ و سەلامەتە.

بەڵێ، پاشان خاڵێك هەیە دەبێ لێی تێ بگەین: ڕەنگە مرۆڤ زۆری ماڵ و هەڵڕژانی نیعمەتەکانی دەرخست و نیشان دا و دوژمنەکەی چاوی پیسی لێ دا، ئیتر ئەوەی پێوەی دەنازی پێچەوانە بوویەوە!

چاوەزار تەنها تووشی شتە جوان و بەرچاوەکان دەبێ، بۆ تووشبوون بە چاوەزاریش تەنها جوانی و بەرچاوی بەس نییە تەنها مەگەر لە چاوی حەسوودەوە بێت، حەسوودەکەش دەبێ خاوەن سروشتێکی خراپ بێت، ئەگەر ئەم سیفەتانە کۆبوویەوە ئەوا مەترسی چاوپیسی و تووشبوون بە چاوەزار هەیە.

با مرۆڤ بە ئەندازەی ئەوەی لە چاوەزار دڵنیایە و دەزانێ سەلامەتە جوانی و خاسیی خۆی دەربخات و لە زیادەڕەویکردن لە دەرخستنی نیعمەتەکان وریا بێت، چونکە لێرەدا چاوەزار مەترسی هەیە.

حەزرەتی یەعقووب (سەلامی خوای لێ بێت) بە کوڕەکانی گوت: ﴿لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ﴾ (یوسف: ٦٧) واتە: هەمووتان لە یەك دەرگاوە مەچوونە ناو شارەوە، لە چەند دەرگایەکی جیاوازەوە بڕۆنە ناو شارەوە... لە چاوی پیس لێیان ترسا.

ئیتر لەم بەشە تێ بگەن، سوودی بۆ ئەوانە هەیە کە ڕامان و وردبوونەوەیان هەیە.

## ٢٢٤- ئاست و پلەکانی خەڵك

بۆ ئەوە خوڵقاوین تا لەگەڵ خودای خوڵقێنەر بژین و بیناسین و لە بەهەشتی نەبڕاوەدا قسەی لەگەڵ بکەین و ببینین.

بۆیە بوونمان لە دونیا دەستی پێ کراوە چونکە وەکوو فێرگە و مەکتەب وایە، تێیدا فێری نووسین و ڕەوشت دەبین بۆ ئەوەی منداڵ کە دەگاتە پلەوپایە شیاو و شایستە بێت.

منداڵ هەیە کۆڵەوارە، لە فێرگە زۆر دەمێنێتەوە بەڵام کە دەردەچێ هیچ تێ نەگەیشتووە. ئەمە نموونەی ئەو کەسەیە مەبەستی بوونی خۆی نازانێ و ئامانج لە بوونی وەدەست نەهێناوە.

منداڵ هەیە لەگەڵ ئەوەی کۆڵەوارە و تێگەیشتنی کەمە و هیچ فێر نەبووە کەچی ئازاری منداڵەکانی تریش دەدات و خواردنەکانیان دەدزێت و لە دەستی دادوبێدادیانە، نە باش بووە و نە لە هیچ تێ گەیشتووە و وازیشی لە بەدکاری نەهێناوە. ئەمەش وەکوو ئەهلی خراپە و بەدکار و ئازاردەرانە.

هەندێ منداڵ هەیە شتێك لە نووسین فێردەبێت بەڵام هێشتا لاوازە و نووسینی خراپە، لە فێرگە دەردەچێت و شتێکی کەم فێربووە. ئەمەش وەکوو ئەو کەسەیە هەندێ شت تێ گەیشتووە و فەزیلەتە تێروتەواوەکانی لە دەست چووە.

هەیانە نووسینی باشە بەڵام حیساب فێرنەبووە، ئادابەکانی باش لەبەر کردووە بەڵام لە ئەدەبی نەفسدا کەموکورتە، ئەمە بە هۆی ئەو خراپییەی لە ناخیدایە لە چاوچنۆکی و کەم ئەدەبی بۆ ئەوە شیاوە بە سەرچڵی ببێتە نووسەری سوڵتان.

هەیانە هیممەتی بۆ بەرزایی کامڵ و تەواو بەرز بۆتەوە، ئەو لە فێرگە پێشەوای منداڵانە و جێگری مامۆستاکەیانە، پاشان بە نەفسبەرزی و ئەدەبی ناوەوە و کەماڵی ئادابی ڕواڵەت لەوان زیاتر هەڵدەکشێ، بەردەوام هاندەرێك لە ناوەوە هانی دەدات زووتر فێربێت و هەموو فەزیلەتێك بەدەست بێنێ چونکە دەزانێ فێرگە لە خودی خۆیدا مەبەست نییە بەڵکوو بۆ وەرگرتنی ئەدەب و چوونە بەرەو حاڵەتی پیاوەتی و ڕەفتارکردن، لەگەڵ زەمان پێشبڕکێ دەکات بۆ وەدەسهێنانی هەموو چاکە و فەزیلەتێك. ئەمە وەکوو ئیمانداری کامل و تەواوە، ئەو لە ڕۆژی ئەزموونەکان پێش هاوەڵەکانی دەداتەوە و تابلۆی کارەکەی کە بەجوانی نووسیویەتییەوە پیشان دەدات و بە زمانی حاڵ دەڵێ: ﴿هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ۝١٩﴾ (الحاقة: ١٩) واتە: هانێ کتێبەکەم بخوێننەوە.

ئیتر دونیا و خەڵکەکەشی وەهان: خەڵك هەیە دوور لە هەق و لەناوچووە ئەوانەش بێباوەڕانن. هەیە هەڵەکارە لەگەڵ کەمێك لە ئیمان ئەوە سزادراوە و چارەنووسی بۆ خێرە. هەیانە ساغ و سەلیمە بەڵام کەمتەرخەمە. هەیانە بەراورد بە خوار خۆی تێروتەواوە بەڵام بەراورد بە سەرووی خۆی ناتەواوە.

ئەی تێگەیشتووان پەلە بکەن پەلە، دونیا ڕاڕەو و پردێکە بەرەو خانەی مانەوە و، سەفەرێکە بۆ شوێنی نیشتەجێبوون و نزیکی و دراوسێیەتی خودای دەسەڵاتدار، خۆتان بۆ هاونشینی و قسەکردن ئامادەکەن و لە بەکارهێنانی ئەدەب زیادەڕەوی بکەن بۆ ئەوەی شیاوی نزیکایەتی لە خودای گەورە بن..تەنبەڵی، لە ئامادەکردنی ئەسپ بێئاگاتان نەکات و با بیرهاتنەوەی ڕۆژی پێشبڕکێ هانتان بدات بۆ کۆشش و جیددییەت، نزیکیی ئیمانداران لە خودا بە ئەندازەی وریاییانە لە دونیا و شوێن و جێگەشیان لە ئاخیرەت بەپێی قەدر و ڕێزیانە، شوێنی نەفتەوان وەکوو شوێنی دەرکەوان نییە، شوێنی دەرکەوانیش وەکوو شوێنی وەزیر نییە!

دوو باخ پەرداخەکان و ئەوەی تێیدایە لە زێڕە و دوو باخی تر پەرداخەکان و ئەوەی تێیدایە لە زیون، وە فیردەوسی باڵا بۆ ئەوانیتر، ئەوانەشی لە خاکی بەهەشتدان سەیری ئەهلی پلە باڵاکان دەکەن هەروەك ئەستێرەیەکی پڕشنگدار دەبینن.

با کۆششکار شیرنایی تەسلیمکردن بۆ ئەمانەتپارێزی بیربێتەوە و با چێژی ستایشکردنی لە ڕۆژی پێشبڕکێ بیرکەوێتەوە و...با پێشبڕکێکار وریای کەمتەرخەمییەك بێت کە ناکرێ تێی بهێنرێتەوە و لە نەنگییەك بترسێ کە یادی ناشیرینی هەر دەمێنێتەوە...ئەم دۆزەخییانە کە ئازادکراوی خودان، شوێنکەوتنی ئارەزووەکان سووك و ڕیسوای کردوون، پاشان چاکبوونەوەیان گەیشتێ و دوای ماوەیەك ڕزگاریان بوو(باسی ئەو کەسانەیە کە هیچ کردەوەیەکی باشیان نەبووە و ماوەیەك لە دۆزەخ دەمێننەوە، دواتر بە هۆی تکای پێغەمبەران و پیاوچاکان خودا لێیان خۆش دەبێ و لە ئاگر دەریان دەهێنێ و دەیانخاتە ناو بەهەشتەوە).

با پەند وەربگرێ و ئارام لەسەر شتە خۆشەکان بگرێ، ڕۆژەکان کەمن. هەزارانی ئیمانداران پێنج سەت ساڵ بەر لە دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشتەوە.

ئیتر کاتی هەوڵ و کۆشش و جیددییەت و هەنگاونانە، نیشانەکە دەرکەوت بەتایبەتی بۆ کەسێك کە سنوور و نیشانەکانی بۆ دەرکەوتبێت: یان بەو زانستەی ڕێگا پیشان دەدات، یان بەو مووسپیبوونەی نیشانەی کۆچکردنە، ئەوەی کە ئەهلی کۆشش هیوای پێ دەخوازن.

جونەید لە کاتی گیان دەرچوونیدا قورئانی دەخوێند، پێی وترا: لەم کاتەدا؟! وتی: پەلە لە پێچانەوەی پەڕاوەکەم دەکەم.

دوای ئەمە، ویستراو یارمەتیدراوە و داواکراو هاوکاریکراوە، ئەگەر خودا تۆی بۆ کارێك ویست، بۆ ئەو کارە ئامادەت دەکات.

## ٢٢٥- گەورەیی هیمەتبەرزی

سەرنجی حاڵەتێکی سەیرم دا کە بریتییە لەوەی ئەهلی بەهەشت بەراورد بەوانەی سەروویانەوە لە کەموکورتییەکی گەورەدان و فەزڵی ئەوانیش دەزانن، ئەگەر بیریان کردباوە لەوەی لە دەستیان چووە ئەوا خەم و پەژارە ڕووی دەدا بەڵام ئەوە نابێت چونکە ئەوەیان بۆ ڕوونادات لەبەر خۆشیی شوێنیان و، لە بەهەشتیش خەم نییە و هەموو کەس لە دوو ڕووەوە ڕازییە بەوەی پێی دراوە:

یەکەم: پێی وا نییە خۆشییەك هەیە لە سەرووی ئەوەی ئەو تێیدایە ئەگەر پلەوپایەی غەیری ویش بەرزتر بێت.

دووەم: ئەم شوێنەی لە کن خۆشەویست دەبێ وەکوو چۆن ئەگەر منداڵێکی ناتەواوی هەبێ هەر خۆشیدەوێ و لە منداڵی جوانی خەڵکیشی خۆشتر دەوێ.

وەلێ لەژێر ئەمەدا واتایەکی ناسك هەیە ئەویش ئەوەیە کە خەڵك هەیە لە دونیادا هیمەتێکی کەموکورتیان لە خواستنی چاکە و فەزیلەدا هەیە و کەموکورتییەکەش جیاوازە: هەیانە هەندێك قورئان لەبەر دەکات و پەرۆشی تەواوکردنی نییە، هەیە گوێ لە کەمێك فەرموودە دەگرێ، هەیە کەمێك لە فیقه دەزانێ، هەیە لە هەموو

شتێك بە كەمێك ڕازییە، هەیە تەنها فەرزەكان دەكات و هەیە بە دوو ڕەكات شەونوێژ قەناعەت دەكات...

ئەگەر هیممەتیان بەرز بووایە ئەوا لە وەدەسهێنانی كردەوە و فەزیلەتەكان كۆششیان دەكرد و لە كەموكورتی دوور دەكەوتنەوە و جەستەیان بەكاردێنا هەروەك شاعیر وتوویە:

و لكلِّ جسمٍ في النحولِ بليةٌ          و بلاءُ جسمي من تفاوتِ همتي

لاوازیی هەموو جەستەیەك بە هۆی بەڵا و نەخۆشییەكەوەیە، بەڵای جەستەی من بە هۆی هەوڵ و هیممەتی جیاواز و جۆراوجۆرە.

مرۆڤ بەم هیممەتەوە حەشر دەكرێ، بە ئەندازەی ئەوەی لە دونیا وەدەستی هێناوە پێی دەبەخشرێ، هەروەك شەوقی بۆ كەماڵ نەبووە و بە كەم و نزم ڕازی بووە ئەوا لە ئاخیرەتیش بە وێنەی ئەوە قایلە.

پاشان خەڵك بە ئاوەزیان بیردەكەنەوە، دەزانن كە پاداشت بە ئەندازەی كار و كردەوەیە، ئەوەی دوو ڕەكات نوێژی كردووە چاوی لە پاداشتی ئەو كەسە نییە كە هەزار ڕەكاتی كردووە.

ئەگەر یەكێك وتی: چۆن بۆی وێنا دەكرێ كە حەز ناكات ئەوە بەدەست بێنێ كە باشتر لەو وەدەستی هێناوە؟!

وتم: ئەگەر وێنای بەدەسهێنانی نەکات ئیتر چۆن وێنای خەمخواردنی لەدەستدانی دەکریٚ؟! ئایا ڕەشۆکییەکت دیوە وەها خەم لە لەدەسچوونی فیقھ بخوات کە نیگەرانی بکات؟! زۆر دوورە! ئەگەر ئەو خەمەی هەبووایە ئەوا بۆ مەشغوولبوون بە فیقھ دەیبزواند! هیچ هیممەتێکی وایان نییە کە ببێتە مایەی خەمخواردن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان ڕازی بوون بەوەی تێیدان.

تیٚ بگە لەوەی وتم و دەست بە کار بە، ئەمە گۆڕەپانی پێشبڕکێیە.

## ٢٢٦- مانەوەی جوولەکە و مەسیحی لەناوماندا

بیرم کردەوە لە مانەوەی جوولەکە و مەسیحی لەنێوماندا..واتایەکی سەیرم بۆ دەرکەوت ئەویش ئەوەیە کە بوون و پەرستش و پاراستنی شەرعی پێغەمبەرەکەیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر و شەریعەت هەبووە و پێغەمبەری ئێمە (صلی الله علیه وسلم) شتێکی نوێ و تازەبابەت نییە لە پێغەمبەران، تەنانەت جنۆکەش دانیان بە بوونی خودا و ناردنی پێغەمبەران ناوە، ئیتر ڕوون بوویەوە کە ئێمە شتێکمان دانەهێناوە کە نەبووبێت. وە مانەوەیان ڕێزگرتنە لەو شتانەی لە دیندا ڕاستن.

## ٢٢٧- ئامۆژگارى بۆ زانستخوازان

به بەڵگە فەزڵ و ڕێزداریی زانست سەلماوە، بەڵام زانستخوازان لێك جیا بوونەتەوە و، هەریەکەیان نەفسیان بۆ شتێك بانگیان دەكات:

هەیە تەمەنی خۆی لە خوێندنەوەکانی قورئان (القراءات) بەسەربردووە، ئەوەش بەفیڕۆدانی تەمەنە چونکە پێویستە لە خوێندنەوەکان پشت بە بەناوبانگ(المشهور) ببەستێ نەك ڕیزپەڕ (الشاذ)، بۆ قورئانخوێن چەند ناشیرینە لەبارەی مەسەلەیەکی فیقهییەوە پرسیاری لێ بکرێ و نەزانێ! دیارە ئەمەش بە هۆی سەرقاڵبوونیەتی بە گەڕان بە دوای ڕێگاکانی گێڕانەوەکانی خوێندنەوەکان!!

هەیە تەنها بە (نەحو) و بەڵگەکانی مژوول دەبێ!

هەیە تەنها بە زمان سەرقاڵ دەبێ!

هەیە فەرموودە دەنووسێ و زۆریش دەنووسێ بەڵام لە تێگەیشتنی ئەوەی نووسیویەتی ورد نابێتەوە!

هەنـدێ لـە مامۆسـتاكانی فـەرموودەمان بینی(ئەوانـەی فـەرموودە دەگێڕنـەوە) لەبارەی مەسەلەیەكی پەیوەست بە نوێژ پرسیاریان لێ دەكرا نەیدەزانی چی بڵێت! قورئانخوێن و ئەهلی زمان و نەحوش بە هەمان شێوە!

(ئیبن ئەلمەنصوری) دەڵێ: لە دانیشتنێكی (ئەبی محەمەد كوڕی ئەلخەشاب) – كە لە نەحو و زمان پێشەوای خەڵك بوو– ئامادەبووم، باسی فیقه كرا، وتی: چیتان دەوێ لێم بپرسن! پیاوێك وتی: ئەگەر پێمان وترا بەرزكردنەوەی هەردوو دەست لە نوێژدا چییە، چی بڵێین؟ وتی: ڕوكنە! خەڵكەكە لە كەمیی فیقه و تێگەیشتنی سەراسیمە بوون!!

پێویستە زانستخواز لە هەر زانستێك شتێك وەربگرێت پاشان بایەخ بە فیقه بدات، پاشان لە مەبەست و ئامانجی زانستەكان وردبێتەوە كە بریتییە لە مامەڵەكردن لەگەڵ خودا و ناسین و خۆشویستنی.

ئەو كەسە چەند گەمژەیە كە تەمەنی خۆی لە زانینی ئەستێرەناسیدا بەفیڕۆ دەدات! بەڵكوو پێویستە كەمێك لەوە و لەبارەی خولگەكان بۆ زانینی كاتەكان شتێك بزانێ، بەڵام وردبوونەوەی لەوەی بانگەشەی بۆ دەكات گوایە بڕیار و حوكمدانە ئەوا نەزانییەكی پەتییە چونكە هیچ ڕێگایەك بۆ زانینی ڕاستەقینەی ئەوە نییە، تاقیكراوەتەوە و نەزانیی بانگەشەكارانی دەركەوتووە، ڕەنگە جاروبار و هەندێ كات شتێك ڕاست دەرچێت بەڵام ئەمەش هیچ سوودی نییە جگە لە خەمخواردنی زووتر! ئەگەر یەكێك وتی: دەكرێ بە هۆی زانینی ڕووداوەكەوە خۆت

بپارێزی و ڕووداوەکە لە خۆت دوورخەیتەوە! کەواتە ئەوەش واتای ئەوەیە پێشبینییەکە حەقیقەتی نەبووە و تەنها ڕەمڵ لێدانێکە و هیچی تر.

پێویستە زانستخواز نیاز و مەبەستی ڕاست بکاتەوە چونکە نەبوونی دڵسۆزی ڕێگرە لە قەبووڵبوونی کار و کردەوەکان! با لە هاونشینی زانایان و وردبوونەوە لە قسە و ڕاوبۆچوونە جیاوازەکان و دەستخستنی کتێبان کۆشش بکات، هیچ کتێبێك لە سوود خاڵی نییە! با هەوڵ و هیممەتی بۆ لەبەرکردن بێت و تەنها ئەو کاتەی لە لەبەرکردن ماندوو دەبێ وردبێتەوە و بنووسێ! با وریای هاوڕێیەتیکردنی دەسەڵاتدار بێت و! سەیری ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان و تابیعین بکات و وردبێتەوە و! لە مەشق و ڕاهێنانی نەفسی کۆشش بکات و کار بە زانستەکەی بکات!

هەر کەسێك خودای هەق پشتی بگرێ ئەوا یارمەتی دەدا و سەرکەوتووی دەکات.

## ٢٢٨- خۆبەلزانی، ڕێگرە لە هەقناسین

زۆر سەیرم هات لەو خەڵكانەی فیزودەمار و خۆبەلزانییەكی لە سنووربەدەریان هەیە! بەتایبەتی ئەو عەرەبانەی لە وشەیەك تەرە دەبن و شەڕ دەكەن و بە كوشتن ڕازی دەبن! تەنانەت خەڵكێك لەوان گەیشتنە سەردەمی ئیسلام و وتیان: چۆن بچەمێینەوە و كڕنووش ببەین و سمتمان بەرزبێتەوە؟! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((خێر لە ئایینێكدا نییە كە چەمانەوە و كڕنووشی تێدا نەبێ)) لاوازە و ئەحمەد و ئەبوو داوود گێڕایتیانەوە.

لەپاڵ ئەم فیزودەمارەش سەركز دەكەن بۆ شتێك كە خۆیان لەو باشترن، ئەمە بەردێك دەپەرستێ! ئەمەش دارێك دەپەرستێ! خەڵكێك هەبوون ئەسپ و مانگایان دەپەرست!

ئەمانە لە ئیبلیس سووك و نزمترن، ئیبلیس – بە هۆی بانگەشەی كەماڵەوە – ڕازی نەبوو كڕنووش بۆ ناتەواوێك ببات و وتی: ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ﴾ (ص: ٧٦) واتە: من لەو باشترم.

تەنانەت ئەوان لە فیرعەونیش نزمترن چونكە ئەو ڕازی نەبوو هیچ شتێك بپەرستێ.

زەلیلی و سەرکزیی ئەم بەخۆنازە خۆبەگەورزانە تڕزلانە بۆ بەرد یان دارێك مایەی سەرسوڕمانە! بەڵکوو پێویستە ناتەواو سەرکز بکات بۆ تێروتەواوەکان!!

خوای گەورە لەم ئایەتەدا لە کاتی زەمکردنی بتەکان ئاماژە بۆ ئەمە دەکات: ﴿أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (الأعراف: ١٩٥) واتە: ئایا بتەکانتان قاچی ڕۆیشتن یان دەستی وەشاندن یان چاوی بینین یان گوێی بیستنیان هەیە؟!

واتە: ئێوە ئەم ئامرازە دەرکپێکەرانەتان هەیە و ئەوانیش نیتیان، ئیتر چۆن تەواو، ناتەواو دەپەرستێ؟!

بەڵام هەوا و ئارەزووی خەڵك لە شوێنکەوتنی پێشینان و جوان و شیرین بینینی ئەو شتانەی بە ڕاوبۆچوونی خۆیان دایانهێناوە هۆش و ئاوەزیانی داپۆشیوە، ئیتر لە ڕاستیی شتەکان ناڕوانن و وردنابنەوە!

پاشان ئێرەیی و حەسوودی زاڵ بوو بەسەر خەڵکانێك و هەقیان ناسی کەچی پشتیان تێ کرد.

(ئومەییەی کوڕی ئەبی صەلت) دانی بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەنا و دەچوو باوەڕی پێ بێنێ، پاشان دەگەڕایەوە و دەیگوت: باوەڕ بە پێغەمبەرێك ناهێنم کە لە هۆزی (ثقیف) نەبێ!

ئەبوو جەهل دەیوت: سوێند بە خوا، موحەممەد هەرگیز درۆی نەکردووە بەڵام ئەگەر خزمەتکاری و دەرکەوانیی کەعبە (السدانة و الحجابة) لە (بەنی هاشم) بێت پاشان پێغەمبەرایەتییش هەر لەوان بێت، ئەی چی بۆ ئێمە مایەوە؟!

ئەبوو تاڵیب پەرجووەکان(معجزات)ی پێغەمبەری دەبینی و دەیوت: بەدڵنیاییەوە دەزانم تۆ لەسەر هەقیت، نەوەك ژنانی قورەیش تانە و تەشەرم لێدەن دەنا دڵخۆشم دەکردی(بە موسڵمان بوونم).

پەنا بە خوا دەگرین لە تاریکاییی ئێرەیی و نزماییی خۆبەزلزانی و گەمژایەتیی ئارەزوو کە ڕووناکیی ئاوەز داپۆشێت و داوای ئیلهامی ڕێی ڕاست و کارکردن بەپێی هەقی لێ دەکەین.

## ٢٢٩- لەبارەی حاڵوباری پیاوچاکانەوە

لەبارەی کۆمەڵێك لە پیاوچاکان گوێبیست بووین کە لە ڕێی سەلامەت و خۆشەویستی و نیانییەوە مامەڵەی خودایان کرد، خوداش بەو شێوەیە مامەڵەی کردن چونکە ئەوان سروشتیان بەرگەی غەیری ئەوە ناگرێت.

لە سەردەمی زوو، پیاوچاکێك هەبوو بە ناوی (بەرخی خواپەرست)، چووە دەرێ و داوای بارانبارینی لە خودا کرد و بە لاڵانەوەوە وتی: ئەمە چییە کە لەبارەی تۆوە نەمانزانیوە؟! هەر ئێستا بارانمان بۆ ببارێنە و ئاودێرمان بکە! ئیتر باران باری.

لە هاوەڵانیش ئەنەسی کوڕی نەزر دەیگوت: سوێند بە خودا ددانی (ئەلڕوبەیع) ناشکێنرێ. چۆنی وتبوو ئەوها ڕوویدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((لە بەندەکانی خودا کەسانێك هەن ئەگەر سوێند لەسەر خودا بخۆن خودا سوێندەکەیان بەجێ دێنێ.))

ئەمانە خەڵکێکن بینین و تێبینیکردنی لوتف و نەرمونیانی بەسەریاندا زاڵ بووە و لوتفیان بەرانبەر کراوە و ئەوەیان بۆ گوزەراوە کە باوەڕیان پێ بووە.

لێرەدا لەوان بەرزتریش هەیە: داوا دەکەن بەڵام وەڵامیان نادرێتەوە و بە لێگرتنەوەش ڕازین، هیچ یەکێکیشیان هەست بە دڵگرانەوە ناکات بەڵکوو ترس

كۆتوبەندی كردوون وسڵەمینەوە سەری نزم كردوون و وا نابینن زمانیان ئەهلی كرانەوە بێت، ئەوپەڕیی ئاواتیان لێخۆشبوونە، ئەگەر یەكێكیان داوایەكی كرد و هیچ وەڵامێكی نەبینی ئەوا نەفسی خۆی سەركۆنە دەكات و دەڵێ: كەسی وەكوو تۆ وەڵام نادرێتەوە! ڕەنگە بڵێ: لەوانەیە سوود و بەرژەوەند لە قەدەغەكردن و وەڵامنەدانەوەمدا بێت. بەڕاستی ئەمانە پیاون.

بەڵام ئەو گەمژەیەی پێی وایە هەقی خۆیەتی وەڵام بدرێتەوە، ئەگەر وەڵام نەدرایەوە ئەوا لە ناخەوە وەڕەس دەبێ وەكوو ئەوەی داوای كرێی كارەكەی بكات و وەك ئەوەی بە پەرستشەكەی سوودی بە خودا گەیاندبێت!

بەندەی ڕاستەقینە ئەو كەسەیە كە بە كاری خودا ڕازی بێت، ئەگەر داوای كرد و وەڵام درایەوە ئەوا ئەوە بە فەزڵ و بەخشش دەبینێ، ئەگەریش وەڵام نەدرایەوە ئەوا پێی وایە خودا مافی خۆیەتی چی بیەوێت لە موڵكی خۆیدا بیكات و بە هیچ جۆرێك ڕەخنە و ناڕەزاییەك بە دڵیدا نایەت.

## ٢٣٠- زانستی سوودبەخش

کۆمەڵێك لە زانایانم دیت زۆر ڕوخسەتیان بەکاردێنا و شلڕەوییان دەکرد و پێیان وابوو زانست بەرگرییان لێ دەکات و! نازانن کە زانست نەیاریانە و! خودا بەر لەوەی لە گوناهێکی زانا خۆشبێت لە حەفتا گوناهی نەزان خۆش دەبێت، ئەوەش لەبەرئەوەی نەزان دژایەتی خودای هەقی نەکردووە و زاناش لەگەڵی بەئەدەب نەبووە.

هەندێ خەڵکم دیت دەیوت: من داسەکەم خستۆتە نێو دروێنەکارانەوە و نووستووم! پاشان فراوانکاری و شلڕەوی لە شتگەلێکدا دەکرد کە ڕێپێدراو نین!!

بیرم کردەوە ئەو زانستەی — کە بریتییە لە زانینی ڕاستییەکان و وردبوونەوە لە ژیاننامەی پێشینان و خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشت و ئاکاری ئەوان و ناسینی هەق و ئەوەی بۆی پێویستە — لە کن ئەو خەڵکانە نییە، بەڵکوو وێنە و شێوەی واژەکانیان لە لایە کە بەهۆیەوە حەڵاڵ و حەرام دەزانن، ئەوەش زانستی سوودبەخش نییە، بەڵکوو زانست تێگەیشتنی بنچینەکان (أصول) و ناسینی خودا و گەورەیی خودا و ئەوەی شیاوێتی و وردبوونەوە لە ژیاننامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی و خۆڕازاندنەوە بە ئاکار و ڕەوشتیان و تێگەیشتنی ئەو

شتانەیە کە لەوان گوازراوەتەوە، ئەوە زانستی سوودبەخشە کە وا لە گەورەترین زانا دەکات خۆی لە کن نەفسی لە نەزانترین نەزان پێ کەمتر بێت!

هەندێ کەسم بینیوە کە ماوەیەك خواپەرستی کردووە پاشان ساردبۆتەوە وتوویە: پەرستش و بەندایەتییەکی وەهای خودام کردووە کە هیچ کەسێك وەها نەیپەرستووە!! ئێستاش تاقەتم نەماوە. وتم: چەند دەترسم ئەم وتەیەی هۆکارێك بێت بۆ ڕەتکردنەوەی هەموو کارەکانی! چونکە پێی وایە ئەو لەگەڵ خودای هەق شتێکی کردووە، بەڵکوو لەبەر خاتری نەفسی خۆی داوای ڕزگاربوونی کردووە و پلەوپایەی بەهەشتی خواستووە، نموونەی ئەو وەکوو ئەو کەسەیە سواڵ لە خەڵك دەکات، نابێ منەت بکات بەسەر ئەو کەسەوە کە شتێکی پێ دەدات.

هۆکاری ئەم کرانەوە و شلڕەوییە نەزانینی ڕاستییەکانە. ئەو لەکوێی گەورە زانایانی مامەڵەیە؟! ئەوانەی کەسانی وەکوو (صیلەی کوڕی ئەشیەم) یان تێدایە کە ئەگەر ئاژەڵی درندە بیاندیبایە لێی هەڵدەهاتن، کە شەو تەواو دەبوو لە کاتی نوێژدا دەیگوت: پەروەرێنم! لە ئاگر پەنام بدە، ئایا کەسی وەکوو من داوای بەهەشت دەکات؟!

هەروەها ئیمامی عومەر دەیوت: حەزم دەکرد سەروبەر دەرچوومایە، نە هیچم بۆ هەبووایە و نە هیچم لەسەر بووایە!

هەروەها سوفیانی سەوری لە کاتی مردنیدا بە حەمادی کوڕی سەلەمەی گوت: ئومێد هەیە کە کەسی وەکوو من لە ئاگر ڕزگاری بێت؟!

ئیمامی ئەحمەدیش لە سەرەمەرگدا وتوویەتی: نا، هێشتا. لێیان پرسیوە لەبارەی ئەم قسەیەوە؟ وتوویەتی: ئیبلیس لە کن پێڵاوەکانم وەستاوە و پەنجەکانی دەگەزێ و دەڵێ: ئەحمەد لە دەستم دەرچوویت! منیش دەڵێم: هێشتا نا.

ئەز سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە ڕزگارم بووە لە نەزانیی ئەوانەی خۆیان بە ئەهلی زانست دەزانن لەوانەی کە زەمم کردن، وە ئەوانەی خۆیان بە زاهید دەزانن کە ڕەخنەم لێ گرتوون، من لە گەورەییی خودا و ژیاننامەی گەورەپیاوان زانیومە چ شتێك زمانی کرانەوە و شلڕەوی لاڵ دەکات و سەیرکردنی هەر کردەوەیەك دەسڕێتەوە.

چۆن تەماشای کردەوە باشەکەم دەکەم کە ئەو پێی بەخشیوم و ئاگاداری شتگەلێکی کردووم کە لە غەیری شاردۆتەوە؟! ئایا ئەوە بە هۆی منەوە هاتۆتەدی یان بە لوتفی ئەو؟ وە چۆن سوپاسی ئەوە بکەم کە یارمەتی سوپاسگوزاری داوم؟!

پاشان چ زانایەك ئەگەر لە کار و ژیانی زانایانی کۆن بکۆڵێتەوە خۆی کەم نایەتە بەرچاو؟! ئەمە لەبارەی شێوەی زانستەوە، واز لە واتاکەی بێنە. چ خواپەرستێك لەبارەی خواپەرستانەوە دەبیستێ و لە شێوەی خواپەرستیدا ناڕوات؟! واز لە واتاکە بێنە.

داوای زانین و ناسینێك لە خودا دەکەین کە قەدری خۆمانی پێ بزانین تا چیتر سەرسام نەبین بە کارێکی سووك و کەم کە هیچ شوێنەوارێکی لە دڵماندا نییە و

ئارەزووی ناسینی گەورەییەکی دەکەین کە زمان لاڵ بکات لەوەی بەشانازییەوە بدوێ، وە لە فەزڵ و بەخششی، ئومێدی فەزڵێکی دەکەین کە بە هۆیەوە تێبینی ئافەتی ئەو کردەوانە بکەین کە شانازییان پێوە دەکەین تا ئەوەی تێبینیکردنی کەموکورتییەکانی، شەرمەزاری لە بوونی لێ بکەوێتەوە، خودا نزیکی وەڵامدەرەوەیە.

## ٢٣١- ژیانی خۆش پەیوەستە بە ئارامگرتن و ڕازیبوون

هۆکاری ناخۆشیی ژیان لە دەسچوونی پشك و چانسەکانی دونیایە. لە دونیادا خۆشگوزەرانیی بەردەوام بۆ هیچ کەسێك نییە جگە لەو خواناسەی کە ڕەزامەندیی خۆشەویستەکەی و ئامادەکردنی توێشوو بۆ کۆچکردن بۆ لای وی سەرقاڵی کردووە، ئەو ئەگەر حەسانەوە و پشوویەکی لە دونیا هەبێ ئەوا بۆ ئاخیرەتخوازی سوودی لێ وەردەگرێت، ئەگەر ناخۆشییەکی تووش هات ئەو ئارامگرتن لەسەری بۆ پاداشتی ئاخیرەت دەقۆزێتەوە، ئەو بە هەموو ئەو ڕووداوانەی دێنە ڕێی ڕازییە، ئەوە بە بڕیاری خودا دەزانێ و دەزانێ ئەوە ویستی ئەوە، هەروەك شاعیر دەڵێ:

إن كان رضاكم في سهري    فسلامُ الله على وسَني

ئەگەر ڕەزامەندیی ئێوە لە شەونخوونیی مندا بێت ئەوا سەلامی خودا لەسەر وەنەوزمە.

بەڵام ئەوەی داوای پشکی خۆی بکات ئەوا لەبەر لەدەسچوونی مەبەست و ئامانجەکەی نیگەران دەبێ و بە هۆی دووریی ئەوەی ئارەزووی دەکات خەم دەخوات، ئەگەر هەژار بێت دڵی دەگۆڕێ، ئەگەریش زەلیل بێت هەر دەگۆڕێ، ئەمە لەبەر ئەوەی لەگەڵ مەبەست و ئارەزووی بەندە.

ئەم وتەیەی (ئەلحوصری) چەند جوانە: چ شتێکی لەسەر من هەیە؟! وە من چ شتێکم لەودا هەیە؟!

ئەمە قسەی خواناسێکە، چونکە ئەگەر تەماشای حەقیقەتی موڵکداری بکات ئەوا بەندەیەکە لەژێر دەست و ڕەفتاری ئاغاکەیەتی، ڕەخنەگرتنی هیچ نرخێکی نییە و ئیرادەشی لە دەستی خۆیدا نییە، ئەگەریش سەیری کرد کە نەفس وەکوو موڵکیەتی ئەوا ڕۆژێك لە دەستی دەردەچێت: ﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ﴾ (التوبة: ١١١) واتە: خودا نەفس و ماڵی لە ئیمانداران لە بەرانبەر بەهەشت کڕیوە.

ئایا بۆ کەسێك جوانە کە مەڕێکی فرۆشتبێ لە کڕیار تووڕە بێت یان دڵی بگۆڕێ ئەگەر مەڕەکەی سەربڕی؟!

سوێند بە خوا، ئەگەر خودا وتی: بۆ ئەوە دروستم کردوون تا ببنە بەڵگە لەسەر بوونم، پاشان من لەناوتان دەبەم و زیندووکردنەوەش نییە! ئەوا لەسەر نەفسە خواناسەکان پێویست بوو بڵێن: ئەوەی وتت بە گوێت دەکەین و لەژێر فەرمانتداین، جا ئێمە چین و چ شتێکمان هەیە تا قسە بکەین؟! ئەی چۆن دەبێ کە بەڵێنی پاداشتی گەورە و نەمری لە بەهەشت و خۆشیی نەبڕاوە داوە؟!

بەڵام ڕێگای گەیشتن پێویستی بە ئارامگرتنە لەسەر ناخۆشی و چەرمەسەری، موسڵمان کاتێ چاوی بە مەککە دەکەوێ هەموو ماندوێتیی ڕێگای لەبیردەچێتەوە.

ئەی ئەوانەی تازە دەستتان پـێ کـردووە و لـە سـەرەتادان ئـارام بگـرن! وا مـەنزڵ دەرکەوت. ئەی مامناوەندەکان دڵخـۆش و شـادمان بـن! وا ڕەشمـاڵ هەڵـدرا. ئـەی خواناسان خۆشیی تەواو بۆ ئێوەیە! بە مزگێنییەوە پێشوازیتان لێ کرا...

سوێند بە خوا بـارگرانیی مامەڵـەکانتان لەسـەر شـان لاچـوو، ناسـینی تاقیکـەرەوە شـیرینییەك بـوو دوای قـومی تێکۆشـان هـات و لـە زاردا هـیچ شـوێنەوارێکی تـاڵیی نەما... نزیکبوونەوەی لاڵانەوە و چێژی ئامادەبوون و گێڕانی جامی ڕازیبوون لێتـان بێننە بەرچاوتان، خۆری دونیا خەریکە بەرەو ئاوابوون دەچێت..

## ٢٣٢- كەس نازانێ خێر لە چیدایە

بیرم لەو قسەیەی (شەیبان)ی شوان بۆ سوفیان كردەوە: ئەی سوفیان! خودا كە شتێكی لێ قەدەغە كردیت و پێی نەدایت وای دانێ ئەمە بەخششێكە لەوەوە بۆت، چونكە ئەو لەبەر ڕەزیلی و چرووكی لێی قەدەغە نەكردوویت بەڵكوو وەكوو لوتف و بەزەیی پێی نەداویت.

دیتم ئەمە قسەی كەسێكە كە لە ڕاستییەكان تێ گەیشتووە. ڕەنگە مرۆڤ ژنی جوان و ناوازەی بوێت و نەتوانێ، نەتوانینیشی بۆی باشترە، چونكە ئەگەر توانی بیانهێنێ ئەوا دڵی پەرشوبڵاو دەبێ: یان بە پاراستنیان، یان بە كاركردن بۆیان و ژیاندنیان. ئەگەر ئیشقی بۆیان زۆر بەهێز بوو ئەوا تەمەنی بەفیڕۆ دەچێ و خەمی ئاخیرەتی دەگۆڕێ بۆ بایەخدان پێیان. ئەگەریش ئەوان ڕووی نەدەنێ و نەیانەوێ ئەوا ئەوە لەناوچوونی هەرە گەورەیە. ئەگەریش داوای خەرجی بكەن و نەتوانێ و پێی هەڵنەسووڕێ ئەوا دەبێتە هۆی لەدەستدانی پیاوەتی و حەیاچوونی. ئەگەریش پەڕین و جووتبوونیان بوێت و ئەویش دەستەپاچە بێت ئەوا ڕەنگە لەناوی ببەن یان بەرەو بەدڕەوشتی برۆن. ئەگەر مەعشووقەكەی مرد لە خەفەتان دەمرێ. ئەوەی بەدوای جوان و ناوازەدا دەگەڕێ ئەوا داوای چەقۆیەك دەكات بۆ سەربڕینی و ناشزانێ.

هەروەها ئەگەر بڕی پێویست نـان و خۆراكـت هـەبوو ئـەوا نیعمەتـە. لـە صـەحیحی بوخـاری و موسـلیمدا هـاتووە كـە پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویـەتی: ((خودایـە ڕۆزی كەسـوكاری موحەممـەد ئەوەنـدە بێـت بەشـی ژیـان بكات)).

هەر كاتێ زۆر بوو ئەوا خەم و پەرۆشییەكانی پـەرتوبڵاو دەبێ. ژێـر ئـەو كەسـەیە بزانێ كە دونیا بۆ خۆشی نەخوڵقاوە و قەناعەتی كردووە بە بەڕێكردنی كات بە هەر حاڵێك بێت.

## ٢٣٣- بیانووی تەنبەڵی

کۆمەڵێك لە خەڵکم بینی قـەدەر دەکەنـە بیـانوو و دەڵـێن: ئەگـەر یارمـەتی(توفیق) درام ئەو کارە دەکەم!

ئەمـە بیانووهێنانەوەیـەکی ساردوسـڕە و دانـەدواوەی فـەرمان و نـەهیی خودایـە، ئاماژەیە بۆ ڕەتکردنەوەی وتەی سـەرجەم پێغەمبـەران و شـەریعەتەکانیان، ئەگـەر بێباوەڕێك بە پێغەمبەر بڵێ: ئەگەر یارمەتیم بدات موسڵمان دەبم! وەڵامی ناداتەوە ئیللا بە لە ملدان نەبێ!

ئەمە لە چەشنی قسەی خەڵکە بۆ ئیمامی عـەلی (خـودا لێـی ڕازی بێـت) کـە پێیـان گوت: بۆ لای کتێبی خودا (قورئان) بانگت دەکەین! ئیمام وتی: (کلمةُ حقّ أُريدَ بها باطل) واتە: ئەمە قسەیەکی هەق و ڕاستە بەڵام مەبەست لێی ناڕەوایـە... هـەروەها قسـەی ئـەو کەسـانەی ئامـادەی دانـی صـەدەقە نـەبوون: ﴿أَنُطۡعِمُ مَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطۡعَمَهُۥٓ﴾ (یس: ٤٧) واتە: نانی کەسێك بدەین کە ئەگەر خودا بیـەوێت خـۆی نـانی دەدات؟!

سوێند بە خوا، یارمەتیدان و سەرخستن(التوفیق) بنچینەی کردارە بەڵام یارمەتیدان شتێکی شاراوەیە و، قسەی بەکردار شتێکی دیارە، نابێ بە باسـکردنی ون و نادیـار سەرقاڵ و بێئاگا بین لە شتی دیار.

ئەوەى ئەم ناڕەزاييە ناهێڵێ ئەوەيە بەم كەسە كە ئـەم قسـەيەى كـردووە بـوترێ: خواى گەورە هيچ شتێكى پێ نەسپاردوويت ئيللا ئامرازەكانى ئەم كردارەت لـە لايـە و توانات بەسەريدا هەيە: ئەگەر توانات بەسەريدا نـەبوو، ئامرازەكـانيش بەردەسـت نـەبوون ئـەوا نـە فـەرمانێك هەيـە نـە تـەكليف. ئەگـەر تـۆ بـەو ئامرازانـە هـەوڵى بەدەسـهێنانى ئامـانج و ئارەزووەكانـت دەدەيـت ئـەوا بـۆ بـەجێهێنانى فـەرزەكانت بيكە.

نموونەى ئەوە: تۆ بۆ دەسكەوتنى قازانج سەفەر دەكەيت كەچـى داوات لێ دەكرێـت حەج بكەيت نايكەيت! بێداربوونەوەى شەوانت لەسەر قورسە بەڵام ئەگەر بتەوێ بۆ جەژن برۆيت بەيانى زوو بەخەبەر دێيت! بـۆ هەنـدێ مەبەسـت و ئامانجـت چـەندان سـەعات لەگـەڵ هاوڕێكـەت دەوەسـتيت و قسـە دەكـەيت بـەڵام ئەگـەر لـە نوێـژدا وەستايت ئەوا پەلە دەكەيت و لەسەرت قورس دەبێت!

ئامان نەكەيت بە شتێكەوە پەيوەست بيت كە هيچ بەڵگەيەكت تێيدا نييـە! پاشـان لـە بەشـەكەت كـەم دەبێتـەوە و لـە پشـكەكەت بـەفيڕۆ دەچـێت، بـەڵكوو بـۆت دەجووڵێنرێ و بۆ سوودى تۆ هان دەدرێ، ئيتر دەسپێشخەربە و پەلە بكە، چـونكە خۆت دەسپێشخەريت.

ئـەوەى تەنبـەڵيت لادەبـات – ئەگـەر سـەرنج بـدەيت – ئەوەيـە خـەياڵى پاداشـتى كۆششكاران بكەيت كە تۆ لەدەستت چووە! لە سەرزەنشتكردنى كەمتەرخەم ئـەوە بەسە ئەگەر نەفسى هـەبێ، سـەبارەت بـە هيممـەتمردووش ئـەوا: **ما لِجُرحٍ بِمَيِّتٍ إِيلامُ** واتە: برينى مردوو هيچ ئازارێكى نييە.

حاڵت چۆن دەبێ کە ئەگەر لە گۆڕەکەت هەستایتەوە و بۆ خەڵکانێك وشترگەلی نایابی ڕزگاربوون نزیك خراوەتەوە و تۆش ساتمەت کردووە و کەوتوویت؟! پیاوچاکان خێرا لەسەر پردی سیڕات پەڕیونەتەوە و تۆش پەلەکوتە و شەپەشەپتە؟! زۆر لە یەکتر دوورن!!

شیرناییی دەسبەتاڵی ڕۆیشت و تاڵاییی ئاخ و ئۆف مایەوە، ئاوی جامی تەنبەڵی چۆڕپڕ بوو و خلتەوپلتەی پەشیمانی مایەوە!

ئەندازەی مانەوە لە دونیا بەراورد بە بەردەوامیی ئاخیرەت چەندە؟! پاشان ئەندازەی تەمەنت لە دونیا کە نیوەی نووستنە و ئەویتری بێئاگاییە چەندە؟!

## ٢٣٤- پشتكردنه سوننەت

سەيرى قسەكەى (ئەبى دەرداء)م كرد كە دەڵێ: لەمڕۆدا شتێك ناناسمەوە لەگەڵ ئەوەى جاران ئێمە لەسەرى بووين تەنها ڕووگە (قيبلە) نەبێ! (ئەبى دەرداءكە لە ساڵى ٣٢ى كۆچى وەفاتى كردووە يەكێكە لە هاوەڵەكانى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و مەبەستى لەم قسەيە ئەوەيە هەموو شتەكانى سەردەمى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ دواتر وەها گۆڕاون تەنها قيبلە وەكوو خۆى ماوە!)..

وتم: سەيرە! چۆن دەبێ ئەگەر ئەمڕۆ بمانبينێ لەكاتێكدا لە شەريعەت تەنها ڕووكەش و وێنە لەگەڵماندا ماوە؟!

شەريعەت بريتييە لە ڕێگا، شەريعەتى پێغەمبەريش (صلى الله عليه وسلم) يان بە كردەوەكانى ياخود بە وتەكانى دەزانرێت.

هۆكارى لادان لە ڕێگاى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): يان نەزانينى ڕێگاكەيە، ئيتر مرۆڤ لەگەڵ تەبيات و دابونەريتەكان ڕێ دەكات، ڕەنگە ڕێگايەك بگرێتەبەر كە پێچەوانەى شەريعەت بێت، هاوەڵان پێغەمبەريان (صلى الله عليه وسلم) بينيوە و گوێبيستى وتەكانى بوون، كەم ڕوويداوە يەكێكيان لە ڕاستەڕێى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لاياندابێت. بەڵام ئەبوو دەرداعهەندێ لادانى بە هۆى ئارەزووى

تەبیاتەکان بینیوە بۆیە هاواری لێ هەستاوە، چونکە ڕەنگە مرۆڤ ڕێگای ڕاست بزانێ بەڵام سروشت و تەبیاتی لە ڕێگاکە لادەدات.

هێشتا ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی گێڕدراونەتەوە بە کەمی پشتی پێ دەبەسترێ و کاری پێ دەکرێ تا ئەوەی لەم سەردەمەی ئێمەدا بەتەواوی پشتی تێ کرا و پشتگوێ خرا مەگەر بە دەگمەن، وە ڕێگاگەلێك گیراوەتەبەر کە هاودژی شەریعەتە و هەندێ دابونەریت هاتۆتە ئاراوە کە لە لای خەڵك لە پیادەکردنی شەریعەت ئاسانترە.

جا ئەگەر زۆربەی ئەوانەی دەدرێنە پاڵ زانست پشتیان کردبێتە زانستەکانی شەریعەت، ئەی دەبێ ڕەشەخەڵکەکە چۆن بێت؟!

جا کاتێ زۆرێك لە زاناکان پشتیان کردە فەرموودەکان دەستیان کرد بە بیدعەکاری لە بنچینە و لقەکان(الاصول و الفروع):

ئوصولییەکان بە (کەلام) سەرقاڵ بوون کە لە فەیلەسووف و زانایانی لۆژیك وەریانگرتبوو!

فروعییەکانیش دەستیان خستە ناو ئەوە و سەرقاڵ بوون بە مشتومڕ و وازیان لە فەرموودە هێنا کە بنەمای حوکم و بڕیارە لە شەرعدا!

پاشان چیرۆکخوێنەکان دیتیان کە دووڕوویی بە دووڕووییە: هەندێکیان ڕوویان کردە خۆداپۆشین بە زوهد و مەبەستیشیان دونیا بوو! زۆربەیان دیتیان کە دڵەکان مەیل

و ئارەزوویان بۆ گۆرانییە بۆیە گۆرانیبێژی دەنگخۆشیان هێنـا و شـیعری دڵـدارییان دەخوێندەوە و وازیان لە مەشـغوولبوون بـە فـەرموودە هێنـا و گرینگییـان نـەدا بـە جڵەوگیریکردنی ڕەشۆکییان لە ڕیبا و داوێنپیسـی و فـەرمانکردنیان بـە ئەنجامـدانی ئەرکە ئایینییەکان! قسـەکەریان کـۆڕی هـەموو بـە باسـکردنی لـەیلا و مـەجنوون و کێوی تووڕ و مووسا و ئەبی یەزید و حەللاج و ئەو وڕێنانەی هـیچ سـوودێکیان نییـە بەسەردەبرد!

خـەڵکێکیش دەسـتیان دایـە زوهـد و دابـڕان لـە خـەڵك، وازیـان هێنـا لـە سـەردانی نـەخۆش و هاموشـۆکردنی نێـوان خـەڵك و سـەرکزی و خشـووعیان نمـایش کـرد و کتێبگەلێکیان بۆ مەشق و ڕاهێنانی نەفس و کەمخواردن دانا و شەریعەت لـە کنیـان بووە قسەی ئەبی یەزید و شبلی و سۆفییەکان!

دیارە هەر کەسێ لە شەریعەت قووڵ بێتەوە هیچ شتێك لەمەی تێدا نابینێ.

میر و دەسەڵاتدارەکانیش لەگەڵ دابونەریتەکان ڕۆیشتن و ئەو کوشتوبڕەی دەیکەن ناویان لێ ناوە سیاسەت و بەپێی شەریعەت نەجوڵاونەتەوە! لەوەشدا ئەوەی دواتـر شوێن ئەوەی پێش خۆی کەوتووە.

ئیتر کوا شەریعەتی موحەممەدی؟! لەگەڵ پشتکردن لە فەرموودەکان لەکوێوە ئـەو شەریعەتە دەزانرێ و دەناسرێ؟!

لـە خـوای گـەورە داوا دەکـەین یارمـەتیمان بـدات بـۆ جێبـەجێکردنی شـەریعەت و بەرپەرچدانەوەی بیدعەکان، ئەو تواناداره.

## ٢٣٥- ئارەزووەکانی نەفس کۆتاییان نایەت

گوێم لە عەلی کوڕی حوسەینی واعیز بوو لەسەر مینبەر دەیگوت: سوێند بە خوا، دوێنێ شەو لە دەست نەفسم گریام!

دامام و بیرم کردەوە و وتم: ئەم نەفسە چ شتێکی کردووە تا بگرییێت؟! ئەمە پیاوێکی خۆشگوزەرانە، چەندان کەنیزەکی تورکی هەیە، پێم گەیشتووە بەنهێنی هاوسەرگیری لەگەڵ ژمارەیەك ژن کردووە، خۆشترین خواردن لە مریشك و شیرینی دەخوات، داهاتێکی زۆر و سامانێکی فرە و پلەوپایەکی گەورە و بەخششی بەسەر خەڵکەوە هەیە، شتێك لە زانستی وەدەسهێناوە و بە هۆی چاکەکانیەوە زۆرێك لە زاناکانی بە لای خۆیدا کەمەندکێش کردووە، ئیتر نازانم چ شتێك دەیگرییێنێ؟!

بیرم کردەوە، زانیم کە نەفس سنووری نییە و ناوەستێ، بەڵکوو بێ کۆتا چێژ و خۆشی گەرەکە، هەر کاتێ مەبەست و ئامانجێکی هاتەدی لە لای سارد دەبێتەوە و داوای هیتر دەکات، ئیتر تەمەن لەناودەچێت و جەستە لاواز دەبێت و کەموکورتی پەیدا دەبێ و پلەوپایە کز دەبێ و مەبەست نایەتەدی.

لە دونیا لەو کەسە گەمژەتر نییە کە لە چێژ و خۆشییەکانی دونیا ئەوپەڕەکەی دەخوازێ، چێژی ڕاستەقینە لە دونیادا نییە، بەڵکوو حەسانەوەیە لە ئازاربەخش.

بەختەوەر ئەو کەسەیە کە ئەگەر ژنێکی دەست کەوت مەیل و ئارەزووی یەکتریان کرد و زانی کە پۆشتە و دیندارە ئەوا دەستی لێ گیر بکات و لە دەستی نەدات.

باشترین هۆکار بۆ خۆشەویستیی بەردەوام ئەوەیە چاو نەبڕێتە ژنی تر، هەر کات چاوی بەڕەڵا کرد یان تەماعی چووە ژنی تر ئەوا تەماعی ژنی نوێ ڕەوشت و ئاکار تێکدەدات و تێکەڵاوی کەم دەکاتەوە و کەموکورتییەکانی دەرەوە دەشارێتەوە و نەفس مەیلی بینراوی نەناسراو دەکات و، ژیان لەگەڵ ئەوەیان تێکدەچێ کە لەبەردەست و نزیکە، هەروەك شاعیر وتوویە:

والمرءُ ما دامَ ذا عينٍ يُقَلِّبها    في أعينِ الحور موقوفٌ على الخطرِ
يَسرُّ مُقلتَهُ ما ضرَّ مُهجَتَهُ    لا مرحباً بسرورٍ عادَ بالضررِ

واتە: ماتووڵ مرۆڤ چاو ببڕێتە چاوی ژنان ئیتر لە مەترسیدایە، چاوی بە بینینی ژنی جوان خۆش دەبێ بەڵام زیان بە ڕۆحی دەگەیەنێ، خۆشییەك بەخێرنەیەت کە زیانی هەبێ.

پاشان ژنی دووەمیش وەکوو یەکەمی لێ دێت و نەفس داوای سێیەم دەکات..ئیتر ئەمە کۆتایی نایەت.

بەڵکوو چاوپۆشین لە حەزلێکراوەکان و بێئومێدکردنی نەفس لە داواکردنی ژنە جوانەکان ژیانت لەگەڵ ژنەکەی خۆت خۆش دەکات.

هەر کەسێ ئەم ئامۆژگارییە قەبووڵ نەکات لە ڕێگایەلی ئارەزوودا تەپاوتل دەکات و وردە وردە لەناودەچێت، ڕەنگە بە هەوڵی خۆی زوو خۆی لەناوببات و خۆی عەیبدار بکات، زۆرێك لە ژنە جوانەکان خۆپارێز نین و بە هۆی عەیبدارییانەوە بە کەڵکی چێژوەرگرتن نایەت، هەیانە دەسبڵاون و هەیانە ڕقیان لە مێردە و ئەویش وەکوو بتپەرستێك خۆشی دەوێت..

گەمژەترین گەمژە ئەو پیرەپیاوەیە کە کچێکی منداڵکار دەخوازێ! سوێند بە خوا چێژی تەواو لە گەنجیدایە هەروەکوو وتوویانە:

بە نەفسم وت تازەپێگەیشتووی گچکە بگرە.

هەر کاتێ کچە منداڵەکە پێگەیشتوو نەبوو چێژوەرگرتنەکە تەواو نابێ! کە پێگەیشت جووتبوونی زۆر دەوێت و پیرەپیاوەکەش ناتوانێ! ئەگەر زۆری لە خۆی کرد ژنەکە ناگاتە مەبەستی خۆی و دڵی داناکەوێت و پیرەپیاویش زوو لەناودەچێت!

نابێ بە ئارەزووی جووتبوونی دەسخەڕۆ بێت چونکە ئارەزووەکەی وەکوو سپێدەی درۆزنە.

پیرەپیاوێکمان بینی کەنیزەکێکی کڕی و لەگەڵی نووست، بە مردوویی لەسەریان لابرد!

گەنجێك دوو مانگ لە نەخۆشخانە مایەوە، هاوسەرەکەی چووە لای و ئەویش لێی پەڕی، بە مردوویی لەسەری لاچوو!

دەرکەوت کە نەفس بەو خوێن و مەنییەی هەیەتی ماوەتەوە، ئەگەر جەستە لەم دووانە بەتاڵ بوو و هیچ شتێك نەبوو پشتی پێ ببەستێ ئەوا لەناودەچێ.

ئەگەر پیرەپیاو تەنها بە چێژوەرگرتنی بێ پەڕین قایل بێت ئەوا ژنەکە قایل نابێ و دەبێتە دوژمنی، ڕەنگە ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بێت و بەرەو بەدڕەوشتی بچێت، یان فێڵ بکات بۆ کوشتنی..

ناشیرینە بۆ کەسێك تەمەنی لە شەست تێپەڕی بێت ئارەزووی لە زۆریی ژن بێت!

ئەگەر لەگەڵ ژنێکی دیندار ڕێککەوت با لەگەڵیدا خۆشڕەفتار بێت و کەموکورتییەکانی جارێك بە پارە بۆ خەرجکردن و جارێکیش بە ئاکاری جوان بۆ پڕکاتەوە و زۆر باسی ئەحواڵی ژنە چاکەکان و زاهیدەکانی بۆ بکات و زۆر باسی قیامەت و زەمی دونیای بۆ بکات، باسی ئەویندارى عەرەبی بۆ بکات کە ئەوان عاشق دەبوون و پەڕین لە مەعشووقیان بە باش نەدەبینی هەروەك یەکێکیان وتوویە:

إنما الحبُّ قُبلةٌ وغمزُ كفٍّ وعَضُد

إنما العشقُ كذا إن نكحَ الحُبُّ فَسَد

خۆشەویستی هەر ماچومووچ و لەباوەشکردنە، عیشق هەروایە، ئەگەر پەڕین ڕوویدا ئەوا هەموو شت تێکدەچێ.

ئەگەر توانی بە سکپڕی یان منداڵ سەرقاڵی بکات ئەوا با بیکات و لە ماوەی سەرقاڵکردنی بەوە هێز و توانای بهێڵێتەوە. ئەگەریش لێی پەڕی با بۆ پاراستنی هێزی خۆی و چێژبەخشین بەو لە ئاوهێنانەوە ئارام بگرێ.

بە (بیشری حافی) یان وت: بۆچی هاوسەرگیریت نەکردووە؟ وتی: بە چی شتێك ژنێکی موسڵمان دەسخەڕۆ بکەم لە کاتێکدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِي عَلَيْهِنَّ﴾ (البقرة: ٢٢٨) واتە: ژنان چ ئەرکێکیان لەسەرە بە هەمان شێوە مافیشیان هەیە.

داماو ئەو کەسەیە کە بچێتە نێو کارێکەوە بەر لە چوون سەرنجی سەرەنجامەکەی نەدابێت و وەکوو باڵندەیەك دانی داوەکە دەبینێ و بۆی دەچێ و لەبیری نییە کە باڵ و قاچی بە داوەکەوە دەبێ و دواتر سەردەبڕدرێ.

پوختەی ئەوەی باسم کرد: پاراستنی چاو لە لەوەڕاندن و بێهیواکردنی نەفس لە وەدەسهێنان و ڕازیبوونە بەوەی بەردەست، بەتایبەتی ئەوەی تەمەنی هەڵکشاوە و دەزانێ کە کچی منداڵکار دوژمنیەتی و خۆزگەی مردنی دەخوازێ.

لە هەندێ لەو شتانەی باسم کردوون کەسی ژیر دەگێڕێتەوە لەوەی خۆی گرفتاری ئەم دەردانە بکات.

## ٢٣٦- لەخۆبایيبوون بە لەشساغی

سەیرترین شت لەخۆبایيبوونی مرۆڤە بە ساغ و سەلامەتی و ئومێدبوونی بە چاکبوونی لە داهاتوودا! ئەم ئومێد و لەخۆبایيبوونە کۆتایی و سنووریان نییە، هەر کاتێ بەیانی و ئێوارە ساغ و سەلامەت بوو ئەوا لەخۆبایيبوون زیاد دەبێ و هیوا درێژ دەبێ.

چ ئامۆژگارییەك کاریگەرترە لەوەی هەواری هاوڕێیان و ئەحواڵی برایان و گۆڕی خۆشەویستان ببینیت و بزانیت کە تۆ دوای چەند ڕۆژێکی تر وەکوو ئەوانیت، پاشان وریا نەبیت تا ئەوەی غەیر بە تۆ وریابێتەوە؟! سوێند بە خوا ئەمە کاری گەمژانە! کەسێك هۆشی هەبێ زۆر دوورە ئەم ڕێگەیە بگرێتەبەر.

بەڵێ سوێند بە خوا، کەسی ژیر کاتی سەلامەتی دەسپێشخەری بۆ کاری چاکە دەکات و کاتی لەشساغی بۆ کاتی نەساغی هەڵدەگرێ و لە کاتی تواناداریدا توێشوو بۆ ڕۆژی تەنگانە کۆدەکاتەوە بەتایبەتی کەسێك کە دەزانێ ئاستەکانی ئاخیرەت بە ئەندازەی بەرزیی کارکردن بۆی بەرز دەبێتەوە و قەرەبووکردنەوە دوای لەدەسچوون ناکرێ.

وادانیٚ کە یاخی و سەرپێچیکار چاوپۆشی لێکرا و خودا لێی خۆش بوو، ئایا پلەوپایە و ئاستی ئەو کەسانە وەدەست دێنیٚ کە کاریان کردووە؟!

هەر کەسێك باسی ئەو بەهەشتەی بە بیر و هزریدا هێنا کە نە مردن و نە نەخۆشی و نە نووستن و نە خەمی تێدایە بەڵکوو چێژ و خۆشییەکانی بەردەوامی بیٚ برانەوەن و زیادبوونیشی بە ئەندازەی زیاد کارکردن و خۆماندووکردنی ئێرەیە ئەوا ئەم کات و زەمانە دەقۆزێتەوە، پێویست نەبیٚ ناخەویٚ و ساتێك لە ئاوەدانکردنەوە بێئاگا نابیٚ.

هەر کەسیٚ بینی کە گوناهێك چێژەکەی ڕۆیشتووە و دەردەکانی بەردەوام ماون ئەوە بەسە بۆ ئەوەی واز لە هاوشێوەی ئەم گوناهە بێنیٚ بەتایبەتی ئەم گوناهانەی شوێنەواریان هەر دەمێنیٚ و بەردەوام دەبیٚ وەکوو ئەوەی پیاوێك زینا لەگەڵ ژنێکی مێردار بکات و سکی لێی پڕ ببێت، منداڵەکە بە پیاوەکە بلکێنریٚ و لە میراتی کەسوکاری بێبەش بکریٚ و لە میراتی غەیری کەسوکاری ببات و ڕەچەڵەك و بنەماڵە دەگۆڕدرێت و ئەوە هەتاهەتایە بەردەوام دەبیٚ و هەمووشی نەگبەتیی ساتێکە.

## ٢٣٧- لەبارەی سیفەت و حیکمەتی خوداوە

لــە هۆکــاری تێکــەڵکردنی بیروباوەڕەکــان وردبوومــەوە دیــتم بریتییــە لــە مەیلکردن بۆ هەست و قیاسی نادیارەکان لەسەر حازر و بەردەست:

خــەڵکێك هەســت بەســەریاندا زاڵ بــووە، کــاتێ دروســتکەریان نــەبینی نکــوڵی بوونیــان کــرد و لــەبیریان چــوو کــە ئــەو بــە کردارەکانییــەوە دەرکــەوتووە و، ئــەم کردارانــەش دەبــێ بکــەرێکیان هــەبێ، کەســی ژێــر ئەگــەر بــە بیابــانێکی چــۆڵدا تێپــەڕی پاشــان گەڕایــەوە دیتــی ڕووەك و خــانووی تێدایــە دەزانــێ کــە دەبــێ کەسـێك هــەبێ ڕووەکــەکانی چــاندبێت چــونکە نــە ڕووەکــەکان و نــە خانووەکــە لەخۆیانەوە چێ نابن.

پاشـــان خـــەڵکانێك هـــاتن بـــوونی دروســـتکەریان ســـەلماند پاشـــان لەســـەر حاڵوبــاری خۆیــان قیاســیان کــرد، ئــیتر تەشــبیه و بەیەکترچــواندنیان هێنایــە ئــاراوە، تەنانــەت کەســیان هــەبوو دەیگــوت: مەبەســت لــە فــەرموودەی ((ینــزل إلی السـماء)) واتــە لــە شــوێنێکەوە دەگوازێتــەوە شــوێنێکی تــر! بەڵگەشــی ئــەوە بوو گوایە عەرەب مەبەستی لە وشەی (النزول) تەنها گواستنەوەیە.

خـــەڵكێكی زۆر لـــە زات و ســـیفاتی خـــودا گـــومڕێ بـــوون، خـــەڵكانێك كـــاتێ بیستیان كە خودا تووڕە دەبێ و خۆشنوود دەبێ وا گومانیان برد كە خودا

كاریگـەر دەبـێ، لـەبیریان چـوو كـە سـیفەتی خـودا كـۆن و قەدیمـە و هـیچ شتێكی نوێی لێ ڕوونادات.

خـەڵكێكیش لـە كردارەكـانی خـوادا گـومڕا بـوون، دەسـتیان كـرد بـە بەڵگـەكاری و بـە هـیچ شـتێك قەناعـەتیان نـەكرد، خـەڵكێك لێیـان پەیـدا بـوو تـا ئـەوەی كرداری خودایان بە دژەحیكمەت لێكدایەوە ! ! خودا زۆر لەوە بەرزترە !

هـەر كەسـێ تـەوفیقی دراوە بـا دڵـی ئامـادە بكـات بـۆ ئـەوەی دەیڵـێم: بزانـە كـە خـــودای گـــەورە بـــە هـــیچ زاتێـــك ناچـــێت و سیفەتەكانیشـــی وەكـــوو ســـیفاتی كەسی تر نییە، كردارەكانیشی بە كردارەكانی خەڵك قیاس ناكرێ.

سـەبارەت بـە زاتـی خـودا ئـەوا ئێمـە زاتێـك ناناسـین مەگـەر جەسـتە و تـەن بێـت، ئـەوەش پێویسـتی بەوەیـە پێشـتر پێكـەوەلكێنرابێت، خـوداش لـەوە بـەدوورە چـونكە خـۆی شـتەكان دروسـت دەكـات و پێكـەوەیان دەلكێنـێ. یـان جەوهـەر بێـت، جەوهـەیش شـوێنێك دەگـرێ و نموونـەی هەیـە، خـوداش لەمـە بـــەدوورە. یـــان (عَـــرَض)ە، (عَـــرَض)یـــش بـــوونی پەیوەســـتە بـــە غـــەیرەوە، خوداش لەمە بەدوورە.

ئەگـــەر زاتێكـــی كـــۆن و قـــەدیممان لـــە دەرەوەی ئـــەوەی دەناســـرێ ســـەلماند ئـەوا بـا بزانـرێ كـە سـیفەتەكان شـوێنكەوتەی ئـەو زاتـەن، دروسـت نییـە شـتێك

قیاس بکەین لەسەر ئەوەی دەیکەین و تێی دەگەین، بەڵکوو ئیمانی پێ دێنین و تەسلیمی دەبین.

هەروەها کردارەکانی، ئەگەر یەکێك لە ئێمە کارێك بکات کە نە سوودێك بهێنێ و نە زیانێك دوور بخاتەوە ئەوا بە شتێکی بێهوودە دادەنرێ، خوای گەورە خەڵقی هێناوەتە بوون نە بۆ سوودێك کە بۆ ئەوی هەیە و نە بۆ لابردنی زیانێك، چوون سوودەکان بەو ناگەن و زیانەکانیش بۆ ئەو ناچن.

ئەگەر یەکێك وتی: خەڵقی بۆ ئەوە چێ کردووە تا سوودیان پێ بگەیەنێ.

دەڵێین: ئەم قسەیە پووچەڵ دەبێتەوە بەوەی کە ئەو خەڵکێکی بۆ بێباوەڕی دروست کردووە و سزایان دەدات، دەبینین ئازاری ئاژەڵ و منداڵان دەدات و زیانەکان چێ دەکات و دەشتوانێ ئەوە نەکات.

ئەگەر یەکێك وتی: ئەو لەسەر ئەوە پاداشت دەداتەوە.

دەڵێین: ئەو دەتوانێ بە بێ ئەم شتانەش پاداشت بداتەوە، سوڵتان ئەگەر ویستی هەژارێك دەوڵەمەند بکات برینداری کرد ئینجا دەوڵەمەندی کرد ئەوا لەسەر ئەوە سەرزەنشت دەکرێ چونکە دەیتوانی بێ بریندارکردن دەوڵەمەندی بکات.

پاشان هەر کەسێ ئەو برسێتی و کوشتنە ببینێ کە بەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و هاوەڵانیدا هات لەگەڵ توانای خودای پاڵپشت

پاشـــان پێغەمبـــەر (صـــلى الله عليـــه وســـلم) لـــەبارەی دایکییـــەوە شـــتێك داوا دەكـــات و خـــودا لێـــی قـــەبووڵ ناكـــات، ئەگـــەر داوالێكـــراو ئێمـــە بووینایـــە دەمانگوت: بۆچی شتێك نادەیت كە زیانی بۆت نییە؟!

بـــەڵام كردارەكـــانی خـــودا لەســـەر كردەوەكـــانی ئێمـــە قیـــاس نـــاكرێن و پاســـاو نـــادرێن و بەڵگـــەكارییان بـــۆ نـــاكرێ، ئـــەوەی تەســـلیمبوونمان لەســـەر پێویســـت دەكـــات ئەوەیـــە حیكمـــەتی خـــودا لەســـەرووی عەقڵەوەیـــە، ئـــەو بڕیـــار لەســـەر عەقڵـــەكان دەدات و عەقڵـــەكان بڕیـــار لەســـەر وی نـــادەن، هـــەر كەســـێ كـــرداری لەسەر كردارەكانمان قیاس كرد ئەوا هەڵەیەكی گەورەی كردووە.

موعتەزیلـە لـەم جـۆرەدا سـەرەنگرێ بـوون و لەناوچـوون، ئـەوان وتیـان: چـۆن فـــەرمان بـــە شـــتێك دەكـــات و بڕیـــاری نـــەكردنی دەدات؟! ئەگـــەر كەســـێك بانگمـــان بكـــات بـــۆ ماڵەكـــەی، پاشـــان كەســـێكی دانـــا نەیهێشـــت كـــەس بچـــێتە ژوورەوە ئەوا عەیبەی لێ دەگیرێ.

ســـەبارەت بـــە (شـــاهید) ڕاســـتیان كـــرد، بـــەڵام ئـــەوەی كردارەكـــانی بەڵگـــەكاری ناكرێن و بە شاهید قیاس ناكرێن ئەوا ئێمە ناگەین بە زانینی حیكمەتەكەی.

ئەگـــەر یـــەكێ وتـــی: چـــۆن دەتـــوانم عـــەقڵم بـــەرەو شـــتێ ببـــەم كـــە پێچەوانەیەتی؟؟

دەڵـــێین: پێچـــەوانەکاری نییـــە، چـــونکە عـــەقڵ بـــە بەڵگـــەی ڕۆشـــن سـەلماندوویەتی کـە ئـەو حـەکیم و خاوەنـدارە(مالك)، حـەکیم شـتێك ناکـات ئیللا بۆ حیکمەتێك نەبێ، بەڵام ئەو حیکمەتە عەقڵ پێی ناگات.

ئـەی نـابینی خـدر (الخضـر) کەشـتییەکی کـون کـرد و کەسـێکی کوشـت، حـەزرەتی مووسـا بـە حـوکمی زانسـت ڕەخنـەی لێ گـرت و ئاگـاداری حیکمـەتی کردارەکەی نەبوو، کاتێ حیکمەتەکەی بۆ دەرکەوت ملکەچ بوو؟

نموونەی هەرە باڵا بۆ خودایە.

ئامـان نەکـەی شـتێك لـە کردارەکـانی خـودا لەسـەر کردارەکـانی خـەڵق قیـاس بکـەیت، یـان شـتێك لـە سیفەتەکانی یـان زاتـی، تـۆ گـەر ئەمـەت پاراسـت ئـەوا سـەلامەت دەبیـت لـەو پێکچـوواندن و تەشـبیهەی ئەوانـە تێـی کـەوتن کـە پێیـان وایـە (الاسـتواء) واتـە (اعتمـاد) و (النـزول) واتـە گواسـتنەوە (نقلـة)، وە ڕزگـار دەبیـت لـەو ڕەخنـە و پەڵپگرتنـەی خـەڵکێکی بـەرەو بێبـاوەڕی بـرد تـا ئـەوەی تانەیان لە حیکمەت دا.

یەکـەمین کەسـیش لەوانـە ئیبلیسـە، ئـەو پێـی وابـوو پێشخسـتنی قـوڕ بەسـەر ئـاگر حیکمـەت نییـە، لـەبیری چـوو ئـەو - بـە گومـانی خـۆی - بـەو تێگەیشـتنەی پێـی دراوە و بـەو عەقڵـەی پێـی بەخشـراوە ئـەوەی زانیـوە، لـە یـادی چـوو کـە خـوای بەخشـندە زانـاترە: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ

مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ (فصلت: ١٥) واتـه: ئـەوە نـابینن و نـازانن کـە ئـەو خودایـەی ئـەوانی خوڵقاندووە لەوان بەهێزترە؟!

ڕەخنەیەکی (ئیبن ئەلرومی)م بینی لە دژی ئەو کەسەی دەڵێ بێباوەڕان لە دۆزەخدا هەتاهەتایی دەمێننەوە و نامرن، وتوویەتی: ئەو هەتاهەتاییە تۆڵەکردنەوەیەکی زۆرە و عەقڵ نکوڵی دەکات و پێویستە هەموو شتێك کە عەقڵ دەیڵێ قەبووڵ بکرێ و هەندێکی ڕەت نەکرێتەوە، چونکە ڕەتکردنەوەی هەندێکی شیاوتر و لەپێشتر نییە لە ڕەتکردنەوەی هەمووی، وە مانەوەی هەتاهەتاییی بێباوەڕان هیچ مەبەستێکی نە بۆ ئازاردەر و نە بۆ ئازاردراو تێدا نییە، ئیتر دروست نییە هەبێ.

وتم: سەیر لەمەی بانگەشەی بوونی عەقڵ دەکات و عەقڵی لە کن نییە!

یەکەم شت کە پێی دەڵێم: ئەو هەواڵەت لە خوداوە پێ ڕاستە یان نا کە هەواڵی هەتاهەتا مانەوەی ئەهلی دۆزەخی داوە؟

ئەگەر پێی ڕاست نەبێ کەواتە قسەکردن لەبارەی سەلماندنی پێغەمبەرایەتی و ڕاستیی قورئانە، ئیتر باسکردنی لق لەگەڵ ئینکاریکردنی ئەسڵ چ واتایەکی هەیە؟!

ئەگەریش وتی: لە لام سەلماوە ئەوا پێویستە لەسەری بۆ خۆی بەڵگەی لاواز و پووچ بهێنێتەوە مەگەر لە ڕووی ناڕەزایی و بەرهەڵستی بوەستێ.

كەسـێك ئینكـاری ئەمــە دەكـات كـە شـتەكە لـە شـاهید وەربگرێـت، ڕوونمـان كـردەوە كـە زاتــی هــەق وەكــوو زاتــەكانی تــر نییــە، سـیفەتی وەكـوو سـیفاتی كەسانی تر نییە، كردارەكانی پاساو نادرێن.

ئەگــەر لــەبارەی هەتاهــەتاییی مانــەوەی بێبــاوەڕان لــە دۆزەخ ئامــاژەی بــە شـتێك لــە پاســاودان دا ڕوون دەبێتــەوە: كــە دروســتە بــەردەوام ســزادان و ئازاردانیــان بــۆ دەرخســتنی ڕاســتیی هەڕەشــەكە بێــت، چــونكە ئــەو فەرموویـەتی: هـەر كەسـێك بێبـاوەڕ بێـت پـێم، ئـەوا لـە دۆزەخـدا هەتاهەتایـە دەیهێڵمــەوە، هــیچ تــاوانێكیش وەكــوو بێبــاوەڕی نییــە و هــیچ ســزایەكیش وەكـوو سـووتاندنی بـەردەوام نییـە، ئـەو سـزایە بـەردەوام دەبـێ بـۆ ئـەوەی ڕاستیی هەڕەشەكە دەربخات.

وە دروســتە ئــەوە بــۆ تــەواوكردنی خۆشــحاڵكردنی بــاوەڕداران بێــت چــوون ئــەوان دوژمنــی بێبــاوەڕانن، خــوای گــەورەش فەرموویــەتی: ﴿وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ﴾ (التوبـة: ١٤) واتــە: تـا بـاوەڕداران دڵیـان خـۆش بێـت و خۆشـحاڵ بن.

چـەندان بـاوەڕدار لـە دڵـەوە لـە ڕەفتارەكـانی ئـەبوو جـەهل نیگـەران و تـووڕە بـوو! عــەممار و ســوممەییەی دایكــی و غــەیری ئــەوانیش چــەندە لــە دڵــەوە خـەمیان لـە كـردەوەی بێبـاوەڕان پێیـان دەخـوارد! كەواتـە بـەردەوامیی سـزا و ئەشكەنجەی بێباوەڕانی شیفای دڵی ئەهلی باوەڕە.

دروسـته سـزا و ئەشـكەنجە بـەردەوام بێـت لەبـەر نـاڕەزاییی بێبـاوەڕان و ناوهێنـانی خـودای سـزادەر بـە شـێوەیەكی نەشـیاو، هـەر چـەند سـزا و ئەشـكەنجەیان زیـاد بكرێـت بێبـاوەڕی و ناڕەزاییـان زیـاتر دەبێـت، لەبەرئـەوە سزا و ئەشكەنجە دەدرێن.

بەلگـەی بـەردەوامیی بێباوەڕییـان ئـەم ئایەتەیـە: ﴿فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾ (المجادلـة: ١٨) واتـە: چـۆن سـوێند بـۆ ئێـوە دەخـۆن ئـەوهاش سـوێند بـۆ خودا دەخۆن!

كەواتـە بێباوەڕییـان هێشـتا بەردەوامـە و پێشـیان زانیـوە، خراپـەش لـە ناخـەكان خـۆی حەشـارداوە، سـزا و ئەشـكەنجەكە لەسـەر ئـەوە دەبێـت: ﴿وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ﴾ (الأنعـام: ٢٨) واتـە: ئەگـەر بگەڕێنرێنـەوە دونیـا ئـەوا دەگەڕێنەوە سەر ئەو كار و كردەوانەی نەهییان لێ كراوە.

## ٢٣٨- پێویستی تەسلیمبوون بە فەرمانی خودا

پێویستە باوەڕدار کە سەیری بەشی پێشووی کرد لە هیچ شتێکدا ڕەخنە و پەڵپ لە خودای گەورە نەگرێ، نە لە ناخەوە و نە لە ڕووالەت، داوای ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی هەموو کارەکانی نەکات، موتەکەلیمەکان پشتیان لە سوننەتەکان کرد و بە ڕاوبۆچوونی خۆیان قسەیان کرد، بۆیە بە هۆی جیاوازییانەوە نەگەیشتنە ئەنجامێکی وەها دڵیان ئاوبخواتەوە. هەروەها بەکارهێنانی قیاس کاتێ خستیانە کار قسەگەلێك هات لێی دەشێواندن.

ڕاست ئەوەیە ئەوەی دەتوانرێ، هۆکارەکەی ڕوون بکرێتەوە، تەسلیمبوونیش بەوەی ون و نادیارە.

هەروەها داواکردن لە خوای گەورە، ئەگەر ئیماندار لێی پاڕایەوە و هیچ وەڵامێکی نەبینی ئەوا تەسلیم دەبێ و خۆی بە خودا دەسپێرێ و گیرانەبوونی پاڕانەوەکەی تەئویل دەکات و دەڵێ: ڕەنگە گیرانەبوون باشتر بێت، ڕەنگە لەبەر گوناهەکانم بێت، لەوانەیە دواخستن باشتر بێت، لەوانەیە لەمەدا سوود و بەرژەوەند نەبێت....ئەگەر هیچ تەئویلێکی نەدیتەوە ئەوا هیچ جۆرە ناڕەزایی و پەڵپێك بە ناخیدا نایەت، بەڵکوو پێی وایە ئەو بە نزا و پاڕانەوەکەی خواپەرستی کردووە،

ئەگەر خودا چاکەی لەگەڵدا کرد ئەوا بە فەزڵ و بەخششی خۆیەتی، ئەگەریش نزاکەی گیرا نەکرد ئەوا خۆی خاوەنداری هەموو شتێکە و چی بوێت دەیکات.

زۆربەی داواکردن بۆ ئەو شتانەی دونیایە کە ئەگەر ڕەتکرایەوە باشترە!

با خەمی کەسی ژێر لە جێبەجێکردنی مافی خودای هەق و ڕازیبوون بە تەدبیری وی بێت ئەگەر پێشی ناخۆش بوو. هەر کات ڕووت لە خودا کرد ئەوا ئەویش ڕوو دەکاتە چاکردنی کاروبارت. ئەگەر زانیت ئەو بەخشندە و دەسکراوەیە ئەوا پەنای پێ بگرە و داوا مەکە! هەر کات ڕووت کردە تاعەت و گوێڕایەڵیی ئەو، ئەوا ئەستەمە کەسێك کاری جوان بکات و لە کاردا دڵسۆز بێت پاشان کرێی پێ نەدرێ.

## ٢٣٩- بیرکردنەوە لە بەهەشت

سوێند بە خوا من بیر لە چوونە ناو بەهەشت و مانەوەی هەمیشەیی تێیدا دەکەمەوە: بێ نەخۆشی و نووستن و هیچ دەردێك! بەڵكوو لەشساغییەكی بەردەوام و هەموو پێویستییەك مشەیە، تووشی هیچ ناخۆشییەك نابیت، هەموو ساتێك لە خۆشی و شادیی نوێدایت، زیادەی بێ كۆتایی..لە خۆشییان خەنی دەبم، ئەگەر شەرع گرەنتی نەدابێ نزیكە سروشتی مرۆ لە باوەڕكردن بەوە تەنگەتاو بێت!

ئاشكرایە كە شوێن و پلەوپایەكانی بەهەشت بە ئەندازەی خۆماندووكردن و هەوڵدانی ئێرە دەبێت.

مایەی سەرسوڕمانە كەسێك لەم دونیایەدا ساتێك بەفیڕۆ بدات! سوبحانەڵڵایەك درەختێكی لە بەهەشتدا بۆ دەڕوێنێ كە بەر و سێبەری هەمیشەیی هەیە.

ئەی ئەو كەسەی دەترسیت ئەوەت لە دەست بچێت! دڵت بە ئومێدەوە هان بدە.

ئەی بێزار و وەڕس لە باسی مردن! سەرنجی دوای تاڵیی خواردنەوەكە بدە كە خۆشی و ساغییە، چونكە لە ساتی دەرچوونی ڕۆح نەك پێش دەرچوونی، شوێن و جێگاكان بۆ كەسەكان دەردەكەوێ، ئینجا ڕۆیشتنی ئەو كەسە ئاسان دەبێ كە

کەمەندکێشی ئەو چێژەی بۆی دەچێ بووە...پاشان ڕۆحەکان لە سیکلّدانۆچکەی باڵندەدا لەسەر درەختەکانی بەهەشت هاتوچۆ دەکەن..

هەموو دەرد و ترسەکان لە ڕۆژی ئەجەلدایە و، خۆری تەمەن وا زەرد بووە، ئیتر پەلە بکەن بەر لەوەی خۆر ئاوا بێت!

هیچ یارمەتیدەرێك نییە هاوڕێی ئەو ڕێگایە بێت ئیللا هزر و بیر نەبێت کە ئەگەر لەگەڵ عەقڵ دانیشت و پێکەوە یاد و باسی سەرەنجامەکانیان کرد، ئەگەر ئەم مەجلیسە تەواو بوو ئەوا سەیرکردنی ژیاننامەی کۆششکاران دێت، ئەوەش جۆرەها چاکە بۆ بیر دێنێ، دوای ئەوەش تەوفیق و دەست بە باڵەوە گرتن، هەر کاتێکیش خودا تۆی بۆ شتێك گەرەك بوو ئەوا ئامادە و سازت دەکات.

سەبارەت بە تێکەڵبوونی ئەوانەی کە جگە لە دونیا ئاگایان لە هیچیتر نییە ئەوا ئەوە گەورەترین هۆکارەکانی نەخۆشیی تێگەیشتن و نەساغییەکانی عەقڵە، دوورەپەرێزی لە خراپە خۆپاراستنە، خۆپاراستنیش هۆکاری ساغییە.

## ٢٤٠- خواناسين ئاسوودەيیە

دیتم هۆکاری خەم و پەژارەکان پشتکردن لە خوای گەورە و ڕووکردنە دونیایە. هەر کە شتێکی لە دونیا لە دەست چوو خەم لە لەدەسچوونی دەخوات.

بەڵام ئەوەی خواناسینی پێدراوە ئاسوودەیە چونکە بە قەزا و قەدەری خودا ڕازییە، هەر شتێکی بەسەربێت خۆشنوودە، ئەگەر نزای کرد و گیرا نەبوو هیچ نارەزاییەك بە دڵیدا نایەت چونکە ئەو بەندەی خودایە و کاروباری بە دەست ئەوە، هەوڵ و کۆششی لە خزمەتی خوادایە.

هەر کەسێ ئەوە سیفەتی بێت کۆکردنەوەی سامان و تێکەڵاویی خەڵك و چێژوەرگرتن لە ئارەزووەکان هەڵنابژێرێ، چونکە یان ئەوەتا لە ناسیندا کەمتەرخەم دەبێ، ڕوو دەکاتە خواپەرستیی پەتی، واز لە دونیای فانی دێنێ بۆ ئەوەی ئاخیرەتی باقی وەدەست بێنێ. یان زەوقی لە ناسیندا هەیە، بە خاوەنی هەمووان بێئاگایە لە هەمووان، دەبینی لە خەڵوەتیشدا لەگەڵیدا بەئەدەبە، بە لاڵانەوە لێی دڵخۆش دەبێ، لە تێکەڵبوون بە خەڵك هەست بە جاڕسی دەکات، بەوەی بۆی دێنێتە پێش ڕازییە.. ژیانی لەگەڵیدا وەکوو ژیانی ئەویندارێکە کە لەگەڵ دولبەرەکەیدا تەنیا بێت، جگە لەو کەسیتری ناوێت و لەو زیاتر بایەخ بە کەسی دیکە نادات.

بەلاٌم ئەوەی ئەم شتانەی پیٌ نەدرا بیٌت ئەوا هەمیشە لە خەم و پەژارە و ژیانی ناخۆش دایە، چونکە ئەوەی لە دونیا داوای دەکات توانای بەسەردا نییە، هەمیشە لە ئاخ و ئۆف و خەفەتدا دەمیٌنیٌتەوە هاوشان لەگەلٌ ئەوەی بە هۆی خراپی مامەلٌەوە لە ئاخیرەت لەدەستی دەچیٌت.

## ٢٤١- ژیان تەنێ لە بەهەشتدایە

بیرم لە نەفسی خۆم کردەوە، دیتم لە هەموو شتێکدا مایەپووچم!

ئەگەر پشتم بە هاوسەرەکەم بەست ئەوا بەو شێوەیە نییە کە دەمەوێ: ئەگەر شێوە و وێنەی جوان بوو ئەوا ڕەوشتی کامڵ نییە، ئەگەر ڕەوشتی تەواو بوو ئەوا مەبەستێکی هەیە و شتێکی لێم دەوێت نەك لەبەر من، ڕەنگە چاوەڕوانی کۆچکردنم بکات! ئەگەر پشتم بە منداڵ بەست هەروەهایە! خزمەتکار و موریدیش هەر وەتۆڤە، ئەگەر سوودێکیان لە من دەست نەکەوێت نەیاندەویستم! سەبارەت بە هاوڕێش ئەوا نییە! برایەکیش لەپێناو خودا بوونی نییە! ناسیاوەکانیش ئەهلی خێر لەدەست دەدەن و پێیان وایە نەماون!

ئیتر تەنیا مامەوە و گەڕامەوە لای خۆم... ئەویش بۆم دڵسۆز نییە و لەسەر بارێکی ساغ دانامەزرێ!

تەنها خودای پاك و بێگەرد مایەوە، دیتم ئەگەر پشتم بە چاکە و نیعمەتەکانی بەست ئەوە لە بەڵا خاترجەمم ناکات، ئەگەر ئومێدم بە لێخۆشبوونی بوو ئەوا لە سزای دڵنیا نابم!

مخابن! نه دڵنیایی هەیە و نە ئۆقرەیی! هاوار لە دەست نیگەرانیم لە نیگەرانیم! ئامان لە دەست سووتانم لە سووتانم!

سوێند بە خوا، ژیانی ڕاستەقینە تەنێ لە بەهەشتدایە، لەوێ باوەڕی تەواو بە خۆشنووی هەیە و ژیان لەگەڵ ئەو کەسانەی نە خیانەت دەکەن و نە ئازاریان هەیە. بەڵام دونیا شوێنی ئەوە نییە..

## ٢٤٢- وریایی لە هەموو شتێك پێویستە

پێویستە بۆ ئەو کەسەی هاوڕێیەتیی دەسەلاتدارێك دەکات ناوەوە و دەرەوەی لەگەڵیدا وەکیەك بێت، چونکە کەسێك دەکات بە سیخوڕ تا نهێنی بزانێ، ڕەنگە لەم تاقیکردنەوەیەدا ئاشکرا بێت و حەیای بچێت.

کۆمەڵێك لە پاشایان کە دەیانویست هاومەشرەبێك لە خۆیان نزیك بخەنەوە، لە ماڵیاندا ژوورێکیان بۆ تەرخان دەکرد، ئەگەر بیانویستایە تایبەتی خۆیان بکەن ئەوا لە ناوەوە تاقیان دەکردەوە بێ ئەوەی ئەو بزانێ، کە شتێکی نەشیاوی لێ دەردەکەوت و دەردەکرا!

وتم: کۆمەڵێك لە بەرپرسان خۆیان نەناس دەکرد و لەبارەی ڕەفتاری خۆیان لە ڕەشۆکییانیان دەپرسی، ڕەشۆکیش قسەی نەشیاوی دەوت، ئیتر دەیانگرتن. یان سیخوڕێکیان بەسەرەوە دادەنا.

ڕەنگە کەسێکی زۆربڵێ و زمانشڕ چەند وشەیەك لە زاری دەرپەڕێ، کەسێکی خۆهەڵقورتێن بیگەیەنێ، ئیتر خاوەنەکەی لەناوببات.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز یەکێك لە کاربەدەستەکانی بینی زۆر نوێژی دەکرد، کەسێکی بۆ نارد و کابرا پێی وت: ئەگەر فلان بەرپرسیارێتیم بۆ وەرگرتیت چیم پێ

دەدەی؟ وتی: ئەمە و ئەوەت دەدەمێ! عومەر پێی گوت: بە نوێژەکەت هەڵت خەڵەتاندین.

پێیان وتم: کە پیاوێك لەگەڵ ژنێك قسەی کرد، ژنەکەش وەڵامی دایەوە و بانگی ماڵەوەی کرد، کاتێ پیاوەکە چووە ژوورەوە ژنەکە کوشتی.

لەم بەسەرهاتەوە ڕوون دەبێتەوە کە نابێ لە قسەی ژن یان مێردێك دڵنیا بیت کە لەوانەیە سیخوڕ و تاقیکەرەوە بێت... هەروەها نابێ ئەوە ئاشکرا بکات کە پێویستە بشاردرێتەوە لە سامان یان مەزهەب یان جوێندان بە پیاوێك، ڕەنگە لەنێو ئامادەبوواندا خزم و نزیکێکی هەبێ... نابێ متمانە بە دۆستایەتی و خۆشەویستی کەسێك بکرێ کە ئەسڵ و بنەچەیەکی نییە، ڕەنگە لەژێرەوە ئۆینێکی هەبێ و مەبەستی زیانگەیاندن بێت.

لە ئەگەری هەموو شتێك وریابە... لەوانەیە وشەیەك هاوڕێیەك بۆ هاوڕێیەکی بگوازێتەوە، ئەویش بە کەسێکی بڵێ و هیچ مەبەستێکیشی نەبێ بۆ زیانگەیاندن بەڵام وشەکە بگاتە شوێنێك و زیان بە وێژەر بگات.. ڕەنگە کەسێك خۆشەویستیی زۆر و زیاد دەربڕێ تا دەگاتە مەبەستی خۆی.

زۆر زۆر لەوە وریا بن متمانە بە هەموو کەسێك بکەن و لێی خاترجەم بن، بەتایبەتی لە دوژمنێك کە ئازارت داوە، یان نزیکێکت لێی کوشتووە، ڕەنگە هەندێ ڕەفتاری جوان وەکوو تۆڕێك بۆ ڕاوکردنت پیشان بدات..

## ٢٤٣- سووربوون و هیوا

دیتم نەفس دوای بەتەمەنداچوون ئومێدی بەهێز و سووربوونی زیاد دەبێ، هەروەکوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((بنیادەم پیردەبێ و دوو سیفەتی لێ گەنج دەبێتەوە: سووربوون و هیوا)) (ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە لە هیچ کتێبێکی فەرموودەدا نییە بۆیە فەرموودەناسان بە هەڵبەستراوی دادەنێن بەڵام نزیك لەم واتایە لە بوخاری و موسلیمدا هەیە).

دیتم بەشی زۆری هۆکارەکانی ئەوە، دەسبەتاڵیی لە دونیا و زۆری خاووخێزان و بەهێزیی پێویستییە، مرۆڤ پێویستی بەوە دەبێ بۆ وەدەسهێنانی مەبەست و ئامانج ڕووبەڕووی شتگەلێك ببێتەوە کە عەیبداری دەکەن!

وتم: خودایە! ئایا دوای دیتنی چیاکانی عەرەفە گومڕێ دەبم؟! ئایا دوای نزیکبوونەوە و دەرکەوتنی حەرەم ئەعرابی بیابان دەمڕفێنن؟ ئەفسووس! ئایا سپێدەی جەژن دێت و من هێشتا نەگەیشتووم بە عەرەفات؟! ئای لە بەفیڕۆچوونی گەشتی تەمەن و مەبەستیش نەهاتۆتەدی!

قد كنتُ أرجوكَ لنيلِ المُنى	واليوم لا أطلبُ إلا الرضى

پێشتر بۆ وەدەسهێنانی ئاواتەکانم لێت دەپاڕامەوە، کەچی ئەمڕۆ تەنها داوای ڕازیبوون دەکەم.

پاشان وتم: ئەی نەفس! هیچ پەنایەکت نییە تەنها پەنابردن بۆ خودا نەبێ و چەشنی نقوومبوویەك داوای فریاکەوتنی لێ بکەیت، ئەگەر ڕەحمت پێ کرا باشە وەگەرنا چەندان کەس بە حەسرەتەوە چوونە ژێر خاکەوە!

## ٢٤٤- پیرە پیاو و کچی گەنج

هەندێ لە پیرەکان سکالاّیان لە کن کردم، وتی: تەمەنم هەڵکشاوە و هێزم سست بووە و نەفسم داوای کڕینی کەنیزەکی بچووکم لێ دەکات، دیاریشە کە ئەوان (سەرجێی)یان دەوێت و منیش پێم نەماوە، نەفسیشم بە ژنی ماڵەوە قایل نابێ چونکە گەورە بووە.

وتم: دوو وەڵامم هەیە:

یەکەم: وەڵامی ڕەشۆکی، ئەویش ئەوەیە کە بڵێم: پێویستە بە یادی مردن و ئەوەی بۆی دەچیت مەشغوول بیت و وریا بیت لە کڕینی کەنیزەکێك کە ناتوانی مافی خۆی پێ بدەیت چونکە دەتبوغزێنێ، ئەگەریش خۆت ماندوو کرد ئەوا زوو خۆت دەفەوتێنیت، ئەگەر هێز و وزەت هێشتەوە و خەرجت نەکرد ئەوا ئەو تووڕە دەبێ، ئیتر ئەو پیر هەرچۆنێك بێت نایەوێت.

أفق يا فؤادي من غرامك واستمع ... مقالة محزون عليك شفيق
علقت فتاة قلبها متعلق ... بغيرك فاستوثقت غير وثيق
وأصبحت موثوقاً وراحت طليقة ... فكم بين موثوق وبين طليق

ئەی دڵەکەم لە ئەوینەکەت بێداربەوە و گوێ لە قسەیەك بگرە کە بۆت خەمبارە و بەزەیی پێتدا دێتەوە..کچێکت خۆشدەوێ کە دڵی بە غەیری تۆوە پەیوەستە،

متمانەت بە کەسێکی بێ متمانە کردووە، تۆ کۆتوبەندکراویت و ئەو ئازادە، چەندە جیاوازی زۆرە لەنێوان کۆتوبەندکراو و ئازاد!

بزانە ئەو ڕۆژەکان دەژمێرێ و داوای زێدەماڵت لێ دەکات بۆ ئەوەی خۆی بۆ غەیری تۆ ئامادە بکات، ڕەنگە بەتەمای کوشتنت بێت، بۆیە وریابە! سەلامەتی لە وازهێنان و قەناعەتکردن بەوەی هەیە دایە.

وەڵامی دووەم: من دەڵێم: ڕەنگە هەندێ کات توانای پەڕینت هەبێ و هەندێ کات نەتبێ. ئەگەر تۆ ناتوانیت ئەوا باشترە لەسەر وازهێنان لە هەموان ئارام بگریت، ئەگەرچی کەسی خاوەن بڕیار و یەکلاکەرەوە دەتوانێ بە خەرجی و ڕەوشتی جوانەوە موداراتی ژن بکات بەڵام ئەوەش هەر سەرکێشی و خۆ خستنە مەترسییە.

ئەگەر تۆ لە هەندێ کات ئەوە دەتوانیت بکەیت و لە نەفستدا ئارەزوویەکی زۆرت هەبوو ئەوا کچانی هەرزەکاری نەسمراو بێنە چونکە ئەوان هێشتا (سەرجێی)یان نەزانیوە و داوای جووتبوونیشیان نەکردووە، بە خەرجی و ڕەوشتی جوان دایانپۆشە لەگەڵ ئاگاداربوون و ڕێگریکردن لەوەی تێکەڵی ژنان بن، ئەگەریش لێیان پەڕیت ئەوا ئاوەکەت تێ مەکە تا ئەویش ڕەحەت دەبێ! بەردەوام ئامۆژگاری بکە و ئاخیرەتی بیربخەوە! چیرۆکی ئەو عاشقانەی بۆ بگێڕەوە کە جووتبوون لەنێوانیاندا نەبووە، وە باسی ناشیرینیی وێنە و شێوەی پەڕینی بۆ بکە! دڵی بەرەو لای باسی پیاوچاکان ڕاکێشە! بێئاگاش مەبە لە بۆنخۆشی و ڕازاندنەوە و زیرەکی و مودارات و زۆر خەرجکردن! ڕەنگە ئەوە لەگەڵ مەترسیی سەلامەتی، ژنەکەت بۆ ڕام بکات و جڵەی بگرێ..

## ٢٤٥- وریایی لە سەرەنجامی کارەکان

گەمژەترین خەڵك ئەو کەسەیە کە کار لەسەر حاڵی حازر بکات و وێنای گۆڕان و ئەگەری ڕوودانی پێشهاتی نوێ نەکات.

نموونە: بە دەسەڵات و دەوڵەت لەخۆبایی و دەسخەڕۆ بێت و بەپێی موڵك و دەسەڵاتی کار بکات کە ئەگەر گۆڕا لەناوبچێت! ڕەنگە بە هەوا و فیزی دەسەڵاتدارییەوە دژایەتیی خەڵکێك بکات کە ئەگەر حاڵی گۆڕا پەنجەی پەشیمانی بگەزێت لەوەی بۆی قەرەبوو ناکرێتەوە! هەروەها ئەو کەسەی ماڵ و سامانی هەبێت و تەخشان و پەخشانی بکات بە خاترجەمی ئەوەی سەروەت و سامانی هەیە و حاڵوباری لە کاتی نەبوونیدا لەبیربچێت! ئەوەی سەرگەرمی ئارەزووەکانە و زۆر دەخوات و دەخواتەوە و دەپەڕێ و متمانەی بە لەشساغی خۆی هەیە و ئەو نەخۆشی و دەردانەی لەبیردەچێت کە دوای ئەوە دێن!

لە سەیرترین حاڵەتەکان ئەوەیە کەنیزەکەکەی خۆش بوێت و ئازادی بکات و پێی ببەخشێ، یان ئارام لە کن ژنەکەی بگرێ و پێی ببەخشێ و زاڵ ببێت، کەچی ڕۆژگار تێپەڕێ و بەجێی بێڵێت یان بەدوایدا پیاوی تردا بچێت، ئەویش هیچ ڕێگایەکی ڕزگاربوونی نییە، ئەگەر دەسبەرداری بوو

ئـەوا ئـەوەی دەسـتی کـەوتووە لێـی ببـات، ئـیتر چـەند قـاتی ئەوەنـدەی چێژی لێ وەرگرتووە بیبات.

نـابێ نـە متمانـە بـە ژن بکـات نـە بـە خۆشەویسـتیی مـرۆڤ! چـونکە ڕەنگـە پیـاو ژنێکـی خـوش بوێـت و پێـی وایـە هـەرگیز بـەجێی نایـەڵێت، ئـیتر متمانـەی پـێ دەکـات و لەگەڵیـدا کـراوە دەبێـت، پاشـان دابـڕان و بەجێهێشـتن ڕوودەدات، ڕەنگــە یــەکێکی تــری خۆشــبوێت و ژنــی یەکــەمی بیردەچــێتەوە و ناشـتوانێ لێـی ڕزگـار بێـت! کەسـی ژێـر ناچـێتە نێـو شـتێکەوە تـا خـۆی بـۆ دەرچـوون لێـی ئامـادە نـەکات، چـونکە شـتەکان جـێگیر نـابن، خۆشەویسـتیش بەردەوام نابێ، گۆڕانیش پەیوەستە بە هەموو حاڵێکەوە.

هـەروەها مـرۆڤ مـاڵ و سـامانەکەی دەدات بـە کوڕەکـەی، پاشـان دەبێتـە بـار بــە ســەریەوە، کوڕەکــە خۆزگــەی مردنــی دەخــوازێ، ڕەنگــە لــە خــەرجی لێکردنیدا ڕەزیلی بکات.

هـەروەها متمانـە بـە هاوڕێیـەك دەکـات و نهێنییـەکانی خـۆی پـێ دەڵـێ، ڕەنگـە لێی ئاشکرا بکات و شتی وای تێدابێ ببێتە هۆی لەناوچوونی.

هــەروەها مــرۆڤ بــە ســاغ و ســەلامەتیی خــۆی هەڵدەخەڵــەتێ و لــەدەرگادانی مردنــی لەبیردەچــێ و لــەناکاو بــۆی دێــت و حەپەســاوی دەکــات، ئــیتر کــاتی قەرەبووکردنەوەشی لەدەست چووە و تەنها پەشیمانی ماوە.

عاقڵ ئـەو کەسـەیە کـە چـاوی چـاودێری سـەرەنجامەکانە و خـۆی دەپـارێزێ لـەوەی ئەگـەری ڕوودانـی هەیـە و لـە هـەموو بارێکـدا کـار بـە خۆپـارێزی دەکـات و مـاڵ و نهێنیـی خـۆی دەپـارێزێ، متمانـەی نـە بـە ژن هەیـە نـە بـە منـداڵ و نـە بە هاوڕێ، خۆی بۆ کۆچکردن ئامادە دەکات.

## ٢٤٥- سەلامەتی لە تەسلیمبووندایە

لە سەیرترین شتەکان خواستی ئاگاداربوونە لەسەر هێنانەدی ناسینی زاتی خودا و سیفەت و کردارەکانی! ئەمە زۆر دوورە، تەنها ناسینی کورت و پوخت و گشتی هەیە.

موتەکەللیمەکان لەوەدا ڕۆچوون بەڵام هیچیان دەست نەکەوت، بۆیە ژیرەکانیان گەڕانەوە بۆ تەسلیمبوون.

هەروەها خاوەن ڕاوبۆچوونەکان، بەرەو لای قیاس شکاندیانەوە، شتگەلێکی زۆر پێچەوانەی مەبەستیان بوو، ئیتر جگە لە تەسلیمبوون هیچ پەناگەیەکی تریان دەست نەکەوت، ئەوەی پێچەوانەی ڕای وان بوو ناویان لێنا وازهێنان لە قیاس و ئەوەی بۆ خەڵك باشترە (استحسان).

زانای تێگەیشتوو ئەو کەسەیە کە تا بتوانێ هۆکارەکە ڕوون دەکاتەوە و بە بەڵگەوە دەیسەلمێنێ، ئەگەریش نەیتوانی ئەوا تەسلیم دەبێ...ئەمە کاری بەندەیە.

وەلێ ئەوەی دەڵێ: بۆ ئەوەی کرد؟ واتای ئەوە چییە؟ ئەوە داوای ئاگاداربوون لە نهێنیی پاشا دەکات و هیچ ڕێگایەکیشی بۆ ئەوە دەست ناکەوێت لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: خوای گەورە زۆرێك لە حیکمەتەکانی لە خەڵق شاردۆتەوە.

دووەم: لە توانای مرۆڤدا نییە پەی بە هەموو حیکمەتەکانی خودا ببات.

ئیتر رەخنـەگر تـەنها رەخنـەگرتنی بـۆ دەمێنێتـەوە کـە بـەرەو بێبـاوەڕی دەبـات: ﴿وَالْآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ﴾ (الحـــج: ١٥) واتە: هەر کەسێك بە کردارەکانم ڕازییە باشە وەگەرنا با خۆی بخنکێنێ، چونکە من تەنها ئەوە دەکەم کە گەرەکمە.

## ٢٤٦- دابڕان له زۆربەی خەڵك

هەر کەسێك خودا زانست و سەیرکردنی ژیاننامەی پێشینانی پێ بەخشی، وا دەبینێ کە ئەم جیهانە لە تاریکیدایە و زۆربەی خەڵکیش لەسەر ڕاستەڕێ نین و، تێکەڵبوونیان زیانی هەیە و سوودی نییە !

سەیر ئەو کەسەیە کە لە تێکەڵبوون شلڕەوی دەکات و دەشزانێ کە سروشتی مرۆڤ چەشنی دز وایە، خوو لەو کەسە دەدزێ کە تێکەڵی دەبێ!

بەڵکوو پێویستە تێکەڵیی لەگەڵ ئەو کەسانە بکرێ کە لە زانست و کردەوە بەرزتر و بالاترن تا سوودیان لێ وەربگیرێت، بەڵام تێکەڵبوونی نزمەکان مایەی ئازارە مەگەر ڕەشۆکییەکی وەها بێت کە لە مامۆستاکەی شت وەربگرێت، ئەوساش هەر پێویست بە وریایی و پارێزیی دەکات.

لەم سەردەمەدا:

ئەگەر تێکەڵبوون لەگەڵ ڕەشۆکییان ڕوویدا دڵ لێڵ و وێڵ دەبێ چونکە ئەوان تاریکاییەکی نووتەکن، ئەگەر زانا گرفتاری تێکەڵاوییان بوو ئەوا با وریا و بەپارێز بێت، هاونشینی لەگەڵیان تەنها بۆ ئامۆژگاری و پەروەردەکردن بێت.

ئەگەر تێکەڵبوون لەگەڵ زانایان ڕوویدا ئەوا زۆربەیان لەسەر ڕاستەڕێ نین، مەبەستیان شێوەی زانستە نەك کارپێکردنی، بە دەگمەن نەبێ نابینی باسی ئاخیرەت بکەن، کاریان تەنێ غەیبەت و نیازی زاڵبوون و وەدەسهێنانی دونیایە، پاشان ئەوەندە ئێرەیی و حەسوودیان بۆ هاوشێوەکانیان تێدایە کە وەسف ناکرێ!

ئەگەر تێکەلاوی لەگەڵ کاربەدەستان ڕوویدا ئەوا دین تووشی تێکچوون و خراپبوون دەبێ، چونکە ئەگەر دەسەلاتێکی دونیاییت لێیان وەرگرت ئەوا ستەم لە پێویستییەکانێتی بە هۆی زاڵبوونی عادەت بەسەریانەوە و پشتکردنە شەرع. ئەگەر دەسەلاتێکی دینی بێت وەکوو دادوەری ئەوا فەرمانی بە شتگەلێك پێ دەکەن کە ناکرێ لەبارەیەوە گفتوگۆ و مشتومڕ بکات، ئەگەریش مشتومڕی کرد قەبووڵ ناکەن، زۆربەی دادوەرەکانیش لەوە دەترسن پۆستەکانیان لەدەست بدەن بۆیە ئەوەی فەرمانیان پێ بکرێ دەیکەن ئەگەر جائیزیش نەبێ.

ڕەنگە لەم سەردەمەدا کەسانێك ببینی کە ماڵ و سامان دەبەخشن بۆ ئەوەی ببن بە دادوەر یان شایەت و مەبەستیشیان پلەبەرزبوونەوەیە.

پاشان زۆربەی شایەتەکان شایەتی لەسەر یەکێك دەدات کە نایناسێت و دەڵێ: ئەو ناسراوە! دەشزانێ کە درۆزنە! لەپێناو شتێك کە پێی دراوە لای ناسراو بووە!

ئەگەر تێکەڵیی لەگەڵ خۆبەزاهیدزانان ڕوویدا ئەوا زۆربەیان لەسەر ڕاستەڕێ نین، بە پێچەوانەی زانستەوە یاسا و نهێنییان بۆ خۆیان داناوە و ناچنە دەرەوە و ناچنە

بازاڕ و خشووع و سەرکزیی زیاد دەردەخەن و هەمووشی دووڕووییە..هەیانە لەژێر جلکەکانییەوە، جلکی خوری لەبەر دەکات، ڕەنگە سەردەستی خورییەکە دەربێنێ تا ببیندرێت!

گێڕدراوەتەوە کە تاهیر کوڕی حوسەین بە زاهیدێکی وت: لە کەیەوە هاتوویتە عێراق؟ وتوویە: ماوەی بیست ساڵە هاتووم و سی ساڵیشە بەڕۆژووم!! تاهیر وتوویە: لە یەك شت پرسیارمان لێ کردیت تۆ وەڵامی دووانت دایەوە.

سۆفییەکان خانەقایان دروست کردووە کە شوێنێکە لە دەرەوەی مزگەوت، کە بریتییە لە چەند ژوورێکی بۆنناخۆش، تەنبەڵ و ئەوانەی کارناکەن و تواناشیان هەیە لەوێ دادەنیشن و چاوەڕێی خێرپێکردن و صەدەقات و باربووی ستەمکاران دەکەن، بایەخ بە زانست و دووبارەکردنەوەی نادەن، زۆربەیان نە نوێژی سوننەت دەکەن و نە شەونوێژ، بەڵکوو تەنها خەمیان خواردن و خواردنەوە و سەمایە!

هەندێ ڕەوشتیان هەیە پێچەوانەی شەریعەت: شمەکی پینەدار لەبەردەکەن نەك لەبەر هەژاری، ئەمەش ناشیرینە چونکە هیچ نیشانەیەکی زوهدیان نییە جگە لە پۆشاکی خراپ، جلکەکانیان هاوار دەکات: ئێمە زاهیدین! هەموو کردەوە شاراوەکانی تریان ئەگەر ئاشکرا بێت حەیایان دەبات!! بەردەوام ناندین و گەرماویان گەرمە، شیرینی و شتی خۆش و ئیسراحەت مشەیە، بەو پۆشاکەش ترزلی هاتۆتەدی!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) به (مـالیكی كـوڕی نەزلـە) كـە شـڕ و شـەپڕێو بـوو فەرمووی: ((ئەتوو ماڵ و سامانت نییه؟)) وتی: بـا، لـە هـەموو جـۆرە ماڵێـك خـودا پێی داوم. فەرمووی: ((خوای گەورە ئەگەر نیعمەتێكی به بەندەكەی بەخشـی پێـی خۆشه شوێنەواری ئـەو نیعمەتـە بەسـەریەوە ببینـێ)) صـەحیح، ئەحمـەد و ئـەبوو داوود و تیرمیزی و نەسائی گێڕاویتیانەوە.

یەكێك لە ئاكارەكانی زاهیدەكان تەرەكردن و دوورخستنەوەی خەڵكـە لـە زانسـت و پێیان وایە كه پێویست به هۆكارەكان ناكات، بەڵكوو تەنێ دڵ و خودا (قلـب و رب) بەسە!

قسـە و كـردەوەی قێزەونـی زۆریـان هەیـە كـە لـە كتێبـی (تلبـیس إبلـیس)دا باسـم كردوون.

ئای ئەگەر عومەرێك بۆ ئـەم سـەردەمە دەبـوو، هـەموو ڕۆژێـك پێویسـتی بـە سـەت گۆپاڵ دەبوو! نا، بەڵكوو شمشێری لەم خەواریجانە بەكاردەهێنا!

هـەر كەسـێك خـودا سـەیركردنی ژیاننامـەی پێشـینانی پـێ بەخشـی و یارمـەتی دا شوێنپێیان هەڵبگرێت ئەوا دابڕان و گۆشەگیربوون لە زۆربـەی خـەڵك هەڵدەبـژێرێ و تێكەڵیان نابێت، چونكە هەر یەكێك تێكەڵاوی خەڵك بێـت ئـازاری پـێ دەگـات، هـەر كەسـێك مـودارات بكـات لـە نـەرمی نوانـدن و شـلڕەوی سـەلامەت نابێـت، ئـەمڕۆ ئامۆژگاریكردن ڕەتكراوەیە.

## ٢٤٧- خۆپاراستن لە نەیار

گەمژەییە دەسپێشخەری بکەیت لە دوژمنایەتیی نەیار یان حەسوودێك. بەڵکوو پێویستە ئەگەر حاڵیت زانی ڕەفتاری وا دەربخەیت کە دەبێتە هۆی سەلامەتیی نێوانتان، ئەگەر پۆزشی هێنایەوە قەبووڵیکە، ئەگەر دەستی بە دوژمنایەتی کرد چاوپۆشی لێ بکە، کە پیشانت دا بابەتەکە نزیکە، پاشان لە دڵەوە لێی وریا بێت ، یەکسەر متمانەی پێ نەکات، لە ناخەوە خۆی لێ بەدوور بگرێت، واش دەربخات کە لە ڕواڵەتدا تێکەڵە.

ئەگەر ویستت ئازاری بدەیت ئەوا یەکەم شتێك کە ئازاری پێ بدەیت چاکبوون و هەوڵدانتە بۆ شتێك کە بەرزت دەکاتەوە. گەورەترین سزاش لێخۆشبوونیەتی لەپێناو خودا.

ئەگەر لە جنێودان زیادەڕەوی کرد ئەوا تۆش لە چاوپۆشین زیادەڕەوی بکە، ڕەشۆکییان لەجیاتی تۆ جنێوی پێ دەدەن، زانایانیش لەسەر لەسەرخۆیی و هێمنیت ستایشت دەکەن! ئەوەی بەوە ئازاری دەدەیت و خەفەتخانی دەکەیت چەندان هێندە زیاترە لەوەی بە وشەیەك ئازاری دەدەیت کە ئەگەر پێت وت چەندان قات لێی دەبیستیەوە.

پاشان بە دژایەتی پێی ڕادەگەیەنیت کە تۆ دوژمنی ئەویت، ئیتر لێت وریا دەبێ و زمانی درێژ دەکات، بە چاوپۆشین نازانێ چی لە ناختدایە، ئەو کات دەتوانی کۆڵی خۆتی پێ دەرکەیت، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیەی ئازاری دینەکەت دەدات ڕووبەڕووی بیتەوە ئەوا ئەو کۆڵی خۆی پێ دەرکردوویت! هەر کەسێك گوناه زەفەری پێ بردبێت هەرگیز سەرکەوتوو نەبووە، بەڵکوو بە چاوپۆشینی جوان سەرکەوتوو دەبێ.

بەڵکوو ئەمە دەکەوێتە سەر ئەوەی کە زاڵکردنی بەسەریدا یان سزای گوناهێکە یان بۆ بەرزکردنەوەی پلەیە یان بۆ تاقیکردنەوەیە، ئەو دوژمنەکە نابینێ بەڵکوو تواناکە دەبینێ.

## ٢٤٨- خێر لەوەدایە کە خودا بۆت هەڵدەبژێرێت

ئەگەر تووشی مەینەتی و تاقیکردنەوەیەك بوویت کە ڕزگاربوون لێی زەحمەت بوو ئەوا دوای تەوبەکردن لە گوناهەکان هیچ ڕێگایەکت لە بەردەمدا نییە جگە لە نزا و پەنابردن بۆ خودا، چونکە هەڵە و تاوان دەبێتە هۆی سزادان، ئەگەر بە تەوبەکردن هەڵە و تاوانەکان نەمان ئەوا هۆکارەکە نامێنێ.

ئەگەر تەوبەت کرد و هیچ شوێنەوارێکی گیرابوونت نەدیت ئەوا سۆراغی کاری خۆت بکە ڕەنگە تەوبەکەت ڕاست و دروست نەبووبێت بۆیە ڕاستی بکەوە، پاشان بپاڕێوە و نزا بکە و لە دوعا بێزار مەبە، ڕەنگە بەرژەوەند لە دواخستنی گیرابوونەکەدا بێت، ڕەنگە بەرژەوەند لە گیرابووندا نەبووبێت، تۆ پاداشتی خۆت وەردەگریت و بۆ سوودەکانت وەڵامت دەدرێتەوە، یەکێك لە سوودەکانت ئەوەیە کە ئەوەی داوات کردووە پێت نەدرێت، بەڵکوو بە شتی تر قەرەبوو بکرێیتەوە.

ئەگەر ئیبلیس هاتە بن کلێشەت و وتی: ئەوە چەند لە خوا دەپاڕێیتەوە و هیچ وەڵامدانەوەیەك نابینی! بڵێ: من بە دوعا خواپەرستی دەکەم و من دڵنیام کە وەڵامەکە هاتۆتەدی بەڵام ڕەنگە دواکەوتنەکەی بە هۆی هەندێ بەرژەوەندەوەیە کە بۆ من گونجاوە، ئەگەر نەیەتەدیش ئەوا خۆ خواپەرستی و ملکەچیی بۆ خودا هاتۆتەدی.

ئامان داوای هەر شتێکت کرد ئیللا بیبەستەوە بە داوای هەڵبژاردن(واتە بڵێ خودایە تۆ سەرپشك بە چی بۆ من باشە ئەوم بۆ بێنەدی) ڕەنگە شتێك کە لە دونیا داوات کردووە هاتنەدی هۆکارێك بێت بۆ لەناوچوون.

ئەگەر تۆ لە کاروباری دونیادا فەرمانت پێ کرابێت ڕاوێژ بە هاونشینەکەت بکەیت کە لەبارەی هەندێ بابەت ڕاوبۆچوونی خۆیت پێ بڵێ کە پێت وایە خۆت ناتوانی چارەسەری بکەیت و ئەوەی بۆت هاتۆتە پێش گونجاو نییە، ئەی چۆن داوای خێر و چاکە لە خودا ناکەیت کە ئەو لە هەموان زیاتر بەرژەوەندەکان دەزانێ؟! داوای خێرکردن (الاستخارة) لە بابەتی باشی و جوانیی ڕاوێژپێکردنە.

## ٢٤٩- جۆرەكانى خەڵك

سەيرى خەڵكم كرد ديتم لە نێوان زانا و نەزان دابەش بوون:

- سەبارەت بە نەزانان دابەش بوون بۆ:

هەيانە دەسەڵاتدارە، لەنێو نەزانى و پۆشينى ئاوريشم و مەيخواردنەوە و ستەمكردن لە خەڵك پەروەردە كراوە، كۆمەڵێك داردەست و خزمەتكارى وەكوو حاڵى خۆى هەيە، ئەمانە بە گشتى لە خێر و چاكە دوورن.

هەيانە بازرگانە، هەموو خەم و هەوڵێكيان وەدەسهێنان و كۆكردنەوەى پارەيە، زۆربەشيان زەكات نادەن و خۆى لە سوو ناپارێزن، ئەمانە خەڵكێكى ڕووكەشن.

هەيانە لە بازاڕ كار دەكات و خەريكى پەيداكردنى بژيويە، لە كێش و تەرازوو كەم دەكەن و فێڵ لە خەڵك دەكەن و سەودا بە سوووەوە دەكەن، بە درێژاييى ڕۆژ لە بازاڕن، تەنها خەمى پارە پەيداكردنيانە، كە شەو دادێ وەكوو سەرخۆشان لێى دەخەون، هەموو هەوڵ و خەمێكيان خواردن و چێژوەرگرتنە، باسوخواسى نوێژ لە كنيان نييە، ئەگەر يەكێكيان نوێژى كرد ئەوا بەخێرايى لە كۆڵ خۆى دەكاتەوە يان كۆيان دەكاتەوە، ئەمانە لە ڕيزى ئاژەڵانن.

هەیانە بەدوای چێژ و خۆشییەکاندا وێڵە و داهاتەکەی بەشی ناکات بۆیە دەست بە کاری ڕێگری و چەتەیی دەکات! ئەمانە دەبەنگترین خەڵکن، چونکە ژیانیان نییە، ئەگەر بە خواردن یان خواردنەوە ساتێك چێژ ببینن ئەوا ئەگەر با پوشێك بجووڵێنێ دەتۆقن و لە ترسی دەسەڵاتدار ڕادەکەن، زۆر کەمیش دەمێننەوە، پاشان دەکوژرێن و لە خاچ دەدرێن، لەگەڵ گوناهی ئاخیرەتیش.

هەروەها دیتم ژنانیش دابەش دەبن: هەیانە جوان و بەدڕەوشتە، هەیانە لە پارەوپووڵ ناپاکی لە هاوسەرەکەی دەکات، هەیانە نوێژ ناکات و هیچ شتێك لەبارەی ئایینەوە نازانێ، ئەمانە دەستەچیلەی ئاگرن، ئەگەر گوێیان لە ئامۆژگارییەك بوو وەکوو ئەوە وایە بە لای بەردێك تێپەڕن! ئەگەر لە لایان قورئان بخوێنرێت دەڵێی گوێ لە کۆڕ و دەمەتەقێی شەوانە ڕادەگرن!!

— سەبارەت بە زانایان:

سەرەتاکانیان — ئەوانەی تازە دەست بە زانست دەکەن — دابەش دەبن بۆ خاوەن نیازی چەپەڵ، مەبەستی لە وەدەسهێنانی زانست بەخۆنازینە نەك کارکردن و مەیلی بە لای بەدکارییە بەو گومانەی زانست بەرگری لێ دەکات، نەخێر بەڵکوو دەبێتە بەڵگەیەك لە دژی.

بەڵام مامناوەند و بەناوبانگەکانیان زۆربەیان هاموشۆی دەسەڵاتداران دەکەن و لە بەرانبەر ئینکاری خراپە و مونکەردا بێدەنگ دەبن. کەمێك لە زانایان نیازیان ساغ و مەبەستیان باشە.

گەر خودا خێری بۆ هەر کەسێك بوێت ئەوا لە زانستخوازیدا نیازی باش و دروستی پێ دەدات، بۆ سوودی خۆی و خەڵك وەدەستی دێنێ، هەر کارێك زانست پێی نیشان بدات دەیکات و باکی بە هیچ نییە، دەبینی لە دونیاویستان دووردەکەوێتەوە و لە تێکەڵبوونی ڕەشۆکییان وریایە و بە کەم قایل دەبێ لە ترسی ئەوەی نەوەك بە وەدەستهێنانی زۆر تووشی مەترسی ببێت، دابڕان و کەنارگیری هەڵدەبژێرێ، هیچ کەس وەکوو وی ئاخیرەت بە بیر خەڵك ناهێنێتەوە.

بۆ زانا هیچ شتێك هێندەی ئەوە زیانبەخش نییە کە بچێتە لای دەسەڵاتداران، ئەمە دونیا لەبەر چاوی زانا جوان دەکات و خراپەی لە کن سووك و سادە دەکات، ڕەنگە بیەوێت نکووڵی لە خراپەیەك بکات بەڵام بۆی ناکرێ!

ئەگەر قەناعەتی نەبوو و لە داواکردنی زێدەی دونیا نەفسی بەسەریدا زاڵ بوو ئەوا کۆتایی پێ هاتووە و کەوتۆتە نێو چاڵەوە، چونکە گرفتاری سەرچاوەکانی دونیا دەبێ. مرۆڤ سەعاتێك بەناو بازاڕدا دەخولێتەوە بەوەی دەیبینێ ئەوەی دەیزانێ بیری دەچێتەوە! ئەی چۆن و چی لێ دێ ئەگەر لەپاڵ ئەوە هاموشۆی دەوڵەمەندان بکات و تەما و چاوی لە ماڵیان بێت؟!

سەبارەت بە تەنیایی ئەوا هۆکاری گەڕانەوەی دڵ و خاترجەمی و سەرنجدانی سەرەنجامەکان و خۆئامادەکردن بۆ کۆچکردن و وەدەستهێنانی توێشووە، ئەگەر قەناعەتیشی هاتەپاڵەوە ئەوا هەموو حاڵوبارە باش و جوانەکان دەهێنێتە پێشەوە.

ئەمڕۆ بۆ هاونشینی و هاوکۆڕی تەنێ کتێبێك باش و شیاوە کە باسی نهێنییەکانی پێشینان (السلف)ت بۆ بکات، بەڵام هاونشینی و دانیشتن لەگەڵ زانایان ئەوا مەترسیدار و سەرکێشییە، چوون زۆربەی کات لەسەر یاد و باسی ئاخیرەت گردنابنەوە! هاونشینیی ڕەشۆکییانیش فیتنەیە بۆ دین مەگەر لە کۆڕ و مەجلیسیان بەپارێز بیت و ڕێگەی قسەکردنیان نەدەیت، ئەو قسە بکات و تۆ گوێ بگریت! پاشان دەبێ ساز و تەیار بیت بۆ ئەوەی لێیان دوورکەویتەوە.

دابڕانی گشتی و هەمووەکی ناکرێ تەنها بە تەمابڕین نەبێ، تەماش نابڕێ مەگەر بە قەناعەتکردن بە کەم یان بازرگانییەك بکات، یان زەوییەکی هەبێ سوودی لێ وەربگرێت، چونکە هەر کاتێ ئاتاج بێت بیر و هزری پەرتوبڵاو دەبێ، هەر کاتێ زانا لە خەڵك دابڕا و تەمای لێ بڕین و خۆی بۆ یادی ئاخیرەت تەرخان کرد ئەوا ئەو کەسە سوود وەردەگرێ و سوودی لێ وەردەگیرێ.

## ٢٥٠- بە زانست و کردەوە بەهەشت بەدەست دێت

هەر کەسێ بە بیرێکی قووڵەوە لە بەردەوامیی مانەوە لە بەهەشت ڕابمێنێ کە لە سازگارییەکی بێ لێڵی و چێژی بێ بڕانەوە و گەیشتن بە هەموو خواستێکی نەفس و زیادەی هەموو ئەو شتانەی نە چاو بینیویەتی و نە گوێ بیستوویەتی و نە بە سەر دڵی مرۆڤدا هاتووە، بێ گۆڕان و نەمان دەژی..کە ناوترێ: هەزار هەزار ساڵ و سەد هەزار هەزار ساڵ، بەڵکوو ئەگەر مرۆڤ هەزاران هەزار ساڵ بژمێرێ ژمارەکان تەواو دەبن و کۆتایی دەبێت، بەڵام مانەوەی ئاخیرەت کۆتایی و تەواوبوونی نییە. بەڵام ئەوە نایەتەدی ئیللا بە جیاکردنەوە و لەبێژینگدانی ئەم تەمەنە نەبێت.

ئەمە چ تەمەنێکە کە ئەوپەڕەکەی سەت ساڵێکە: پازدە ساڵی یاری و نەفامییە، سی ساڵی دوای حەفتا – ئەگەر بێتەدی – لاوازی و دەستەپاچەییە، ناوەندیش نیوەی نووستنە، هەندێکیشی کاتی خواردن و خواردنەوە و ئیشکردنە، ئەوەی بۆ پەرستشەکان دەمێنێتەوە شتێکی کەمە؟!

ئایا ئەو بەردەوامە بەم کەمە ناکڕدرێ؟!

پشتکردن لە دەستکردن بەم کڕین و فرۆشتنە لاوازییەکی زەق و گەورەیە لە عەقڵ و کەموکورتییەکە لە باوەڕبوون بە بەڵێن.

ئەوەی دەزانێ چۆن بە زانینەوە فرۆشتن دادەمەزرێ هەر ئەویش ڕێگاکە پیشان دەدات و ئەوەی بۆی باشە دیاری دەکات و وریایی لە ڕێگرییەکانی دەدات.

ئیبلیس بە ئافەتگەلێکەوە چووە لای کۆمەڵێك لە زاهیدان، گەورەترین ئافەت ئەوە بووە لە زانست دووری خستنەوە وەك ئەوەی دەستی کرد بە کوژاندنەوەی چرا بۆ ئەوەی لە تاریکیدا دزی بکات، تەنانەت هەندێ لە گەورەزانایانی گیرۆدە کرد و تووشی هەندێ ڕەفتاری وای کردن کە زانست نەهی لێ دەکات.

(ئەبوو حامیدی طوسی – ئیمامی غەزالی) لە یەکێك لە کتێبەکانیدا دەڵێ: لەبارەی بەردەوامبوون لەسەر خوێندنەوەی قورئان ڕاوێژم بە پێشەوایەکی گەورەی صۆفییەکان کرد؟ ڕێگری لێ کردم و وتی: ڕێگای ڕاست ئەوەیە بەتەواوی هەموو پەیوەندییەکانت بە دونیاوە بپچڕێنیت بە جۆرێك دڵت ئاوڕ نەداتەوە بە لای ژن و منداڵ و ماڵ و زانست، بەڵکوو بچیتە حاڵەتێکەوە بوون و نەبوونی ئەوە لە لات وەکیەك بێت، پاشان لە گۆشەیەکدا تەنها بیت و تەنها خەریکی پەرستشە فەرز و سوننەتەکان بیت و بەدڵی خاڵییەوە دانیشیت و هەر بڵێیت: الله، الله....تا دەگەیتە حاڵەتێك کە ئەگەر زمان جوڵاندنت واز لێ هێنا ئەوا ببینیت وشەکە خۆی بەسەر زمانتدا دێت، پاشان سەیری ئەوە بکەیت بۆت دێت و دەکرێتەوە هاوشێوەی ئەوەی بەسەر پێغەمبەران و دۆستانی خوادا کرایەوە ! !

وتم: ئەمە شتێکە سەیرم پێ نایەت چونکە بە هەمان شت ئامۆژگاری منیش کراوە، بەڵکوو سەیرم لەو کەسە دێت کە لەگەڵ زانین و تێگەیشتنیدا کەچی قەبووڵی کردووە ! ! ئایا بە پشتکردن لە خوێندنەوەی قورئان ڕێگای دەبڕدرێ؟ ! ئەوەی بۆ

پێغەمبەران کراوەتەوە بە تێکۆشان و ڕاهێنان بۆیان کراوەتەوە؟! ئایا متمانە دەکرێ بەوەی لەم ڕێباز و ڕێگرتنەبەرانە دەردەکەوێ؟! پاشان چی دەکرێتەوە؟! ئایا ئەمە ئاگاداربوونێکە لە غەیبزانی یا نیگا و وەحییە؟!

ئەمە هەمووی گەمەکردنی ئیبلیسە بە خەڵك، ڕەنگە ئەوەی دێتە بەر چاو و خەیاڵیان شوێنەواری مالیخۆلیا یان لە ئیبلیسەوە بێت.

دەست بە زانستەوە بگرە و سەیری ژیاننامەی پێشینان بکە، ئایا هیچ یەکێکیان لەمە شتێکی کردووە یان فەرمانی پێ کردووە؟! بەڵکوو بە قورئان و زانستەوە سەرقاڵ بوون کە بۆ چاککردن و خاوێنکردنەوەی دڵ و ناخ ڕێنوێنی کردن.

## ٢٥١- مامەڵە لەگەڵ یار و نەیار

هـەر کەسـێك ویسـتی خۆشەویسـتێك بـۆ خـۆی هەڵبـژێرێت ئـەوا خۆشەویسـت دوو جۆرە: ژنێك کە مەبەست لێی جوانییەکەیەتی، هاوڕێیەك کە مەبەستی لێـی جـوانیی واتایە.

ئەگەر وێنە و شێوەی ژنێکت بەدڵ بوو ماوەیەك لە ئاکارەکانی نـاخی وردبـەوە بـەر لەوەی دڵت بەتوندی پێوەی بنووسێ، ئەگەر دیتت بەو شێوەیە کە پێت خۆشـە – بنچینەی هەموو ئـەوەش دینـە، هـەروەك پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی ((دیندار هەڵبـژێرە)) – ئـەوا بـەرەو لای بـڕۆ و منـداڵی لێ بخـەوە و لـە مەیل و ئارەزووشتدا میانڕەو بـە، هەڵەیـە خۆشەویسـتی بـۆ دڵبەرەکـەت دەرخـەیت چـونکە شـووڵی لێ ڕادەکێشـێ و پێـت لێ دەنـێ و ئـازارت پـێ دەگەیـەنێ هـەر لـە تاوانبـارکردن و پشـت تـێ کـردن و نـازکردن و داوای خـەرجیی زۆر – ئەگـەریش خۆشتی بوێت –، چونکە ئەمە حەزی نازپێدان و خۆزاڵکردن بەسەر داماو دەیهێنێ.

لێرەدا خاڵێکی سەیر هەیە ئەوەیە کە ڕەنگە تۆ بە گوێرەی حـاڵی ئێسـتا ڕەفتـارت کردووە و ئەویش بە کەماڵیی خۆشەویستییەوە حوکم دەکات، پاشـان ئـەوە بـۆ تـۆ جـێگیر نـابێ و دەکـەویت و دامـاو و تێکشـکاو دەمێنیتـەوە و ڕزگاربوونـت سـەخت دەبێ! ڕەنگە بە هۆی زانینی نهێنیت یان بردنی ماڵێکی زۆرت بەسەرتدا زاڵ بێت.

ڕووداوێکی جوان کە لەم بارەیەوە بیستوومە ئەوەیە کە کەنیزەکێکی یەکێك لە خەلیفەکان مێردەکەی کە خەلیفەکە بوو زۆر خۆشدەویست بەڵام ئەم خۆشەویستییەی بۆ دەرنەدەخست، لەم بارەیەوە لێیان پرسی؟ وتی: ئەگەر ئەم خۆشەویستییەی بۆ دەرخەم ئەوا لێم دووردەکەوێتەوە و پشتم تێ دەکات، ئیتر منیش لەناودەچم..

شاعیر (تەڵحەی کوڕی ئەبی بەکر) وتوویە:

لا تُظهرنَّ مودّةً لحبيبٍ ... فترى بعينيكَ منهُ كلَّ عجيبِ

أظهرتُ يوماً للحبيبِ مودّتي ... فأخذتُ منْ هجرانهِ بنصيبِ

خۆشەویستی بۆ دڵبەر دەرمەخە، بە چاوەکانت بە هەموو شتێکی سەرسام بیت، ڕۆژێکیان خۆشەویستیم بۆ دڵبەر دەرخست بەشی خۆم لە هیجران و ڕۆیشتنی وەرگرت!

هەروەها پێویستە هەندێ خۆشەویستیت بۆ منداڵت بشاریتەوە چونکە دواتر بەسەرتدا زاڵ دەبێت و ماڵ و سامانت بە هەدەر دەدات و لە نازونوز زێدەڕۆیی دەکات و واز لە خوێندن و پەروەردە دێنێ.

هەروەها ئەگەر هاوڕێیەکت هەڵبژارد و تاقیت کردەوە ئەوا هەموو شتەکانی خۆتی پێ مەڵێ بەڵکوو بە چاکەکردن ئاگات لێی بێت هەروەك ئاگات لە درەخت دەبێ، ئەگەر ڕەسەن بوو ئەوا بە ئاگالێبوون بەری باشی دەبێ، پاشان لێی وریابە، چونکە ڕەنگە حاڵوبار بگۆڕێ، شاعیر وتوویە:

إحذر عدوّك مرّة　　　واحذر صديقك ألف مرة

فلربما انقلب الصديق　　　فكان أدرى بالمضرّة

یەك جار وریای دوژمنەکەت بە بەڵام هەزار جار وریای هاوڕێکەت بە، ڕەنگە هاوڕێکەت هەڵگەڕێتەوە و دژایەتیت بکات، لە هەمووانیش باشتر خاڵی لاوازت دەزانێ و دەتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ..

بەڵام ئەگەر کەسێکت بوغزاند لەبەرئەوەی خراپەی بۆت هەیە ئەوا ئەوە دەرمەخە چونکە تۆ ئاگاداری دەکەیتەوە لێت وریا بێت و بانگی شەڕکردنی دەکەیت، ئەویش لە شەڕکردن و فێڵ لێکردن و پیلان بۆ دانان لە دژت زێدەڕۆیی دەکات، بەڵکوو پێویستە ئەگەر توانیت ڕەفتاری جوانی پیشان بدەیت و تا دەتوانی چاکەی لەگەڵ بکەیت تا بە شەرمکردن لە بوغزاندنت دوژمنایەتییەکەی تێك بشکێنیت، ئەگەر نەتتوانی ئەوا بەجوانی پشتی تێ بکە، هەر کاتێ وشەیەکی ناخۆش و کرێتت لێ بیستەوە ئەوا بە وشەیەکی جوان وەڵامی بدەوە، ئەمە بۆ زمانبڕینی باشتر و بەهێزترە.

هەروەها هەموو ئەو شتانەی لە دەرخستنیان دەترسیت ئەوا مەیاندرکێنە، ڕەنگە قسەیەکت لێ بەربێتەوە شکۆی دەسەڵاتداری پێ بشکێنی و پێی بگەیەنرێت و ببێتە هۆی لەناوچوونت... یان قسەکەت لەبارەی هاوڕێیەکەوە بێت ببێتە هۆی دوژمنایەتی، یان ببیتە بارمتەی ئەو کەسەی بیستوویەتی لە ترسی ئەوەی نەوەك ئاشکرای بکات.

بڕیاری یەکلاکەرەوە بریتیە لە شاردنەوەی خۆشەویستی و ڕق. هەروەها پێویستە تەمەنت بشاریتەوە، ئەگەر گەورە بوویت بە پیرت دادەنێن و ئەگەریش بچووک بوویت ئەوا سووک سەرنجت دەدەن..

هەروەها ئەندازەی ماڵ و سامانت، ئەگەر زۆر بوو ئەوا لە خەرجییت بە ڕەزیلت دادەنێن، ئەگەریش ماڵت کەم بوو ئەوا دەخوازن لەکۆڵیان بیتەوە.

هەروەها مەزهەب، ئەگەر دەرتخست دوور نییە نەیارێك ببیستیٚ کافرت بکات.

(محەمەد کوڕی عەبدولباقی بەزاز) وتوویە:

احفَظ لسانكَ لا تبُح بثلاثة — سن و مالك ما استطعت و مذهبك

فعلى الثلاثة تُبتلى بثلاثة — بمموّه و مخرِق ومكذّب

زمانت بپارێزە و تا دەتوانیت سیٚ شت ئاشکرا مەکە: تەمەن و ماڵ و مەزهەب. لەسەر ئەو سیٚ شتە گرفتاری سیٚ کەس دەبیت: شێوێنەر و بوختانکەر و بەدرۆخەرەوە.

# ٢٥٣- خزمەتکردنی دەسەڵاتدار

زۆر سەیرم بەو ئیماندارە دێ کە باوەڕی بە خودا و پاداشت و سزای هەیە، لەگەڵ ئەو هەموو ستەمە دیار و زەقەی لێی دەبینێ کەچی خزمەتکردنی دەسەڵاتدار هەڵدەبژێرێ! ئای چەند سەیرە! چ شتێك سەرنجی ڕاکێشاوە؟!

ئەگەر ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاوە و سەرسامی بووە دونیاییە ئەوا هیچ شتێك نییە ئیللا ئەوە نەبێ لە بەردەمیدا بڵێ بە ناوی خودا – کە بە درۆ خۆی داوەتە پاڵی – لە سەرەوەی مەجلیس دابنیشێت و لە کن هاوشانەکانی لووتی بەرز بکات و ترزلی بنوێنێ و پارەی حەرام وەربگرێت کە نازانێ لەکوێوە وەدەست هاتووە، ڕەنگە ئاسانکاری لە وەرگرتنی بەرتیلیش بکات...

پاشان لە بەرانبەر ئەوەدا لادەبرێ و ماڵ و موڵکی دەستی بەسەردا دەگیرێ، ئەم تاڵییەش هەموو شیرینییەکی سەردەمی دەسەڵاتداری لە گەروو دێنێتەدەر...ڕەنگە هەژاریش بووبێت و بەم دەسبەسەرداگرتنە زۆر هەژار بکەوێت، پاشان ئەو زمانانەی پێشتر ستایشیان دەکرد دەست بکەن بە زەمکردنی.

پاشان ئەگەر لەمە سەلامەت بوو ئەوا لە چاودێر و وریایی لەو سەلامەت نابێ، وەکوو کەسێك وایە سواری کەشتییەك بووبێت، ئەگەر جەستەی لە نقوومبوون سەلامەت دەرچێت بەڵام دڵی لە ترس سەلامەت نابێ.

ئەگەریش دیندار بێت ئەوا دەزانێ ئەوان بەزۆری لێ ناگەڕێن کار بە گوێرەی دین بکات، بەڵکوو فەرمانی پێ دەکەن بە وازهێنان لەوەی پێویستە و کردنی ئەوەی دروست نییە، ئیتر وردە وردە دینەکەی لەدەست دەچێ! سزای ئاخیرەتیش سەختترە.

## ٢٥٤- داواكردن له خه‌ڵك زه‌لیلییه

سه‌یر له‌و كه‌سه‌ی به زه‌لیلی ڕازی نییه! چۆن له‌سه‌ر وشكه‌نان ئارام ناگرێ و خۆی گرفتاری منه‌تی هیچوپووچان ده‌كات؟!

ئایا ده‌بێ نه‌زانێ كه خاوه‌ن پیاوه‌تی نه‌ماوه؟! ئه‌گه‌ر سواڵ و داوای كرد، ئه‌گه‌ر كه‌سه‌كه قرچۆك بوو ئه‌وا هیچی ناداتێ، ئه‌گه‌ر شتێكی كه‌میشی پێدا ئه‌وا به‌درێژاییی ته‌مه‌ن ده‌یكاته به‌نده و كۆیله؟!

پاشان ئه‌و بڕه كه‌مه زوو ده‌ڕوات و منه‌ت و شه‌رمه‌زاری و خۆ به سووك بینین بۆ داواكار ده‌مێنێته‌وه، به‌خشه‌ریش هه‌میشه به چاوی گه‌وره سه‌یری ده‌كرێ.

پاشان ئه‌وه وا ده‌كات له به‌رانبه‌ر كه‌موكورتی و نه‌نگییه‌كانی به‌خشه‌ر بێده‌نگ بێت و په‌له بكات له جێبه‌جێكردنی مافه‌كانی و به‌ته‌واوی خزمه‌تی بكات.

له‌مه سه‌یرتر ئه‌و كه‌سه‌یه كه ده‌توانێ به كه‌مێك به‌خششی پووچ ئازاده‌كان به‌كۆیله بكات و ناشیكات، كه‌سی ئازاد ناكڕدرێ ته‌نها به چاكه‌كردن نه‌بێ.

تفضّل على من شئت واعزن بأمره فأنت ولو كان الأمير أميره
وكن ذا غنى عمن تشاء من الورى ولو كان سلطانا فأنت نظيره
ومن كنت محتاجا إليه و واقفا على طمع منه فانت أسيره

کێت گەرەکە چاکەی لەگەڵ بکە و بایەخی پێ بدە ئەگەر میریش بێت تۆ میری ئەویت..لەوەی دەتەوێ بێ نیاز بە ئەگەر سوڵتانیش بێت تۆ هاوشانی ئەویت، ئاتاجی هەر کەسێکیش بیت و تەمات لێی بێت ئەوا تۆ دیلی ئەویت.

## ٢٥٥- نهێنیی پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو

مرۆڤی پێگەیشتوو پێویستە وریای زۆر پەڕین بێت بۆ ئـەوەی جەوهـەر و نـاوەڕۆکی خۆی بهێڵێتەوە و ئەوەش لە گەورەییدا سوودی پێ دەگەیـەنێ، چـونکە دیـارە کـە هەر گەورە دەبێ و خۆئامادەکردنیش بـۆ ئـەو تەمەنـە بڕیـارێکی شـیاو و ژیرانەیـە. هەروەکوو پێویستە بەر لە هاتن خۆی بۆ زستان ئامادە بکـات، هـەر کـات لـە کـاتی تواناداد بەرهەمی خەرج کرد ئەوا لە کاتی نەبوونیدا گرفتاری هەژاری دەبێـت و ئـازار دەچێژێ.

ديندار و تێگەیشتوو با بزانێ کە چێژ بە نزیکبوون لە خۆشەویست دەبێ، نـزیکییش بـە مـاچ و لەباوەشـگرتن دێتـەدی، ئـەوەش خۆشەویسـتی بـەهێز دەکـات، بـوونی خۆشەویسـتیش بەچـێژە و پـەڕینیش خۆشەویسـتی کـەم دەکـات و ئـەو چـێژە ناهێڵێت!! (بەداخەوە بۆ ئـەم ڕایـەی دانـەر!! هـەرگیز پـەڕین خۆشەویستی کـەم ناکاتەوە، بەڵکوو پەڕین خۆشەویستی زیاد دەکات، کێشـەی بەشـێك لـە هاوسـەران پەڕین و جووتبوونە کە زۆربەی کات هاوسەنگ نییە.)

عەرەب عاشق دەبوون و لێپەڕین (سـەرجێی)ی مەعشـووقیان بـە بـاش نـەدەبینی!
یەکێکیان دەڵێ: ئەگەر خۆشەویستی پەڕینی تێ کەوت ئەوا تێکدەچێ!

بەڵام چێژ بینین بە هەمان پەڕین کاری ئاژەڵانە! (دیسان بەداخەوە بۆ دانەر! بەو قسەیەی وی بێت هەموو ئەو کەسانەی حەزیان لە جووتبوونە ئاژەڵن تەنانەت بە خەڵکی بەهەشتیشەوە!).

سەرنجم دایە مەبەست لە پەڕین، واتایەکی سەیرم لێ دیت کە لە زۆرێك لە خەڵك شاراوەیە ئەویش ئەوەیە کە نەفس ئەگەر عەشقی کەسێك بوو حەز دەکات لێی نزیك بێتەوە، بەخۆیەوە دەنووسێنێ و لە ئامێزی دەگرێ، چونکە ئەم دووانە ئەوپەڕی نزیکییە. پاشان نزیکییەکی دەوێت لەمە زیاتر، ئیتر ڕوومەتی ماچ دەکات. پاشان دەیەوێ لە ڕۆح نزیك بێتەوە دەم ماچ دەکات چونکە دەرچەیەکە بۆ ڕۆح. پاشان داوای زیاتر دەکات و زمانی خۆشەویست دەمژێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عائیشەی لەباوەش دەگرت و ماچی دەکرد و زمانی دەمژی. ئەگەر نەفس نزیکی لە نەفسێکی تر خواست ئەوا پەڕین بەکاردێنێ.

ئەمە نهێنیی مەعنەویتی و چێژوەرگرتنی بەرهەستی لێ وەدەست دێت.

## ٢٥٦- زیانی زانستی کەلام

هیچ شتێك هێندەی ئەوە بۆ ڕەشۆكییان زیانبەخش نییە كە باسی زانستی كەلامیان بۆ بكەیت. بەڵكوو پێویستە ڕەشۆكییان هۆشدارییان بدرێتێ لە بیستنی و ڕۆچوون تێیدا هەروەك چۆن منداڵ ئاگادار دەكرێتەوە لەوەی لە كەنار ڕووبار نزیك بێتەوە لە ترسی نقوومبوون.

ڕەنگە ڕەشۆكی وا گومان ببات كە هێزێكی هەیە بە هۆیەوە دەرك بەمە دەكات، لەمەدا خەڵكێكی زۆر لە زانایان هەڵخلیسكان و سەرچیغ چوون، ئیتر ڕەشۆكییان چۆن ناخلیسكێن؟!

گەمژەتر لە چیرۆكخوێنانی سەردەمی خۆمانم نەبینیوە، ڕەشۆكییانی نەفام و نەزان لە كنیان ئامادە دەبن، لە مەی و زینا و غەیبەت جڵەوگیرییان ناكەن و، فێری پایەكانی نوێژ و ئەركەكانی خواپەرستییان ناكەن بەڵكوو دونیا پڕ دەكەن بە باسكردنی (الاستواء) و تەئویلی صیفات، ئیتر كەسێك دڵی ساغ بێت بەوە ئازاری پێ دەگات.

لەسەر ڕەشۆكی پێویستە باوەڕی بە پێنج بنچینەكە هەبێت: بە خودا و فریشتەكان و كتێبەكان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی، بەو قسەیەی پێشینان قەناعەت بكات كە

وتوویانــه: قورئــان قســەی نامــەخلووقی خودایــه، (الاســتواء) هــەق و ڕاســته و چۆنییەتیشی نەزانراوه.

با بزانرێ كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جگە لـە تـەنها ئیمـان تـەكلیفی هیچـیتری لـە ئـەعراب نـەكرد، هـاوەڵانیش لـەبارەی (جـوهر) و (عـرض) قسـەیان نەكردووه، هەر كەسێ لەسەر ڕێگە و ڕێبازی ئەوان بمرێ ئەوا بە ئیمانداری و ساغ و سەلامەتی لە بیدعە مردووه. هەر كەسێك بچێتە كەناری دەریاوە و مەلەوانی نـەزانێ دیارە کە نقووم دەبێ.

## ٢٥٧- نەفامترین کەس

نــەفامترین و نــەزانترین خــەڵك ئــەو کەســەیە کــە شــەیدا و چلێســی چــێژەکانە. چێژەکانیش دوو جۆرە: ڕێپێدراو و قەدەغەکراو.

ڕێپێدراو، لە بەرانبەر بەدەسهێنانی شتێك لێی، شتێکی گرینگ لە ئـایین لـە دەسـت دەدەیت، ئەگەر دەنکۆڵەیەکت لێ وەدەست هێنا بەرانبەرەکەی نزیکەی پێنج سـەت کیلۆ لە خەم و خەفەتە...پاشان ساغ و ساف نییە بـەڵکوو کێشـە و لێڵییـەکانی بـە هەزارانە... کە دوای بەسەرچوونی، نەمانی دەهێنیتە بەر چاو و ئەم هەزاران خەم و لێڵییە، ئەوا وێنەکەی دەبێتە گرێیـەك لـە دەروون و خـەمێکی قـووڵی دڵ... ئەگـەر سکاڵای کرد، سکاڵا لەسەر بەردەوامبوون لە شتێك دەکات کـە هـیچ سـیفەتێکی لـە خۆ نەگرتووە، نەزان فریـو دەدات و تەمـەن وێـران دەکـات و خـەم و خەفـەت درێـژ دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، چلێس هەر لـە چـێژێکی خـواردەوە داوای خوشکەکەشـی دەکـات، تاوان و ناپاکیی یەکەمیشـی زانیـوە... ئەمـە نەخۆشـیی عـەقڵ و دەردی تـەبیاتـە.. ئەمـە هـەر ئـاوا دەمێنێتـەوە تـا مـەرگ دەیرفێنێـت، فـڕێ دەدرێتـە سـەر ڕایـەخی پەشیمانییەك کە قەرەبوو ناکرێتەوە.

سەیر لەو کەسەی کە لەگەڵ کورتیی تەمەندا هیممەتی ئاوایە، پاشان بایەخ بە ئاخیرەتی نادات کە چێژەکەی ساغ و دوور لە خڵتە و پڵتەیە، لە هەموو خەوشێك خاوێنە، هەمیشەیی و بەردەوامە، هەتا هەتایە دەمێنێتەوە!

نزیکخستنەوەی ئەمە، بە دوورخستنەوەی ئەوە دەبێت، ئاوەدانکردنەوەی ئەمەش بە وێرانکردنی ئەوە دەبێت.

سەیر لە ژیرێکی دانای بەڕا و تەگبیرە کە سەرنجدان و وردبوونەوە لەم حاڵانەی لەدەست چووە و لە جیاوازیکردن لە نێوان ئەم دووانە بێئاگا بووە!

ئەگەر چێژ سەرپێچی و گوناه بێت، ئەمانەش دێنە پاڵ ئەوانەی باسمان کرد: تەنگیی دونیا و، حەیاچوونی نێو خەڵك و سزای حەددەکان و سزای ئاخیرەت و تووڕەبوونی خودای هەق.

سوێند بە خوا، ڕێپێدراوەکان لە وەدەسهێنانی فەزیلەتەکان مەشغوولت دەکات، بۆ ڕوونکردنەوەی بڕیاری یەکلاکەرەوە ئەوە زەم کرا، ئیتر لەبارەی قەدەغەکراوەکان کە ئەوپەڕی سووك و ناشیرینن دەبێ چۆن بێت؟!

## ٢٥٨- هۆكارەكانی سستیی خەڵك لە ڕووكردنە خودا

سەرنجی خەڵكم دا، دیتم لە بارێكی سەیردان، خەریكە دڵنیا بم لە تێكچوونی عەقڵ! ئەوەش لەبەرئەوەی مرۆڤ گوێی لە ئامۆژگاری دەبێت و باسی ئاخیرەتی بۆ دەكرێت، دەزانێ بگۆ ڕاستگۆیە، ئیتر دەگرییێت و لەسەر كەمتەرخەمییەكانی بێتاقەت دەبێ و بڕیاری قەرەبووكردنەوە دەدات، پاشان بە گوێرەی ئەوەی بڕیاری لەسەر داوە كار و كردەوەی خاو دەبێتەوە، ئەگەر پێی بوترێ: ئایا گومانت هەیە لەوەی بەڵێنت پێ دراوە؟ دەڵێ: نا بە خوا. پێی دەوترێ: دە كار بكە! نییەتی ئەوە دێنێ، پاشان لە كاركردن دەوەستێ، ڕەنگە بە لای چێژێكی حەرامیش خوار بكاتەوە و دەشزانێ نەهی لێ كراوە!

لەم جۆرە كەسانە، ئەو سێ كەسەن كە لە شەڕ دواكەوتن و هیچ بەهانەیەكیشیان نەبوو و دەشیانزانی دواكەوتنەكەشیان چەند ناشیرینە، هەموو سەرپێچیكار و كەمتەرخەم و شلڕەوێكیش ئاوایە.

سەرنجی هۆكارەكەیم دا، لەگەڵ ئەوەی بیروباوەڕەكە ڕاست و دروستە و كردەوەش سستە، دیتم سێ هۆكاری هەیە:

یەکەم: دیتنی ئارەزووی بەردەست، دیتنی ئارەزوو مرۆڤ مەشغوول دەکات لەوەی دەیکات و دەیچنێتەوە.

دووەم: دواخستنی تەوبە و گەڕانەوە، ئەگەر عەقڵ ئامادە بوو هۆشداری دەدات لە ئافەتەکانی دواخستن، ڕەنگە مردن هێرش بکات و تەوبەش ڕووی نەداوە! سەیر لەو کەسەیە کە ساتێك لەمەوبەر ڕێی بە سەندنی ڕۆحی خۆی دەدا کەچی کاری جیددی ناکات! بەڵام ئارەزوو ماوەکە درێژ دەکاتەوە. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((نوێژێك بکە نوێژی ئەو کەسە بێت کە ماڵئاوایی لە دونیا دەکات.)) فەرموودەیەکی حەسەنە، ئەحمەد و بوخاری و ئیبن ماجە گێڕاویانەوە.

ئەمە دوا دەرمانی ئەم دەردەیە، هەر کەسێك گومانی برد کە بۆ نوێژێکی تر نامێنێتەوە ئەوا هەوڵ دەدات و کۆشش دەکات.

سێیەم: ئومێدبوون بە ڕەحمەت و بەزەیی، سەرپێچیکار و گوناهبار دەبینیت دەڵێ: پەروەرێنم دلۆڤانە! لە بیری دەچێت کە خودا توندسزاشە!! ئەگەر زانیبای کە ڕەحمەتەکەی نەرمی نییە — ئەگەر وابووایە چۆلەکەیەکی سەرنەدەبڕی و منداڵێکی ئازار نەدەدا — سزای مایەی دڵنیایی نییە — خودا دایناوە کە دەستێکی بەڕێز بە دزینی پێنج قەراریت کە دەکاتە سێ درهەم ببڕدرێ — ، هەوڵی دەدا و دەگەڕایەوە.

## ٢٥٩- خودسەرسامی دەردێکی لەناوبەرە

سەرنجم دایە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاتێ ئەنگوستیلەی لە دەست کرد و پاشان فڕێی دا و فەرمووی: ((سەیرکردنی ئێوە و سەیرکردنی ئەمە مەشغوولی کردم)) صەحیح، ئەحمەد و نەسائی گێڕاییتیانەوە.

هەروەها فەرموودەی: ((ئەمە پیاوێکە بەفیز و دەعیەی جلوبەرگەکەیەوە دەڕوات، قژی شانە کردووە، بە زەویدا نغرۆ کرا و بردرایە خوارەوە، تا ڕۆژی قیامەت هەر دەچێتە خوارەوە.)) بوخاری و موسلیم گێڕاییتیانەوە.

دیتم نابێ ئیماندار جلوبەرگێکی سەرسامکەر و بەفیز و شتێك لە زینە و جوانی لەبەر بکات چونکە ئەوە دەبێتە هۆی لە خۆ ڕوانین بە چاوی سەرسامی و خودپەسندی، نەفسیش دەبێ بۆ خودا زەلیل بێت.

زانا کۆنەکان لە بەنی ئیسرائیل بە داردەست و گۆچان دەڕۆیشتن نەوەك لە ڕۆیشتندا خۆبەگەورەزانییان لێ ڕوویدات.

کاتێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کراسێکی پۆشی کە نەخش و نیشانەی تێدا بوو، فەرمووی: ((ئەمە لە نوێژەکەم سەرقاڵ و مەشغوولی کردم)) بوخاری و موسلیم گێڕاییتیانەوە.

ئەمە هەمووی وا پێویست دەکات پشت بکەینە جوانکاری و ئەو شتانەی بەرەو شانازی و خۆبەزلزانی و سەرسامی دەمانجوولێنن. لەبەر ئەمەش ئاوریشم حەرام کراوە.

لەبارەی ئەم هۆکارانەوە دەڵێم: ئەو جلوبەرگە پینەدارانەی سۆفییەکان خۆیان پێ نیشان دەدەن ڕەنگە ببێتە هۆی خۆبەزلزانیی ئەو کەسەی دەیپۆشێ: یان لەبەر خودی جوانییەکەی، یان لەبەرئەوەی دەزانێ ئەوە نیشانەی تەسەووف و زوهدە..هەروەها ئەنگوستیلە و درێژی سەردەستەکان و پێڵاوی دەنگدار.. نالێم: ئەم شتانە حەرامن بەڵکوو ڕەنگە خۆبەزلزانی بهێنێتە ئاراوە کە حەرامە.

پێویستە کەسی ژیر وریا بێت لەوەی وتم لە خستنە دواوەی هەموو ئەو شتانەی ترسی خراپەیان هەیە.

ئیبن عومەر سواری وشترێکی خۆشڕۆ بوو، بە ڕۆیشتنەکەی سەرسام بوو، وتی: ئەی نافیع! بیخەرە ناو ئەو وشترانەی لە بەیتولحەرام سەردەبڕدرێن.

## ٢٦٠- دووربوون له دیداری خەڵك

هەرکەسێك خاترجەمی و چاککردنی دڵی ویست، با لە تێکەڵبوونی خەڵکی لەم سەردەمە وریا بێت، چوون پێشتر کۆبوونەوە لەسەر باسکردنی شتی سوودبەخش بوو، بەڵام نووکە کۆبوونەوە لەسەر شتی زیانبەخشە!

چەندان جار لەسەر نەفسی خۆم تاقیمکردۆتەوە کە لە خانەی گۆشەگیریدا قەتیسی بکەم، ئیتر نەفسم خۆی جەم دەکات و سەیرکردنی ژیاننامەی پێشینان (السلف) دێتە پاڵ ئەوە، گۆشەگیری و دابڕان بە خۆپارێزی دەبینم و سەیرکردنی ژیاننامەی پێشینان بۆم دەبێتە دەرمان، بەکارهێنانی دەرمان لەگەڵ خۆپارێزی لە تێکەڵ و پێکەڵی سوودبەخشە.

ئەگەر بۆ هاونشینی و دیداری خەڵك جڵەوم بۆ نەفسم شل کرد ئەوا دڵی جەم پەرتوبڵاو دەبێت و لەوەی ئاگام لێیەتی و چاودێری دەکەم بێئاگا دەبم و ئەوەی چاو بینیویەتی لە دڵدا نەخش دەبێ و ئەوەی گوێ دەیبیستێ دەچێتە ناو ناخ و، لە نەفسیشدا ئەوە جێگیر دەبێ کە بە تەمایە لە دونیا وەدەستی بێنێ. ئەگەر زۆربەی تێکەڵبووان ئەهلی بێئاگایی بن ئەوا تەبیاتیش بە هاونشینیی لەگەڵیان، لە سروشتیان خوو وەردەگرێ.

ئەگـەر گەڕامـەوە و بـە دوای دڵـدا گـەڕام نایدۆزمـەوە، دەمـەوێ ئـەو ئامادەییـە وەدەسـت بێنمـەوە کەچـی لـە دەسـتی دەدەم، دڵـم ڕۆژگـەلێك لـە جـەنجاڵیی ئـەو دیدارەی خەڵکدا دەمێنێتەوە تا لە ئارەزوو دادەبڕێ و بیری دەچێتەوە.

سوودی لەبەر یـەك هەڵوەشـاندنەوەی خانوویـەك چییە؟! بـە ڕاسـتی گۆشـەگیریی بەردەوام وەکوو خانوویەك وایە و سەیرکردنی ژیاننامەی پێشینان (السـلف) بـەرزی دەکاتەوە، ئەگەر تێکەڵبوون ڕوویدا ئەوا ئەوەی لە ماوەیەکی درێژدا بنیات نراوە لە ساتێکدا هەڵدەوەشێتەوە و دەڕمێت، ئیتر بەیەککگەیشتنەوە و بەیەکەوە لکاندنـەوە دژوار دەبێت و دڵیش لاواز دەبێت!

هـەر کەسـێك تێگەیشـتنی هـەبێت نەخۆشـییەکانی دڵ و پشـتکردنە خاوەنەکـەی و دەرچوونی باڵندە لە قەفەزەکەی دەزانێت.

دوور نییـە ئـەم نەخۆشـە بـە هـۆی ئـەم نەخۆشـییەوە تووشـی لەناوچـوون ببێـت، هەروەها دوور نییە ئەم باڵندە بەندکراوە بکەوێتە ناو تۆڕەوە.

هۆکـاری نەخۆشـیی دڵ ئەوەیـە کـە لـە تێکەڵوپێکـەڵی پـارێزراو بـووە، زانسـت و ژیاننامـەی پێشـینان خـۆراکی بـووە، مگێـز (میـزاج)ی بەرگـەی نـەگرت و نـەخۆش کەوت.

زۆر هەوڵ و کۆشش بکەن، دونیا تەنها چەند ڕۆژێکە و دەبڕێتەوە، ئیتر ئەوانـەی لـە دەورووبەرت بوون نابینیتەوە مەگەر بە دەگمەن.

پابەندی خەڵوەت و تەنیاییەکەت بە و تا ماویت ئاگات لە نەفس بێت! ئەگەر نەفس پەرۆشی دیداری خەڵك بوو ئەوا بزانە هێشتا خاوێن نییە، ڕامی بکە بۆ ئەوەی ڕقی لە دیداری خەڵك بێتەوە... ئەگەر بە خودا مەشغوول و سەرقاڵ بووایە ئەوا حەزی لە قەرەباڵغی نەدەکرد، هەروەکوو ئەو کەسەیە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا تەنیایە و پێی خۆش نییە کەسی تر بێتە لایان... ئەگەر ئاشقی ڕێگای یەمەن بووایە ئاوڕی بۆ شام نەدەدایەوە.

## ٢٦١- ئەگەر خودا کەسێکی ویست

بـیرم کـردەوە لـە هۆکـاری هیدایەتـدانی ئـەو کەسـەی هیدایـەتی وەرگرتـووە و بێداربوونەوەی ئەو کەسەی لە خـەوی بێئاگـایی بـەئاگا دێت، دیـتم هۆکـاری هـەرە گەورە هەڵبژاردنی خودای هەقە بۆ ئەو کەسە، هەروەکوو وتراوە: ئەگەر خودا تـۆی بۆ شتێك ویست، ئەوا ئامادەت دەکات بۆی.

جارێك بێداری تەنها بە بیرێك ڕوودەدات کە ڕوانینێکی هۆش پێویستی دەکات، مرۆڤ سەرنجی بـوونی خـۆی دەدات و دەزانـێ دروسـتکەرێکی هەیـە و داوای لـێ کـردووە هـەقی بـدات و سوپاسـی نیعمەتـەکانی بکـات و لـە سـزای سەرپێچـیکردنی ترساندوویەتی، ئەوەش بە هۆکارێکی دیار نابێت.

نموونەی ئەمەش ئەو ڕووداوەیە کە بەسەر یارانی ئەشکەوتدا هـات: ﴿إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ (الكهف: ١٤) واتە: ڕاپەڕین و وتیـان: پـەروەرێنی ئێمـە خودای ئاسمانەکان و زەوییە.

لە تەفسیردا هاتووە: هـەر یـەکێك لـەوان لـە دڵیـدا بێـداری و ئاگاییـەکی دۆزیـەوە و گوتی: دەبێ ئـەم جیهانـە خولقێنـەرێکی هـەبێ. ئـیتر لـە ناخـەوە خـەمبار بـوون و بەرەو بیابان ڕۆیشتن، بێ هـیچ وادەیـەك لـەوێ یـەکتریان بینـی و کۆبوونـەوە، هـەر

یەکێکیان لەویتری دەپرسی: چ شتێك تۆی هێناوەتەدەر؟ ئیتر لەوێوە بوونە هاوڕێ.

خەڵك هەیە لەبەر ئەو هۆیە – کە بیر و تێڕوانینە – خودا دەکاتە هۆکارێکی دیار، یان لەبەر ئامۆژگارییەك دەیبیستێ یان دەیبینێ، ئەم هۆکارە دیارە بیرۆکەی دڵی ناوەوە دەبزوێنێ.

پاشان بێدار و بەئاگایان دابەش دەبن:

هەیانە ئارەزووی بەسەریدا زاڵ دەبێ و تەبیاتی داوای ئەوەی لێ دەکات کە ئارەزوویەتی لەوەی پێشتر لەسەری ڕاهاتبوو، ئیتر پاشەکشێ دەکات و ئەو ئاگاییەی دەستی کەوتووە سوودی پێ ناگەیەنێ، بێداری و ئاگایی نموونەی ئەمە زیاتر بەڵگەیە لە دژی.

هەیانە لە پایەی موجاهەدە لەنێوان دوو ڕیزدا وەستاوە: هۆشی فەرمانکار بە تەقوا و، ئارەزووی داواکاری شەهوەتەکان: هەیانە دوای هەوڵ و کۆششێکی دوور و درێژ تێك دەشکێ و بۆ خراپە دەگەڕێتەوە و بەوە کۆتایی دێت. هەشیانە جارێك زاڵ دەبێ و جارێکی تریش تێك دەشکێ، برینەکانی کوشندە نین. هەیانە دوژمنەکەی دەبەزێنێ و لە زیندانێکدا بەندی دەکات، دوژمنەکە هیچ دەسەڵات و فرتوفێڵێکی نامێنێ تەنها وەسوەسە نەبێ.

لە باشترین و هەڵبژاردەکانیش خەڵکانێك هەن کە لەوەتەی بێدار بوونەتەوە نەخەوتوون و، لەوەتەی ڕێی خواناسییان گرتۆتەبەر نەوەستاون، هەموو هەوڵ و

خەمیان بەرزبوونەوە و بالاکردنە، هەر کاتێك لە پایەکەوە بچن بۆ پایەکی تر کەموکورتی ئەوەی تێیدا بوون دەبینن، ئیتر داوای لێخۆشبوون دەکەن.

هەیانە لە ئاتاجی بەرز دەبێتەوە بۆ موجاهەدە: یان لەبەر ئەوەی تەبیات داوای دەکات بەلایەوە نزم و سووکە و هیچ کاریگەرییەکی نییە، یان لەبەر گەورەیی خواست و داواکراوەکەی، ئیتر ئاوڕ ناداتەوە بە لای ئەوەی ڕێگریەتی.

بزانە کە ئەو ڕێگایەی بە خودای هەقت دەگەیەنێ بە پێ نابڕدرێ، بەڵکوو بە دڵ دەبڕدرێ، ئارەزووە کاتییەکانیش ڕێگرن، ڕێگاکەش وەکوو شەوێکی تاریك و نووتەکە، بەڵام چاوی کەسی سەرکەوتوو و یارمەتیدراو وەکوو چاوی ئەسپە چونکە چۆن لە ڕووناکیدا دەبینێت ئەوهاش لە تاریکیدا دەبینێت، ڕاستگۆیی لە داواکردن چرایە، لە هەر شوێنێك دیترا ئەوا ڕێگات پێ نیشان دەدات.

ئەو کەسە ساتمە دەکات و سەرەنگرێ دەبێ کە دڵسۆز و نیازپاك نییە..ئەو کەسەش بەردەوام نابێ کە ویستراو نییە و خودا نایهەوێت.

## ٢٦٢- حەقیقەتی مرۆڤ

سەیرم دێت لەو کەسـەی بـە وێنـە و شـێوەی خـۆی سەرسـامە و بەخۆبەزلزانییـەوە دەڕوات و لەبیری چۆتەوە سەرەتای چۆن پەیدا بووە ! سەرەتاکەی پارووپەك بـووە کە قومە ئاوێکی چۆتە پاڵ. ئەگەر دەتەوێ بڵێ: پارچە نانێکی بچووك بووە، لەگەڵ چـەند دەنکـە خورمایـەك و پارچـە گۆشـتێك و فـڕە شـیرێك و قومـە ئاوێـك...هیتر، جەرگ کوڵاندوویەتی و چەند دڵۆپە مەنییەکی لێ دەرهێنـاوە و لـە گونـەکان جـێگیر بووە، شەهوەت جووڵاندوویـەتی و ڕژاوە، ماوەیـەك لـە سـکی دایکدا ماوەتـەوە تـا شێوەکەی تەواو بووە، بۆتە منـداڵێك و هاتۆتـەدەر، لـەنێو پارچـە پـەڕۆی میزاویـدا گەوزاوە !

کۆتاییەکەشی، فڕێ دەدرێتە نێو خاکەوە، کرم دەیخوات و دەبێتە ئێسك و پڕوسـك و بـا پەرشـوبڵاوی دەکاتـەوە. چـەندان خـۆڵی جەسـتەی لـە شـوێنێکەوە دەچـێتە شوێنێکی تر و لە چـەند حـاڵ و دۆخـدا ئـاڵوگۆڕ دەکـات تـا ئـەوەی دەگەڕێتـەوە و کۆدەبێتەوە !

ئەمە هەواڵی جەستە.

بەڵكوو ئەوە ڕۆحە دەبێ كاری لەسەر بكرێت: ئەگەر بە ئەدەب ڕووپۆش كرا و بە زانست چاك و ڕاست و پەروەردە كرا و خودای ناسی و مافی دا، ئەوا كەموكورتیی پێكهاتەی زیانی پێ ناگەیەنێ. ئەگەر لەسەر سیفەتی نەزانیی خۆی مایەوە ئەوا هاوشێوەی قوڕی لێ دێت، بەڵكوو نزمتر لە حاڵەتی وی لێ دێت.

## ٢٦٣- دونیا و دواڕۆژ

زۆر دووره لەگەڵ سەرقاڵبوون بە کاروباری دونیاوه خاترجەمی و دڵئارامی ڕوویدات! بەتایبەتی ئەو گەنجە هەژارەی هۆگری هەژاری بووه و لەگەڵیدا ڕاهاتووه ئەگەر هاوسەرگیری کرد و شتێکی لە دونیا نەبوو، بایەخی بە ئیشکردن و پارە پەیداکردن دا یان داوای لە خەڵك کرد ئەوا هەوڵ و هێزی پەرشوبڵاو دەبێت، کە منداڵیش دێتە ئاراوە باری سەر شانی قورستر دەبێ و وردە وردە لە نان پەیداکردن دەستی شل دەکات تا ئەوەی تووشی حەرام دەبێت.

هەر کەسێ بیر بکاتەوە خەم و بیری لای ئەوە دەبێت کە خۆی و خاوخێزانی چی دەخۆن، ژن لە خەرجی و پۆشاك بە چی ڕازی دەبێت، ئەوەشی نییە، ئیتر چۆن دڵی ئامادەیی دەبێت؟! چۆن خاترجەم دەبێت؟!

زۆر دووره! سوێند بە خوا بیر و هێزی بۆ جەم نابێ و چاوی سەیری خەڵك دەکات و گوێی قسەکانیان دەبیستێ و زمان قسەیان لەگەڵ دەکات و دڵیش لە وەدەسهێنانی پێداویستییەکان پەرت و بڵاو بووه.

ئەگەر یەکێك گوتی: چۆن و چی بکەم؟!

دەڵێم: ئەگەر ئەندازەی پێویست لە دونیات هەبوو یان گوزەران و بژیوییەك لە حەوجەی دەستی نامەرد بتپارێزێ ئەوا قەناعەتی پێ بکە و تا دەتوانیت خۆت لە خەڵك دوور بگرە.. ئەگەریش هاوسەرگیریت کرد ئەوا لەگەڵ کچە هەژارێك بیکە کە بە کەم ڕازی بێت و تۆش لەسەر شێوە و هەژارییەکەی ئارام بگریت و نەفست بەرهەڵدا نەکەیت بۆ ژنێك کە پێویستی بە زێدە خەرجییە، ئەگەر ژنێکی باشت بەقسمەت بوو کە خاترجەمی کردیت ئەوا ئەوە باشە، ئەگەر نەتتوانی ئەوا ئارامگرتن بۆت باشترە لە سەرکێشی و خۆ تووشی مەترسی کردن... ئامان و دەخیل لە ژنانی جوان و بەرچاو، مێردەکەیان – ئەگەر سەلامەت بێت – وەکوو بتپەرست وایە... ئەگەر شتێکت وەدەستهێنا ئەوا هەندێکی خەرج بکە، بە هەڵگرتنی پاشماوەکەی، پەرتوبڵاویی دڵت دەپارێزیت... زۆر زۆر لەم سەردەمە و خەڵکەکەی وریابە، چوونکە نە دڵدەرەوە ماوە و نە خەمخۆر، هیچ کەس بایەخ بە دابینکردنی پێداویستیی کەس نادات، کەسێك نەماوە کە ئەگەر داوای لێ بکرێ ببەخشێت مەگەر شتێکی کەم بەقەڵسی و منەتەوە بدات و هەژاری داماوی هەتا لە ژیاندا ماوە پێ بکاتە کۆیلە و هەر کاتێ ببینێ سەرودڵی پێی بگیرێ، یان داوای لێ بکات خزمەتی بکات و هاموشۆی بکات...

لە سەردەمی ڕابردوو کابرایەك هەبوو بە ناوی (ئەبوو عەمرو کوڕی نوجەید)، ڕۆژێك گوێی لە (ئەبوو عوسمانی ئەلحیری) بوو لەسەر مینبەر دەیگوت: هەزار دینار قەرزارم و دڵم تەنگ بووە.

(ئەبوو عەمرو) لە شەودا هەزار دیناری بۆ برد و وتی: قەرزەکەت بدەوە! ئەبوو عوسمان کە چووەوە سەر مینبەر گوتی: سوپاس بۆ خوا، ئەبوو عەمرو دڵی ئاسوودە کردم و قەرزەکەی دامەوە. ئەبوو عەمرو هەستایەوە و وتی: ئەی شێخ! ئەو پارەیە هی دایکم بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو کە دام بە تۆ، ئەگەر دەتوانی بۆمی بگەڕێنیتەوە باشە! کە شەو داهات ئەبوو عەمرو چووە کن ئەبوو عوسمان و پێی وت: بۆچی لەنێو خەڵکدا ئاشکرات کردم؟! من ئەوەم تەنها لەبەر خودای هەق کرد، ها بیگرە بۆ خۆت و ناوم مەهێنە!

زۆر زۆر لەوانە دووربە کە هەموو خەم و هەوڵێکی هەر دونیایە...ئەمانە بەزۆری لە ناخەوە دوژمن و لە ڕواڵەتیش دۆستن، بە زیانت دڵخۆش و بە نیعمەتیشت حەسوودن.

بەوەی فرۆشراوە گۆشەگیری بکرە، ئەوەی دڵی هەبێ ئەگەر چووە بازاڕ و هاتەوە ماڵ دڵی دەگۆڕێ، ئەی دەبێ حاڵی چۆن بێت ئەگەر بە مەیل و ئارەزووی هۆکارەکانی دونیا کۆسپی خستە پێش؟!

بە دووریی لە خەڵك هەوڵی خاترجەمی و دڵنیایی بدە بۆ ئەوەی دڵ یەکلا ببێتەوە بۆ بیرکردنەوە لە دواڕۆژ و چاوی بینایی ڕەشماڵەکانی کۆچکردن ببینێ!

## ٢٦٤- بۆ مورید چی باشە؟

مورید لە سەرەتای زەمان کە دڵی تاریك دادەهات یان هۆشی نەخۆش دەکەوت، سەردانی هەندێ پیاوچاکی دەکرد، تاریکاییەکە نەدەما.

ئەمڕۆ، هەر کاتێ گەردیلەیەك ڕاستگۆیی بۆ مورید هاتەدی ئەوا دەیگەڕێنێتەوە بۆ خانەی گۆشەگیری و شەماڵێك لە بۆنی خۆش و ڕووناکییەك لە ناخی دڵیدا هەست پێ دەکات و، خاتری جەم دەبێ و پەرتوبڵاوی ڕێك دەبێت، ئەگەر چووە دەرێ تووشی کەسانێك دەبێ کە وەکوو خاوەن زانست یان زوهد ئاماژەی بۆ دەکرێ، چەند بێکارێك لە لای دەبینێ، لەگەڵیان ڕێی وڕێنەی بێسوود دەگرێتەبەر و وێنەی وەکوو وێنەی فێڵبازێك دەبینێ، سووك و سادەترین شت ئەویە کاتەکان لە قسەی بێسوود بەفیڕۆ دەدات، ئیتر مورید لەم نیشتمانە ناگەڕێتەوە تەنها بە دڵتاریکی و پەرشوبڵاوی لە ئیرادە و بێئاگایی لە یادی ئاخیرەت نەبێ، دەبێتە دڵنەخۆش کە ڕۆژانێکی زۆر بە چارەسەرکردنی ماندوو دەبێ تا وەکوو خۆی لێ دێتەوە، ڕەنگە وەکوو خۆشی لێ نەیەتەوە، چونکە مورید لاوازی تێدایە، ئەگەر شێخێکی بینی ئەزموونی کردووە و زانیویەتی، پاشان بێکاری و تەنبەڵی هەڵدەبژێرێت، دوور نییە تەبیات شوێنی بکەوێت.

ئەمڕۆ بۆ مورید باشترە جگە لە گۆڕستان سەردانی هیچ شوێنێکی تر نەکات و تەنها لەگەڵ کتێب – کە چاکی و باشییەکانی پیاوچاکانی تێدایە – گفتوگۆ بکات، بۆ وەدەسهێنانی ئەو شتانەی پێی ڕازییە با داوای یارمەتی لە خودا بکات، ئەگەر ویستی لەسەر بوو ئەوا ئامادەی دەکات بۆ ئەوە شتانەی پێی ڕازییە.

## ٢٦٥- سیفەتی پیاوچاکان

سەرنجم دایە ئەوانەی خودا بۆ نزیکایەتیی خۆی هەڵیاندەبژێرێت — وەسفەکانمان بیستوون یان ئەوانەی بینیومانن و پێمان وایە لەوانن — دیتم خودا تەنها کەسێکی شێوە تەواو کە هیچ عەیبێك لە شێوەیدا نەبێت و کەمورکورتییەك لە دروستکردنیدا نەبێت هەڵدەبژێرێت، دەیبینیت جوانڕوو و بەژنڕێك و لە هەموو دەردێکی جەستە ساغ و بەدوورە، پاشان لە ناخیشدا کامڵ و تێروتەواوە، چاوتێر و بەخشندە و ژیرە، فێڵباز و ڕقلەدڵ و حەسوود نییە، هیچ عەیبێك لە عەیبەکانی ناوەوەی نییە، ئەمە ئەوەیە لە گچکەییەوە پەروەردەی دەکات.

دەیبینی هەر لە منداڵییەوە لە منداڵان دوورەپەرێزە وەکوو ئەوەی هەر لە گچکەییەوە وەکوو پیرێك بێت، خۆی لە کردەوە ناشیرینەکان بەدوور دەگرێت و لە کێماسییەکان دەترسێت.

پاشان بەردەوام درەختی هیممەتی گەشە دەکات تا دەبینیّ بەرەکەی بەسەر لقەکانی لاوێتیدا شۆڕ بۆتەوە، لەسەر زانست سوورە و سەرقاڵی کار و کردەوەیە، ئاگای لە کات و زەمانە و ڕێزی وەخت دەگریّ، بۆ وەدەسهێنانی چاکە و باشی و ڕەوشتە بەرزەکان لە کۆششدایە، لە کەموکورتییەکان دەترسیّ.

ئەگەر یارمەتی و ئیلهامی خودایت بینی چۆن دەستی دەگرێ ئەگەر ساتمەی کرد و لە هەڵەکردن ڕێی لێ دەگرێ ئەگەر ویستی بیکات و، لە چاکەکاندا بەکاری دێنێ و کار و کردەوەی دەشارێتەوە تا لێی نەبینرێ.

پاشان ئەمانەش دابەش دەبن: هەیانە لەسەر زوهد و خواپەرستی فێربووە، هەیانە لەسەر زانست و شوێنکەوتنی سوننەت فێربووە، ئەوانە دەگمەنن کە خوا هەمووی بۆ کۆبکاتەوە و بەرزی بکاتەوە بۆ کێبڕکێی کامڵ و تێروتەواوان.

نیشانەی چەسپاندنی کەماڵ لە زانست و کردەوەدا بەتەواوی ڕووکردنە سەودا و خۆشەویستیی خودا و لە خۆگرتنی هەموو چاکە و ڕەوشتە جوانەکان و لوتکەی هیممەت لە وەدەسهێنانی کەمالی مومکیندایە، ئەگەر تەسەوڕ کرابا کە پێغەمبەرێتی وەدەست دێت ئەوا دەچووە نێو لیستی وەدەسهاتنەکانی.

ئەم ئاستانە وەسف ناکرێن و چەشنی مرواری بوون وان کە لە هەموو سەدەفێکدا دەست ناکەون.

## ٢٦٦- بێئاگاییی گەورە

زۆرینەی خەڵك سروشت و خووی خراپیان هەیە، پەروەردە و ڕاهێنان ڕاستیان ناکاتەوە، نازانن بۆچی خوڵقێنراون؟! ئامانج و مەبەست لە هاتنەدونیایان چییە؟! ئەوپەڕی هەوڵ و هیممەتیان بەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجەکانیانە لە دونیا، ئیتر لەوە ناپرسن و ناپێچنەوە کە ئەم وەدەسهێنانە چ زەم و نەنگییەکیان بۆ دێنێ! ئابڕوو دەکەنە قوربانیی کاڵای دونیا و، چێژی ساتێك هەڵدەبژێرن تەنانەت ئەگەر زەمانێك گیرۆدەی نەخۆشییان بکات! لە کاتی بازرگانییدا بە دروشمێکی باقوبریقی فریودەرەوە پۆشاکی فێڵباز دەپۆشن و لە سەودا و مامەڵەکاندا فرتوفێڵ بەکاردێنن و ئێستا دەشارنەوە! ئەگەر پارەیان بەدەست هێنا ئەوا جێی گومانە و ئەگەریش خواردیان ئەوا بە شەهوەتەوەیە! شەو دەخەون، ئەگەرچی بە ڕۆژیش بە هۆی بێئاگایی و مەستییەوە هەر نووستوو حیسابن! کە بەیانی لە خەو هەڵدەستن دەست دەکەن بە هەوڵ و کۆشش بۆ وەدەسهێنانی ئارەزووەکانیان چەشنی سووربوونی بەراز و کلکەلەقێی سەگ و نێچیرگرتنی شێر و پەلاماری گورگ و فرتوفێڵی ڕێوی! لە کاتی مردنیشدا ئاخ و ئۆفی لەدەستدانی ئارەزوو هەڵدەکێشن نەك بێ تەقوایی! ﴿ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ﴾ (النجم: ٣٠) واتە: ئەوەیە ئەندازەی زانست و زانیارییان!

ئەو کەسە چۆن ڕزگار دەبێت کە ئەوەی بە چاو دەیبینێ باوی دەدات بەسەر ئەوەی بە هۆش دەیبینێ، ئەوەی بە چاو دەیبینێ خۆشەویستترە لە لای لەوەی بە چاوی دڵ و بینایی دەیبینێ؟!

سوێند بە خوا، ئەگەر گوێیەکانیان بکەنەوە، لە سەردەمی نیشتەجێبووندا گوێیان لە بانگدەری کۆچکردن دەبوو لە گۆڕەپانەکانی دونیا هاوار دەکات: سەیری تێکدان و پێچانەوەی دەوارەکانی پێشینان بدەن! بەڵام مەستیی نەزانی و نەفامیی داپۆشیون، تەنها بە لێدانی حەد بەئاگا دێنەوە.

## ٢٦٧- خودا تەنها شتی پاك وەردەگرێ

هەندێ لە پێشڕەوانم بینی پرسیاری لێکرا لەبارەی ئەو سوڵتان و میرانەی لە حەڵاڵ و حەرام پارە بەدەست دێنێ و پاشان مزگەوت و خانەقای پێ دروست دەکات: ئایا پاداشتی هەیە؟ بە جۆرێك فەتوایدا کە بە دڵی کەسی پارەبەخش بوو و ئاماژەی بەوەدا کە لە بەخشینی ئەوەی موڵکی خۆی نییە جۆرێك لە دەڵاڵی هەیە، چونکە ئەو خودی ئەو کەسانە ناناسێ کە پارەکەی لێ زەوت کردوون تا بۆیان بگەڕێنێتەوە!

وتم: سەیر لەوانەی شان دەدەنە بەر فەتوادان و بنچینەکانی شەریعەت نازانن!!

یەکەم جار پێویستە سەیری حاڵی ئەم پارەبەخشە بکرێت: ئەگەر سوڵتان و دەسەڵاتدار بوو، ئەوەی لە خانەی دارایی (بیت المال) دەردەهێنرێت زانراوە لە کوێ و بۆ کێ خەرج دەکرێت، ئیتر چۆن نادرێ بەو کەسەی شایستەیەتی و لە شتی بێسوودی وەکوو دروستکردنی قوتابخانە و خانەقا بەکاری دێنێ؟!

ئەگەریش پارەبەخش لە میر و جێگر و نوێنەرانی دەسەڵاتدار بوون ئەوا دەبێ ئەو پارانە بگەڕێنێتەوە کە پێویستە بۆ خانەی دارایی بیگەڕێنێتەوە، تەنها مافی

ئەوەی هەیە کە بۆی دیاریکراوە، ئەگەر لە غەیری ئەوە خەرجی کرد ئەوا خەرجکردنی شتێکە کە مافی وی نییە، ئەگەر ئیزنیش بدرێ ئیزندانەکە ڕەوا نییە.

ئەمە ئەگەر ماڵەکە ساغ و حەلاڵی خۆی بوو، بەڵام ئەگەر حەرام یان زەوتکراو بوو هەموو ڕەفتار و خەرجکردنێکی حەرامە و پێویستە بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کەسەی لێی وەرگرتووە یان بۆ میراتگرەکانی، ئەگەر ڕێگای گەڕاندنەوەی نەزانی و لە خانەی داراییی موسڵمانان بوو ئەوا بۆ سوود و بەرژەوەندی ئەوان یان لە خێر و صەدەقەدا خەرج دەکرێ. پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((هەر کەسێك ماڵ و پارەیەکی بە تاوان و گوناهـ بە دەست هێنا، بەو ماڵە چاکەی لەگەڵ خزمان کرد یان خێری پێ کرد یان لەپێناو خودا بەخشی، ئەوا هەموو کۆدەکرێتەوە و پێکەوە فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە)) حسن، ئەبوو داوود گێڕایتیەوە.

بەڵام ئەگەر بنیاتنەر بازرگانێکی حەلاڵخۆر بوو، مزگەوتێکی بنیاتنا یان شتێکی بۆ فەقێ و زانایان وەقف کرد ئەمە لەسەری پاداشت دەدرێتەوە.

دەبێ کەسی حەلاڵخۆر زەکاتی ماڵەکەی دەربکات پاشان ئەم کاری بنیاتنان و بەخشینە بکات چونکە ئەم جۆرە بنیاتنانە نابێ لە پارەی زەکات بێت. کوا سەلامەتیی نییەت و خاوێنیی مەبەست؟!

پاشان ئەمڕۆ بنیاتنانی قوتابخانە سەرکێشییە چونکە زۆربەی زانایان سەریان ناوەتە سەر زانستی مشتومڕ و پشتیان لە زانستەکانی شەریعەت کردووە و وازیان لە هامۆشۆی مزگەوتەکان هێناوە و بە قوتابخانە و ناسناوەکان قایل بوون.

سەبارەت بە بنیاتنانی خانەقاش ئەوا هیچ ئەسڵ و بنچینەیەکی نییە چونکە زۆرینەی سۆفییەکان لەسەر ڕایەخی نەزانی و تەنبەڵی دانیشتوون، پاشان بانگەشەکارانیان بانگەشەی خۆشەویستی و نزیکایەتی دەکەن و ڕقیان لە مەشغوولبوون بە زانستە و وازیان لە ژیاننامەی (سەری سەقەتی) و خوو و نەریتەکانی (جونەیدی بەغدادی) هێناوە و تەنها بە ئەنجامدانی فەرزەکان و بە جلکی پینەدار ڕازی بوون، هاوکاریکردنیان لەسەر بێکاری و بە ئیسراحەت دانیشتنیان باش نییە و هیچ پاداشتێکی نییە.

## ٢٦٨- بەرهەمی دڵسۆزی

سەیرم دێ لەو کەسەی بە زوهد خۆی بۆ خەڵك نمایان دەکات، بەوە گەرەکیەتی خۆی لە دڵیان نزیك بخاتەوە و لەبیری دەچێتەوە کە دڵیان بە دەست ئەو زاتەیە کە کاری بۆ دەکات، ئەگەر ئەو زاتە بە کارەکەی ڕازی بوو و بە پاك و بێگەردی بینی ئەوا دڵەکانی ڕوو تێ دەکات، ئەگەریش بە پاك و خاوێنی نەبینی ئەوا دڵەکانی ڕوو لێ وەردەگێڕێ.

هەر کاتێ ئەو کەسەی کار دەکات چاوی لە ئاوڕدانەوەی دڵەکان بوو بۆی ئەوا لە شیرك نزیك دەبێتەوە چونکە دەبێ بە سەیرکردنی ئەو زاتەی کاری بۆ دەکات قەناعەت بکات.

لە پێویستییەکانی دڵسۆزی ئەوەیە کە مەبەستی ئاوڕ لێ دانەوەی دڵەکان نەبێت، چونکە ئەوە بە نیازی وی نایەتەدی بەڵکوو بە پێناخۆشبوونی بۆ ئەوە دەبێت.

با مرۆڤ بزانێت کە خەڵك بە گشتی بە هەموو کارەکانی دەزانن ئەگەر ئاگاشیان لێی نەبێت، دڵەکان بۆ پیاوباش و چاك بە باش شایەتی دەدەن ئەگەر ئەوەشی لێ نەبینن.

بەڵام ئەوەی مەبەست و نیازی لە کارەکەی دیتنی خەڵك بێت ئەوا کارەکە بەفیڕۆ چووە چونکە لە کن خودا و خەڵکیش قەبووڵکراو نییە، چونکە دڵەکان ڕوویان لێ وەرگێڕاوە، ئیتر زانست بەفیڕۆ چوو و تەمەنیش ڕۆیشت!

بەندە با لە خودا بترسێت و مەبەستی لە سوودگەیاندن تەنێ ئەو بێت و بە پیاهەڵدانی خەڵك سەرقاڵ نەبێ.

## ٢٦٩- زانایانی ئاخیر زەمان

زانایەکی ولاتی عەجەمان هاتە لامان کە لە ولاتـی خۆیـدا دادوەر بـوو، زێـڕم بەسـەر ولاخەکەیەوە دیت و پەرداخی زیوی پێبوو، شتگەلێکی زۆریش لـە حـەرامکراوەکان، وتم: زانست چ سوودێکی بەمە گەیاندووە؟! سوێند بە خوا بەڵگـەی بەسـەرەوە زۆر بووە.

گەورەترین هۆکـار کـەم زانیـاری ئەمانەیـە لـەبارەی ژیاننامـەی پێشـینان و ئـەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەری بووە.

ئەوان ڕستە نازانن کەچی بە زانسـتی خیلافـەوە سـەرقاڵ دەبـن و، مەبەسـتیانە بـە تـوێکڵی زانسـتەوە بچـنە پێشـەوە، بیسـتنی فـەرموودە و سـەیرکردنی ژیاننامـەی پێشینانیان بە لاوە گرینگ نییە...تێکەڵی دەسەڵاتداران دەبـن و پێویسـتیان بـەوە دەبێ چەشنی ئەوان بپۆشن، ڕەنگە بە خەیاڵیاندا بێت کە ئەمە نزیکە، ئەگەریش بە خەیاڵیاندا نەیەت ئەوا ئارەزوو بێ ڕێگر زاڵە... ڕەنگە بە خەیاڵیاندا بێت بڵێن: ئەمە ئەگەری هەیە و لەبەر سەرقاڵبوونمان بە زانست چاوپۆشـیمان لێ دەکـرێ... پاشـان دەبینن زانایان بۆ وەدەسهێنانی شتێك لە دونیایـان ڕێزیـان دەگـرن و ڕەخنـەیان لێ ناگرن.

لەوانەی خۆ دەدەنە پاڵ زانست دیتوومە هاوڕێیەتیی مێردمنداڵی لووسکەڵە دەکەن و کۆیلان دەکرن، هیچ کەسێك ئەمە ناکات مەگەر لە ئاخیرەت بێهیوا بووبێت.

زانام بینیوە تەمەنی گەیشتۆتە هەشتا ساڵ و لەسەر ئەم حاڵەتە بووە.

ئەی ئەوەی دەیەوێت دینی بپارێزێ و باوەڕی بە ئاخیرەت هەیە بۆ خاتری خوا وریای تەئویلاتی گەند و خراپ و ئارەزووە زاڵەکان بن، ئەگەر لە چوونەناوەوەی هەندێکیان شلڕەویت کرد ئەوا بۆ ئەوانی تریشت پەلکێش دەکات و لەبەر دەقگرتن بە ئارەزووەوە ناتوانیت لێی دەرچیت.

ئامۆژگارییەکەم وەرگرە و بە کەرتە نانێك ڕازیبە و لە دونیاپەرستان دووربە، ئەگەر ئارەزوو هاواری کرد بۆ ئەمەی لێگەڕێ... ڕەنگە پێت بڵێ: بابەتی فلان نزیکە! وا مەکە، چونکە - ئەگەر نزیك بایە - بانگی بۆ غەیری وی دەکرد و، قەرەبووکردنەوەش دژوار دەبێ.

تکایە ئارام بگرن لەسەر ژیانی سەخت و ناخۆش و دووربوون لە ئارەزووپەرستان! بەوە نەبێ دین تەواو نابێ، هەر کاتێ شلڕەوی ڕوویدا ئەوا بەرەو هیترت دەبات، وەکوو کەنار بەرەو شەپۆلی دەریا...

## ٢٧٠- سنووری عەقڵ

هەر کەسێ بیر لە گەورەیی خودا بکاتەوە عەقڵی دەپەشۆکێت و پەرتوبڵاو دەبێت، چونکە ئاتاجی سەلماندنی هەبوویەکە کە سەرەتای بوونی نییە، ئەمەش شتێکە هەست نایزانێ، بەڵکوو عەقڵ بە زەرووڕەت دانی پێدا دەنێ، دوای ئەم دانپێدانانەش واقوڕماو و حەپەساوە !

پاشان لە کردارەکانییەوە شتگەلێك دەبینێ بەڵگەن لەسەر بوونی، ئیتر بوونی ون نابێ. پاشان لە قەدەرەکانیدا شتگەلێك ڕوودەدەن کە ئەگەر چەسپاندنی بەڵگە نەبێ لەسەر بوونی ئەوا باوەڕنەبوونی پێویست دەکرد.

دەریا بۆ بەنی ئیسرائیل لەت دەکات — ئەوەش شتێکە جگە لە خودا کەسی تر ناتوانێ بیکات — وە گۆچان دەکاتە مار پاشان دەیکاتەوە گۆچان و ئەوەی جادووکەرەکان چنیبیان کردبوو هەڵدەلووشێ و هیچ شتێکیشی لێ زیاد نابێ، دوای ئەمە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە؟ کە جادووکەرەکان باوەڕ دێنن بۆ فیرعەون لێیان دەگەڕێ لە داریان بدات و ئەویش ڕێگری ناکات، پێغەمبەران گرفتاری برسێتی و کوشتن دەبن و زەکەریا دوو لەت دەکرێ و یەحیا ژنە زیناکەرێك دەیکوژێ، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هەموو وەرزێکی حەج دەڵێ: ((کێ پەنام

دەدات؟ کێ یارمەتیم دەدات؟)) خەریکە کەسی نەزان بە بوونی خودا بڵێ: ئەگەر خودا هەبووایە یارمەتی دۆستەکانی دەدا!

ئەو عاقڵەی بوونی خودا لە لای بە بەڵگەی دیاری ڕوون چەسپاوە پێویستە لەسەری کە ڕێ بە عەقڵی نەدات ڕەخنە لە کردارەکانی بگرێت و داوای هۆکاریش نەکات چونکە سەلماوە و چەسپاوە کە خودا خاوەندار (مالك) و دانایە، ئەگەر لە حیکمەتی کردەوەی تێ نەگەیشتن و لێمان ون بوو ئەوا ئەوە دەگەڕێنینەوە بۆ دەستەپاچەیی لە تێگەیشتنمان.

چۆن نا، حەزرەتی موسا سەلامی خوای لێ بێت دەستەوسان بوو لە زانینی حیکمەتی کونکردنی کەشتییەکە و کوشتنی منداڵەکە، کاتێ حیکمەتی ئەم کردەوانەی بۆ ڕوون بوویەوە – کە لە ڕواڵەتدا خراپەکاری بوو – دانی نا دەستەوسانی خۆی؟

ئەگەر حیکمەت لە کردەوەکانی خودا ڕوون بایەوە ئەوا عەقڵ چەشنی موسا کە لە خدر بەگومان بوو ئینکاری نەدەکرد!

هەر کاتێ بینیت عەقڵ دەڵێ: بۆچی؟ بەم قسەیە بێدەنگی بکە: ئەی دەستەوسان! تۆ حەقیقەتی خۆت نازانی، چیت داوە لە ڕەخنەگرتن لە خودای خاوەندار؟!

ڕەنگە عەقڵ بڵێ: چ سوودێك لە تاقیکردنەوەدا هەیە کە خودا دەتوانێ بە بێ تاقیکردنەوە پاداشت بدات؟! چ مەبەستێك لە ئازاردانی ئەهلی دۆزەخدا هەیە لە کاتێکدا لەوێ دڵخۆشبوون بە تۆڵەکردنەوە نییە؟! پێی بڵێ: حیکمەتی وی لە

سەرووی ئاستی تۆیە، تەسلیم بە بەوەی نایزانی، یەکەم کەس کە بە عەقڵ ڕەخنەی گرت ئیبلیس بوو، پێی وابوو ئاگر لە قوڕ باشتر و فەزڵی زیاترە بۆیە کڕنووشی نەبرد.

خەڵکێکی زۆرمان بینی و لێمان بیستن کە تانە لە حیکمەت دەدەن چونکە عەقڵ دەخەنە کار و دەیکەنە حەکەم و لەبیریان دەچێتەوە کە حیکمەتی خودا لە سەرووی عەقڵەکانە.

نەکەیت و وریابە ڕێ بۆ عەقڵت خۆش بکەیت هۆکارسازی و پاساوهێنانەوە بکات یان داوای وەڵامی ڕەخنە بکات و پێی بڵێ: تەسلیم بە سەلامەت دەبی، چونکە تۆ قووڵاییی دەریا نازانیت ئیللا بەر لەوە نقووم بوویت و خنکاویت.

ئەمە بنچینەیەکی گەورەیە هەر کاتێ لە دەست مرۆڤ چوو ئەوا ڕەخنەگرتن بەرەو بێباوەڕی دەبات.

## ٢٧١- پەند لە خۆت وەربگرە

سەیر و سەمەرە لەو کەسەیە کە دەڵێ: بڕۆ گۆڕستان تا بە هۆی مردووەکانەوە پەند وەربگریت!! ئەگەر تێ گەیشتبا دەیزانی خۆی گۆڕستانێکە کە پەند وەرگرتن لە خۆی بێنیازی دەکات لە غەیر! بەتایبەتی کەسێك بەتەمەندا چووبێت شەهوەتی لاواز بووە و هێزی کەم بووە و هەستەکانی کول و سست بوون، چالاکی سارد بووەتەوە و مووشی سپی بووە...

با پەند لەو شتانە وەربگرێ کە لە دەستی داوە و واز بێنێ لە یادکردنەوەی ئەوانەی لەدەست چوون، بەوەی خۆی هەیەتی بێ نیاز بووە لە سەرنجدان و ملەقوتێ بۆ غەیر.

## ٢٧٢- ژیر چێژ له دونیا نابینێ

هەر کاتێ عەقڵ تێروتەواو بوو چێژی دونیا نامێنێ، جەستە پووکایەوە و نەخۆشی بەهێز بوو و خەم زۆر بوو. چونکە هەر چەند عەقڵ سەرنجی سەرەنجامەکان بدات پشت لە دونیا دەکات و ئاوڕ بۆ ئەو شتە دەداتەوە کە سەرنجی داوە، چێژ لە هیچ شتێکی دونیا وەرناگرێ بەڵکوو بێئاگایان لە چێژی ئاخیرەت بێبەشن، کەسێك عەقڵی تێروتەواو بێت تووشی بێئاگایی نابێ، بۆیە ناتوانێ تێکەڵی خەڵك ببێت چونکە ئەوان لە ڕەگەزی وی نین.

## ٢٧٣- باوەڕبوون بە زیندووبوونەوە

دەڵێم: هەر کەسێك تانەی لە زیندووبوونەوە دا ئەوا لە تانەدان لە حیکمەت زێدەڕۆیی کردووە.

هەر کەسێك وتی: ڕۆح شتێکی ناجەوهەری و کاتییە (عَـرَض) ئەوا نکوڵی لە زیندووبوونەوە کردووە چونکە (عَرَض) نامێنێتەوە و جەستە دەبێتە خۆڵ، ئەگەر شتێك پەیدابوو ئەوا سەرەتای بەدیهێنانە.

سوێند بە خوا نەخێر وانییە، بەڵکوو خودی نەفس بە ڕۆح و جەستەوە دووبارە زیندوو دەکرێتەوە بە بەڵگەی دووبارەکردنەوەی باسکراوەکانی: ﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنۡهُمۡ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٞ ٥١﴾ (الصافات: ٥١) واتە: یەکێك لەوان گوتی: من هاوڕێیەکم هەبوو..

سوێند بە دەسەڵات و شکۆی خودا، لوتفی لە سەرەتا بەڵگەیە لەسەر کۆتایی...

دایك و باوکی بەسۆز کردووە و شیری لە مەمکەکان زاندووە و خۆراکی چێ کردووە و عەقڵی لە سەرەنجامەکان ئاگادار کردۆتەوە...ئایا دوای ئەم ڕێکخستن و تەگبیرە، جوان و ڕاستە بگوترێ: خودا دوای مردن مرۆڤ فەرامۆش دەکات و زیندووی ناکاتەوە؟!

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی زۆرێك لە دڵەکانی لە ناسینی خۆی کوێر کردووە.

## ٢٧٤- سەلامەتی لە تەسلیمبووندایە

پـاك و بێگـەردی بـۆ ئـەو خودایـەی بـۆ خـەڵقی خـۆی وەهـا دەركـەوتووە تـا ئـەوەی هـیچ نادیـاری و ونییـەك نـەماوە، پاشـان وەهـا نادیـار و شـاراوە بـووە دەڵێی هیچی دیار نییە!

چ دەركـــەوتنێك ڕوونـــترە لـــەم دروســـتكراوانەی هـــەموویان دەڵـــێن: ئێمـــە دروســـتكەرێكمان هەیـــە، دروســـتی كـــردووین و لەســـەر یاســـای حیكمـــەت ڕێكـــی خستووین؟!

بەتایبـــەتی ئـــەم ئـــادەمیزادە كـــە لـــە دڵۆپـــەئاوێك چـــێی كـــردووە و لەســـەر ســـەیرترین سروشـــت بنیـــاتی نـــاوە و تێگەیشـــتن و زەیـــن و ئاگـــایی و زانســـتی پـــێ داوە و زەوی بـــۆ ڕاخســـتووە و ئـــاو و بـــای بـــۆ جـــەریان كـــردووە و ڕووەكـــی بـــۆ ڕووانـــدووە و ئاسمـــانی بـــۆ بـــەرز كردۆتـــەوە، لـــە ڕۆژدا چـــرای هـــەتاوی بـــۆ داگیرســـاندووە و، تاریكـــایی بـــۆ ئـــارامگرتن و حەســـانەوە هێنـــاوە...هیتریش كـــە بـــۆ هـــەمووان دیـــارە.. هـــەموو ئـــەم دروســـتكراوانە بـــە دەنگێكـــی ڕوون و ڕەوان ئامـــاژە بـــە بـــوونی خوڵقێنـــەریان دەكـــەن..خودای خوڵقێنـــەر بـــەم كردارانـــەوە نمایان بووە و ون و پەنهان نەبووە..

پاشـان پێغەمبـەرانی بـە هـەزاری لـە دونیـا و جەسـتە لاواز نـاردووە، بـەڵام لەسـەر دەسـتی ئـەوان سـتەمکارانی ملـهوڕی تێکشـکاندووە و پەرجووگـەلێك (معجـزات)ی دەرخسـتووە کـە لـە توانـای مرۆڤـدا نییـە.. هـەموو ئەوانـە بـانگی خودای هەق دەدەن..خوداش بەمانە بۆ بەندەکانی خۆی دەرخستووە..

پاشـان مووسـا سـەلامی خـوای لێ بێـت دێـت بـۆ لای دەریـا و لـەت دەبێـت، ئـیتر هـیچ گومانێـك نـامێنێ لـەوەی کـە خـودا ئـەم کـارەی کردووە..عیسـا سـەلامی خـوای لێ بێت لەگـەڵ مـردوو قسـە دەکـات و هەڵدەسـێتەوە..وە خـودا باڵنـدەی پـــۆل پـــۆل دەنێـــرێ بـــۆ پاراســـتنی ماڵەکـــەی (کەعبـــە) و هێرشـــبەران لەناودەبات.

ئـەم بابەتـە باسـکردنی هـەمووی درێـژ دەبێـتەوە، هـەموویان بەڵگـەن لەسـەر دەرکەوتنی ڕوون و ئاشکرای خودا..

ئەگـەر ئـەوە لـە لای ژیـران بـێ هـیچ گومانێـك چەسـپا و سـەلما، پاشـان شـتگەلێك هـاتن وەکـوو ئـەوەی شـاردنەوەی ڕواڵـەت بێـت وەکـوو زاڵکردنـی دوژمنـان بەسـەر دۆسـتانی خودا...ئەگـەر دەرکـەوتن بـە بەڵگـەی تـەئویل هەڵنـەگر چەسـپا ئـەوا دیـارە و دەیـزانین کـە ئـەم شـاردنەوەیە نهێنییـەکی هەیـە ئێمـە نـایزانین، وا پێویسـت دەکـات لەسـەر عـەقڵ کـە تەسـلیمی خـودای دانـا بێت..

ئـيتر هـەر كەسێك تەسلیم بێت سەلامەت دەبێ و هەر یەكێكیش ڕەخنە بگرێت لەناودەچێت.

## ٢٧٥- كاركردنی بێ زانست

خاوەنی هەموو مەزهەبێك بانگەشەی هەوڵدان (الاجتهاد) بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیدا دەكات و زۆربەشیان مەبەستیان تەنها هەقە، دەبینی ڕاهیب خواپەرستی دەكات و خۆی برسی دەكات، جوولەكە خۆی زەلیل دەكات و جزیە دەدات، خاوەنی هەموو مەزهەبێك زیادەڕەوی تێدا دەكات و بەرگەی ستەم و ئازار دەگرێ، ئەمەش بە باوەڕی خۆی بۆ دەسكەوتن و دۆزینەوەی ڕاستی و وەدەسهێنانی پاداشتە، لەگەڵ ئەوەشدا عەقڵ زۆربەیان بە گومڕا دەزانێ.

ئەمەش ئاڵۆزە. بۆ دۆزینەوەی پێویستە ڕێگای ڕاست بە هۆكارەكانییەوە داوا بكرێ و ئیجتیهاد بە ڕوونكردنەوە بكرێ، ئەوەی هۆكارەكانی تێدا نەبوو یان هەندێ لە ئامرازەكانی لەدەست دا ئەوا پێی ناوترێ موجتەهید.

جوولەكە و مەسیحییەكان پێكهاتوون لە زانایەك كە ڕاستگۆیی پێغەمبەرمانی زانیوە بەڵام لەبەر خاتری مانەوەی سەرۆكایەتییەكەی نكوڵی دەكات، ئەمەش كەللەڕەق و نەسەلمێنە. یەكێكی تر لاساییكەرەوەیە و بە عەقڵ بۆ شتەكان ناڕوانێ، ئەمەش پشتگوێخەرە، لەگەڵ پشتگوێخستنی ئەسڵدا خواپەرستی دەكات، ئەوەش سوودی نییە. هەیشە سەیر دەكات و سەرنج دەدات بەڵام بەڕاستی وردنابێتەوە و دەڵێ: بەپێی تەوڕات دینەكەمان هەڵناوەشێتەوە ! هەڵوەشاندنەوەی

شەریعەتەکان بە هۆی جیاوازیی کات و سەردەمەکانەوە ڕاستییە بەڵام دەڵێ: هەڵوەشاندنەوە ڕاستکردنەوەی شتێکە کە پێشتر نەزانراوە دواتر زانراوە! سەیری جیاوازیی نێوانیان ناکات، پێویستە بەڕاستی سەیر بکات و وردبێتەوە.

لەم جۆرە، خواپەرستیی خەواریجەکانە لەگەڵ قەناعەتیان بە زانستی ناتەواویان کە دەیانگوت: حوکم تەنها بۆ خودایە، تێ نەگەیشتن کە تەحکیم لە حوکمی خوایە، شەڕکردن دژی ئیمامی عەلی و کوشتنیان لەسەر گومانی هەڵە بنیاتنا.

کاتێ (موسلیم کوڕی عەقەبە) شاری مەدینەی تالآن کرد، وتی: ئەگەر دوای ئەمە چوومە ناو ئاگر ئەوا بەدڵنیاییەوە من بەدبەختم.

بە نەزانیی خۆی وای گومان برد کە کاتێ خەڵکی مەدینە سەرپێچی پەیماندان بە زەیدیان کرد ئیتر حەڵاڵکردنی سەر و ماڵیان و کوشتنیان دروستە!

واوەیلا بۆ ڕەشۆکییەکی کەم زانست، لە هیچ ڕووداوێك خۆی تۆمەتبار ناکات و پرسیش بە کەسی لە خۆی زاناتر ناکات، بەڵکوو بە گومانەکەی بڕیار دەدات و هەنگاو دەنێ.

ئەمە بنچینەیەکە پێویستە لێی وردبینەوە، بە هۆی پشتگوێخستنیەوە خەڵکێکی زۆر لەناوچوون، خەڵکێکی ڕەشۆکیمان بینی کە ڕووداوێکیان لێ قەوما فەتوا قەبووڵ ناکەن.

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ۝٢ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ۝٤ ﴾ (الغاشية: ٢ - ٤) واته: هەندێ ڕوو لە ڕۆژی دوایی کز و شۆڕە، کارکەرێکی بابردەڵەی ڕەنج بە خەسارە، دەچێتە ناو ئاگرێکی گەرمەوە..

# ٢٧٦- پاراستنی زەخیرەکانی جەستە

نەفس چەند زەخیرەیەکی لە جەستەدا هەیە وەکوو: خوێن و مەنی و شتگەلێك کە پێیەوە بەهێز دەبێ، ئەگەر زەخیرەکان تەواو بوون و هیچیان لێ نەمایەوە ئەوا ئەویش دەڕوات.

لە زەخیرەکان: خۆبەهێزکردن بە ماڵ و پایە و دەسەڵات و ئەوەی دەبێتە مایەی خۆشی و شادی، ئەگەر ئەوەی لەدەستدا و خۆیشی کەسێکی بەشکۆ و نەفسبەرز بوو ئەوا دەپەشۆکێت.

ڕەنگە ترس هێرشی بۆ بێنێ، زەخیرەیەکیشی لە ئومێد نییە بەرەنگاری ببێتەوە ئیتر لەدەست دەچێ.

وە خۆشیی و شادی بەسەریدا زاڵ دەبێ و خەمێك نییە بەرەنگاری ببێتەوە ئیتر لەدەست دەچێ.

هەوڵی پاراستنی زەخیرەکانی جەستەت بدە، بەتایبەتی ئەگەر پیر بوو، پێویستە بە وەدەرنانی خوێن و مەنی دڵخۆش نەبێ، ئەگەریش حەزی پەڕین زۆر بوو – مەگەر حەزەکە زیاد لە حەد بوو – ئەوا هەر کاتێك پێویست بوو با شتی ئازاردەر بکاتە دەرەوە، نیشانەی ئازاردەری شتێکیش بوونی خۆشی و ئیسراحەتە لە کاتی

دەرچوونی، هەر کاتیٚ هەستی بـە لاوازی و بێتاقـەتی کـرد ئـەوا دەرچـوونی ئـازاری داوە.

با کەسی نەفسبەرز شەرم و شکۆی خۆی بپارێزێت بەوەی لە شوێنێك نەوەستیٚ کـە عەیبەی لیٚ دەگیریٚ، چونکە ئـەو خـاوەن زەخـیرەی شـکۆ و نەفسـبەرزییە، بـوونی دزێکی ئەوە دژایەتیکردنی نەفسە.

هەروەها پێویستە بە مالٚ و سامان خۆی بۆ کۆتاییی تەمەن ئامادە بکات لـە ترسـی ئەوەی ئاتاج و حەوجەی دەستی نامەرد بێت یان بە پیری هەولٚ بدات و کار بکات.

ئەگەر مالٚ و میراتی بۆ دوژمنەکەی بەجیٚ بێلێت باشترە لـەوەی ئاتـاجی هاوڕێکـەی بێت.

ئاوڕ نەداتەوە بە لای ئەو کەسانەی زەمـی مـالٚ و سـامان دەکـەن، ئەوانـە گەمـژەی نـەزانن و بــە تــەمای پارچــە نانێـك پالٚیــان داوەتــەوە و تەنبــەلٚی و تــەوەزەلی و ئیسراحەتیان لیٚ خۆش هاتووە، خواردنی صەدەقە و سوالٚکردنیان لە کن ئاسـاییە و پێیان شەرم نییە، هەموو پێغەمبەرێك و هـەموو هـاوەلآن بـژیو و گـوزەرانی خۆیـان هەبووە، مالٚ و سامانێکی زۆریشیان بەجیٚ هێشتووە.

لەم بنچینەیە تیٚ بگە و گرینگی بە قسەی نەزانان مەدە و ئاوڕی لیٚ مەدەوە.

## ٢٧٧- زوهدی درۆزن

لە زاهیدانی سەردەمەکەمان ئەوەندە خۆبەلزانی و پاراستنی نهێنی و پایەی دەسەلاتم لە دڵی ڕەشۆکییان بینی نزیکە بەدڵنیاییەوە بڵێم ئەوان ئەهلی ڕووپامایی و دووڕوویین!

یەکێکیان دەبینی ئەو جلکە لەبەر دەکات کە بە چاوی زوهد دەبینرێ و خواردنی خۆش دەخوات و لە هاوڕەگەزەکانی خۆی بە گەورە دەگرێ و دۆستایەتیی دەوڵەمەندان دەکات و لە هەژاران دوور دەکەوێتەوە و پێی خۆشە بە (مەولانا) بانگ بکرێ و بدوێنرێ و بە تەنیشتیەوە بڕۆن و کات و سەردەم لە وڕێنە بەفیڕۆ دەدات و بە خزمەتکردنی خەڵك بۆی و سڵاو لێکردنی دەژی.

ئەگەر جلوبەرگی زانایانی پۆشی ئەوا پایە و دەسەلات دەڕوات و هیچ هۆگر و پەیوەستێکی بە دەورەوە نامێنێ!

ئەگەر کردەوەکانی لەگەڵ جلوبەرگەکانی بگونجێن ئەوا شتەکە ئاسان و ئاسایی بوو بەلام فێڵبازی و ئارایشتکارییەکانیان بە جۆرێکە لە خەڵکیش شاراوە نییە ئیتر چۆن لە لای خودا شاراوە دەبێت؟!

## ٢٧٨- سەرقاڵبوون بە بژێوی ژیان

ئەم واتایە زۆر دووبارە دەکەمەوە کە لەم کتێبەدا بە چەند دەستەواژەیەکی جیاواز باسم کردووە.

پێویستە ئیماندار سەرقاڵ بێت بە بژیو و مایەی ژیانی و لە خەرجکردن وریا بێت و دەسبڵاوی نەکات، پێشتر بۆ زانایان شتێك لە خانەی دارایی و لوتفێك لە برایان و یارمەتییەك لە ڕەشۆکییانەوە هەبوو، هەموویان بڕان و کەسی سەرقاڵ بە زانست یان خواپەرستی، بە هەژار و داماوی مایەوە بەتایبەتی کەسی خاوەن خاووخێزان.

وێنەی ئەم زەمان و سەردەمە ناشیرینەمان نەدیوە، کەسێك نەماوە بۆ هاوکاری یان قەرزکردن ئاماژەی بۆ بکرێ، بۆیە مرۆڤی ئیماندار ئاتاجی هەندێ دەرگا دەبێت کە بۆ ئەو ناشێ و گرفتاری شتی نەشیاو دەبێ.

بۆیە پێویستە خێزان کەم بکرێتەوە و دەسبڵاوی نەکرێ و جلوبەرگی کۆن پینە بکرێت.

ئەگەر بژیو هەبوو ئەوا باشترە لە مژوولبوون بە خواپەرستی و فێربوونی زێدە زانست، وەگەرنا دین لە دەرگاگەلێکی نەشیاو ون و بەفیڕۆ دەچێ یان تووشی خۆ سووککردن بۆ کەسی هیچ و پووچ دەبێ.

## ٢٧٩- خۆپاراستن لە هەموو شتێك پێویستە

پێویستە کەسی ژیر تا ئەوپەڕی توانا خۆی بپارێزێت، ئەگەر لەگەڵ خۆپارێزیش قەدەر هات ئەوا سەرکۆنە ناکرێ.

خۆپاراستن لە هەموو شتێك کە دەکرێ ڕووبدات پێویستە و ئامادەکاری بۆ ئەوە واجیبە، ئەمە لە هەموو حاڵێك دەبێ وابێ، پیاوێك نینۆکی قرتاند و زیادی بڕی، برینی دەستی پیس بوو و مرد.

(ئەحمەد ئەلحەربی)ی شێخمان بە سواری بە شوێنێکی تەنگدا ڕۆیشت، سەری نزم کردەوە بۆ سەر زینەکە، دڵی گوشرا و نەخۆش کەوت و مرد.

(یەحیای کوڕی نزار) پیرێك بوو دەهاتە کۆڕی من، تووشی گوێگرانی بوو، بانگی خۆبەپزیشکزانێکی کرد، گوێی مژی، شتێك لە مێشکی جووڵا و مرد!

سەیری خۆپارێزیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکە کاتێ بە لای دیوارێکی لاردا تێپەڕی خێرا ڕۆیی.

پێویستە لە سەردەمی لاویدا بە کارکردن خۆی بپارێزێ و بۆ کاتی پیری هەڵیگرێ، نابێ متمانە بە مامەڵەکار بکات ئیللا بە بەڵگەنامە نەبێ و وەسییەتەکەی ئامادە

بكات له ترسی ئەوەی نەوەك لەپڕ مردن له دەرگای بدات، وێڕای دوژمن خۆی له هاوڕێكەشی بپارێزێ و متمانه به دۆستایەتیی ئەو كەسە نەكات كە ئازاری داوە، چونكه ڕق و كینه زۆر به كەمی له دڵەكان دەڕوات، با خۆی له ژنەكەی بپارێزێ، ڕەنگه نهێنییەكی پێ بڵێت و پاشان تەڵاقی بدات، ئیتر بەو كارانەی پێی دەكات ئازار بچێژێ.

(ئیبن ئەفلەح)ی شاعیر له سەردەمی (ئەلموستەرشید)نامەی بۆ سەرۆكێك دەنووسی، دەرگەوانەكەی بەوەی زانی، وا ڕێك كەوت دەرگەوانەكەی دەركرد، ئەویش زمانی لێدا، ماڵی سەرۆك ڕووخێنرا.

ئەمانەی باس كران نموونەگەلێكن بۆ ئەوانەی باس نەكران.

له هەموو ئەوانه گرینگتر ئەوەیه به خۆئامادەكردن و تەوبەكردن خۆی بپارێزێت بەر لەوەی مردن یەخەی بگرێت، با له دزی تەنبەڵی وریا بێت چونكه ئەو بۆ دزینی كات و زەمان زۆر فێڵبازە.

## ٢٨٠- ژیانی خۆش لە قەناعەتدایە

سەرنجم دایە ململانێی پاشـایان و چڵێسـی و چاوچـنۆکیی بازرگانـان و دوورپوویـی خۆبەزاهیدزانان، دیتم زۆرینەی ئەوانە لەسەر چێژەکانی هەستە.

ئەگەر کەسی ژیر بیری لەوە کردەوە و زانی کە بابەتی بەرهەستەکان نزیکە ئەوا بـە کـەمترین شـت هەڵدەچـێ و ملـدەنێ و ئامـانج لێیشـی نایەتـەدی و ئەگـەریش زیادەڕەوی بکات ئەوا چەند قات زیاتر لەو چێژەی دەستی کەوتووە ئازار بـە خـۆی دەگەیەنێ، وەکوو کەسێك زۆر دەخوات یان زۆر دەپەڕێ.

بەختەوەر ئەو کەسەیە بایەخ بە پاراستنی دینەکەی بـدات و بـەپێی پێویسـت لـەوە وەربگرێت.

سەیرە ! ئەم جلکە لەبەرکراوە: ئەگەر مامناوەنـد بێـت خزمـەت دەکـات، ئەگـەریش بەرز بێت ئـەوا خزمـەت دەکـرێ، ئەگـەر پۆشـەر بـە سەرسـامییەوە سـەیری کـرد و کەیفی پێ هات ئەوا ئـەو کـات خـودا تەماشـای ناکـات، لـە فـەرموودەی صـەحیحدا هاتووە: ((پیاوێك کە بە جلوبەرگەکانییەوە دەنازی و بەخۆبەزلزانییـەوە دەڕۆیشـت بە زەویدا برایە خوارەوە.))

هەروەها خواردنەوە: ئەگەر حەرام بوو سزاکەی چەندان هێندەی چێژەکەیەتی و ئابڕووچوونی لەنێو خەڵکدا سزایەکی ترە. ئەگەریش ڕێپێدراو بێت ئەوا زۆر خواردنەوەی جەستە ئازار دەدات.

سەبارەت بە ژن، مودارات و باوەگۆدانەوەی هی جوان ئازاری لە سەرووی هەموو ئازارێکەوەیە، وە بەرگەگرتنی ژنی ناشیرین ئازاری زیاتر و توندترە، بۆیە مامناوەند هەڵبژێرە.

بیر لە حاڵوباری دەسەڵاتداران بکەوە، چەندان کەسیان بە ستەم کوشتووە؟ چەندان حەرامیان ئەنجام داوە؟ جگە لە کەمێك چێژی هەست چیتریان دەست نەکەوتووە، ئیتر مردن یەخەی گرتن و هەموو شت کۆتایی هات.

لە دونیادا هیچ کەس ژیانی لەو کەسە خۆشتر نییە کە بە زانست مەشغوولە و لە جیهان دابڕاوە، زانست هاودەم و هاونشینیەتی، بەو شتە ڕێپێدراوانە قایلە کە وەدەستی هێناوە و دینەکەشی سەلامەتە، نەك بە ڕوولێنان و دین فەوتان، بەرگی شکۆمەندی پۆشیوە و خۆی لە زەلیلی بۆ دونیا و ئەهلەکەی پاراستووە، ئەگەر توانای دەسکەوتنی زۆری نەبێ بە کەم قایل و ڕازییە، ئیتر دین و دونیای سەلامەتە و سەرقاڵبوونی بە زانستەوە چاکەکانی پێ نیشان دەدات و لە باخ و بێستانەکان دڵخۆشی دەکات، بە گۆشەگیری، لە شەیتان و دەسەڵات و ڕەشۆکییان سەلامەتە.

بەڵام ئەمە تەنها بۆ زانا شیاو و گونجاوە، چونکە ئەگەر نەزان دابڕا ئەوا زانستی لە دەست دەچێ و سەرچیغ دەڕوات و ساتمە دەکات.

## ٢٨١- زانستی گرینگ

سەرنجی حاڵەتێکم دا کە تووشی زانستخوازان دەبێ کە دەبێتە هۆی بێئاگابوون لە مەبەست و ئامانج، ئەویش سووربوونیانە لەسەر نووسین بەتایبەتی فەرموودەزانەکان، ئەوە هەموو کات و ساتیان دەبات بێ ئەوەی بتوانن لەبەر بکەن و تێ بگەن، تەمەن دەڕوات و تەنها کەمێك لە زانستیان دەست کەوتووە.

هەر کەسێك سەرکەوتوو بێت زۆربەی کاتی بۆ دووبارەکردنەوە و لەبەرکردن تەرخان دەکات، کاتی ماندوێتیش بۆ دووبارە نووسینەوە تەرخان دەکات، ئیتر ئامانج و مەبەستەکەی دێتەدی.

سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە بەدوای شتە گرینگەکان دەگەڕێ، چونکە تەمەن ناتوانێ هەموو شتێك بەدەست بێنێ و زۆربەی زانستەکانیش فیقهن.

خەڵك هەیە زانستی دەست کەوتووە بەڵام لە کارپێکردنی بێئاگا بووە وەکوو ئەوەیە هیچی بەدەست نەهێنا بێت!

## ٢٨٢- وردبوونەوە و لێكۆڵینەوە لە كارەكان

بۆ ئەنجامدانی هەر كارێك هیچ شتێك هێندەی وردبوونەوە و لێكۆڵینەوە و چوونە بنج و بناوانی شتەكان باش و گرینگ نییە، هەر كات كەسێ بێ سەرنجدانی سەرەنجامەكان كارێكی كرد ئەوا بەزۆری پەشیمان دەبێتەوە، بۆیە مرۆڤ فەرمانی ڕاوێژكردنی پێ كراوە، چونكە مرۆڤ بە وردبوونەوە بیر دەكاتەوە، حاڵوبارەكان پیشانی خۆی دەدات وەكوو ئەوە وایە ڕاوێژی كردبێت، وتراوە: ڕاوبۆچوونێكی قاڵ و پێگەیشتوو باشترە لە یەكێكی كاڵ و پێ نەگەیشتوو.

لە هەموو خەڵك كەمتەرخەمتر ئەو كەسەیە كە بێ وردبوونەوە و ڕاوێژكردن كارێك دەكات بەتایبەتی ئەوەی بەتووڕەیی دەكرێ كە دەبێتە هۆی خۆلەناوبردن یان پەشیمانییەكی گەورە.

چەندان كەس تووڕە بوو، كوشتی و دەستی وەشاند، پاشان كە تووڕەییەكەی دامركایەوە هەموو تەمەن و ژیانی لە خەم و گریان و پەشیمانیدا بردەسەر! بەزۆریش ئەوەی بكوژە دەكوژرێتەوە، ئیتر دونیا و ئاخیرەتی لەدەست دەچێ.

هەروەها ئەو كەسەی شەهوەتێكی دێتە پێش و پەلە لە وەدەسهێنانی چێژەكەی دەكات و سەرەنجامەكەی بیردەچێتەوە، لە هەموو تەمەنیدا پەشیمانی دەچێژێت و

دوای مردنیش تووشی گلەیی و گازندە و سزا دەبێت، هەموو ئەوە بۆ چێژی ساتێك کە وەکوو هەورەبروسکە وایە.

بۆ خاتری خودا! لە هەموو شتێك وردبنەوە و لێکۆڵینەوە بکەن و سەیری سەرەنجامەکانی بکەن بەتایبەتی ئەو توورەییەی دەبێتە هۆی ورووژاندنی دوژمنایەتی و پەلەکردن لە تەلاق.

## ٢٨٣- عەقڵ پارێزەر و لەناوبەرە

یەکێك لێی پرسیم: دانایەك وتوویەتی: هەر کەسێك خۆی بە عەقڵی نەپارێزێ، بە عەقڵی لەناودەچێت، ئەمە واتای چییە؟

ماوەیەك مامەوە واتاکەم بۆ دەرنەدەکەوت، پاشان ڕوون بوویەوە.

ئەگەر داوای ناسینی زاتی خودا لە عەقڵ کرا ئەوا پەنا دەباتە بەر هەست، ئیتر پێکچواندن ڕوودەدات، خۆپاراستن لە عەقڵ بە عەقڵ بریتییە لەوەی سەیر بکات و بزانێ کە نابێ ئەو تەن (جەستە) و لێکچووی شتێك بێت.

ئەگەر کەسی عاقڵ سەیری کردەوەکانی خودای کرد شتگەلێکی بینی کە عەقڵ بە پێویستی نابینێ وەکوو ئێش و ئازارەکان و سەربڕینی ئاژەڵ و زاڵکردنی دوژمنان بەسەر دۆستان لەگەڵ توانای ڕێگرتن و تاقیکردنەوەی پیاوچاکان بە برسێتی و سزادان لەسەر گوناه دوای ماوەیەك بە خلیسکانێك و شتگەلێکی زۆری تری لەم جۆرە کە عەقڵ لە ڕێکخستنیدا نمایشی سەر خوو و نەریتەکانی دەکات و دەبینێ هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە، خۆپاراستن بە عەقڵ لێی ئەوەیە پێی بگوترێ: ئایا ئەدی بۆم نەسەلماوە کە خودا خاوەندار و حەکیمە و هیچ شتێکی لەخۆڕا و هەوەنتە ناکات؟! دەڵێ: با..دەوترێ: ئێمە لە ڕێکخستنی دووەمت خۆ دەپارێزین

بەوەی لە یەکەم لە لات سەلماوە و چەسپاوە، هیچ شتێك نەماوەتەوە تەنها ئەوە نەبێ ڕووی حیکمەت لە کرداری خودا لێت ون بووە، پێویستە بۆی تەسلیم بیت چونکە دەزانین ئەو دانا و حەکیمە. ئەو کات ملکەچ دەبێ و دەڵێ: تەسلیم بووم.

زۆرێك لە خەڵك سەیری پێویستیی واقیعی عەقڵی یەکەمیان کرد بۆیە ڕەخنەیان گرت!

تەنانەت ڕەشۆکی دەڵێ: چۆن خودا سەرەنجامی خراپی بەسەردا سەپاندووم؟! چ حیکمەتێك هەیە لە تاقیکردنەوە و گرفتارکردنم بە جۆرەها بەڵا و ناخۆشی؟! ئەگەر ئەو بیبینیایە کە خودا خاوەنداری دانایە ئەوا جگە لە تەسلیمبوون بەوەی ون و نادیارە چیتر نەدەمایەوە.

خەڵکێکی زۆر لە گەورە تاوانباران دەقیان گرتووە بە بەدیهەی عەقڵ، یەکەمیان ئیبلیسە کە پێی وابوو ئاگر لە قوڕ باشترە بۆیە ڕەخنەی گرت.

هەروەها خەڵکێکمان بینی کە بە حیساب خاوەن زانست بوون لەمەدا خلیسکان و سەرچیغ چوون و ڕەخنەیان گرت و پێیان وابوو زۆرێك لە کردارەکان حیکمەتی لە دواوە نییە.

هۆکارەکەش ئەوەیە کە باسمان کرد: دەقپێوەگرتن و ڕاهاتن بە تێڕوانینی عەقڵ بۆ بەدیهە و نەریتەکان و قیاسکردن لەسەر کردەوەی مەخلووق.

ئەگەر زانستی عەقڵی ناوەوەیان دەرهێنابایە کە بریتییە لەوەی کەماڵ بۆ خودا چەسپاوە و کەموکورتی لێ دوورە، وە زانرا کە ئەو دانایە و گەمە و گاڵتە ناکات ئەوا ئەوەی دەمایەوە هەر تەسلیمبوون بوو بەوەی عەقڵ تێی ناگات و نافامرێت.

بۆ ئەمە سوود لە حاڵی خدر و مووسا سەلامی خوای لێ بێت وەربگرە: کاتێ خدر هەندێ شتی لە عادەت بەدەری کرد مووسا گلەیی لێ کرد و لەبیری چوو کە پێی ڕاگەیاندبوو: من سەیری ئەو سەرەنجامانە دەکەم کە تۆ نایانزانیت، جا ئەگەر بەرژەوەندی سەرەنجامەکان لەگەڵ مەخلووقێك لە مووسا ون و نادیار بێت ئەوا ئێمە شیاوترین بەوەی زۆرێك لە حیکمەتی خودای حەکیممان لێ ون بێت.

ئەم بنچینەیە ئەگەر لە کن مرۆڤ نەچەسپێت ئەوا بەرەو ڕەخنەگرتن و بێباوەڕی دەبات، ئەگەریش چەسپا ئەوا لە کاتی هاتنی هەر ئافەت و بەڵایەك دامەزراو دەبێ.

## ٢٨٤- پاڕانەوە لە خودا

بیســتوومە کــە پیاوێــك لــە کەســێکی بەخشــندەی داوا کــرد و وتــی: مــن ئــەو کەســەم کــە ڕۆژی فــلان و فــلان چــاکەت لەگــەڵ کــردم. بەخشــندەکە وتــی: بــەخێربێت ئــەو کەســەی کــە هــەر بــە خۆمــان واســیتە دەکــات. پاشــان پێداویستییەکەی بۆ جێبەجێ کرد.

لــەوە ئاماژەیــەکم وەرگــرت و پێــی لــە خــودا پاڕامــەوە و گــوتم: ئــەوە تۆیــت لــە ســەردەمی منداڵییــەوە ڕێنوێنیــت کــردووە و لــە گــومڕایی و لــە گونــاهێکی زۆر پاراســتووتە و زانســتخوازیت خســتۆتە دڵــەوە — نــەك بــە تێگەیشــتن لــە گــەورەیی زانســت لەبــەر گچــکەیی و نــە بــە حــەزی بــاوك — وە تێگەیشــتنێکت پــێ داوە بــۆ تێگەیشــتن و دانــانی کتێــب و هۆکارەکــانی کۆکردنــەوەیت بــۆ ئامــادە کــردووە و بــێ مانــدووبوون و زەلیلــی ســواڵی خــەڵك ڕۆزیــت داوە و لــە دوژمنانــت پاراســتووە و هــیچ ســتەمکارێك ڕووی تــێ نــەکردووە و جۆرەهــا زانستت بۆ کۆکردۆتــەوە کــە بۆ هــیچ کەسێك کۆنەکراوەتــەوە و نزیکــە لــە تاکــە کەســێك کۆنەبێتــەوە، وە دڵبەســتەییت بــە ناســین و خۆشەویســتیت بــۆ زیــاد کــردووە و هــەروەها دەســتەواژەی جــوان و نــەرم بــۆ دۆزینــەوەت، وە لــە دڵەکانــدا قــەبووڵت بــۆ دانــاوە تــا ئــەوەی خــەڵك ڕووی تــێ دەکــەن و لێــی بێــزار نــابن و بــە دابــڕان و گۆشــەگیری لــە تێکــەڵبوونی کەســی نەشــیاو پاراســتووتە، لــە تەنیاییــدا جارێــك بــە زانســت دڵنــەواییت کــردووە و جــارێکیش بــە لاڵانــەوە

لێت، ئەگەر بەردەوام بم لە ژماردنی نیعمەتەکانی خودا ناتوانم دەیەکی دەیەکی بژمێرم: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ﴾ (إبراهيم: ٣٤) واتە: ئەگەر نیعمەتەکانی خودا بژمێرن ناتوانن بیانژمێرن.

ئەی چاکەکار بۆم، بەر لەوەی داوا بکەم، لە خۆت بێهیوام مەکە وا داوات لێ دەکەم، بەو نیعمەتانەی پێشوو لێت دەپاڕێمەوە.

## ٢٨٥- هەندێ چیرۆکی ڕەزیلان

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی خەڵکی لە دوو لای دژ بە یەك و پێچەوانە داناوە و مامناوەندیش دەگمەنە!

هەیانە توورە دەبێ، دەکوژێ و دەست دەوەشێنێ، هەشیانە بە هێزی لەسەرخۆیی گەمژەیە و جوێنیش کاری تێ ناکات!

هەیانە زۆرخۆر و چڵێسە هەر شتێك حەزی پێ بکات دەیخوات. هەیانە تەرکەدونیایە مافی نەفسی نادات!

هەروەها هەموو شتەکان ئەوهان، ئەوەی مامناوەندە شیاوی پەسن و دەسخۆشییە:

ئەوەی هەرچی هەیەتی خەرجی دەکات دەسبڵاوە، چروکیش پارەوپوول دەشارێتەوە و بەشی نەفسی خۆی لێ نادات.

دیاریشە کە ماڵ و پارە بۆ خودی خۆی مەبەست و ئامانج نییە بەڵکوو بۆ سوود و بەرژەوەندە، ئەگەر مرۆڤ دەسبڵاوی لێ کرد ئەوا ئاتاجی ڕووتکان و دین لەدەستدان و منەتی خەڵکی چروك دەبێ، ئەمەش شیاو نییە، مرۆڤ میرات بۆ دوژمنەکەی بەجێ بێڵێت باشترە لەوەی ئاتاجی هاوڕێکەی بێت.

خەڵك هەیە چروك و ڕژدی دەكات، پاشان لە ڕەزیلیدا جیاوازن تا وایان لێ دێت ئاشقی خودی ماڵ و پارە دەبن، ڕەنگە یەكێكیان بە كز و لاوازی بمرێ و پارەكەی خەرج نەكات، غەیر پارەكەی دەبات (ماڵی خۆنەخۆر بۆ چەكمەبۆر).

شتێكی زۆرم لەم بارەیەوە بیستووە تەنها بۆ پەند وەرگرتن باسی هەندێكیان دەكەم:

لە شاری (صور) بازرگانێك هەبوو لە ژوورێك دەژیا، هەموو شەوێك دوو كولێرە و گوێزێكی دەبرد، كاتی خۆرئاوابوون دەچووە ژوورەكەیەوە، ئاگری لە گوێزەكە بەردەدا، بە ئەندازەی ئەوەی شمەكەكانی داكەنێت ڕووناك دەبوویەوە، لە كاتی سووتانی توێكڵی گوێزەكە لە داكەندنی شمەكەكانی دەبوویەوە، دوو كولێرەكەی بە گوێزەكەدا دەهێنا و دەیخواردن..ماوەیەك لەسەر ئەمە بەردەوام بوو تا مرد، پاشای صور سی هەزار دینار لێ برد!!

ئەمن پیاوێكم لە گەورەزانایان دیت نەخۆش كەوت، لە لای هاوڕێیەكی ڕاكشا، كەسی نەبوو خزمەتی و هاوەڵێتی بكات و حاڵیشی خراپ بوو، كاتێ مرد لەنێو كتێبەكانیدا پێنج سەت دیناریان دۆزییەوە!!

(ئەبولحەسەنی ئەلڕاندسی) بۆ باس كردم و گوتی: پیاوێك لە لامان نەخۆش كەوت، لەدوای ناردم و منیش چووم، وتی: دادوەر دەستی بەسەر ماڵەكەمدا گرتووە و خەتمی لێ داوە. وتم: ئەگەر بتەوێت دەچم خەتمەكە هەڵدەگرم و سێیەكی ماڵەكەت دەدەمێ بیبەخشەوە و چیت دەوێت پێی بكە. گوتی: نا بەخوا، نامەوێ

بیبەخشمەوە، دەمەویٚ ماڵەکەم لە کن خـۆم بێـت. وتم: ناتـدەنیٚ، بـەڵیٚ مـن تـەنها دەتوانم سێیەکت بۆ وەرگرمەوە تا ئازاد بیت لە خـەرجکردنی. وتـی: نامـەویٚ. ئـیتر مرد و ماڵەکەی بردرا!!

هەر ئەم پیاوە گوتی: پیاوێك شتێکی سەیری بۆ گێڕامەوە، وتی: خەسووم نـەخۆش کەوت و گوتی: دەمەویٚ خورما و ڕۆنێك (خبیصە)م بۆ بکڕی، منیش بۆم کڕی، ئـەو لە کەپرێك و ئێمەش لە کەپرێکی تر بووین، کوڕە گچکەکەم هات و وتـی: باوکـە! وا داپیرە زێڕ قووت دەدات!! منیش هەستام و دیتم وا دینـار دەخاتـە نـاو شـتێك لـە خورما و ڕۆنەکە و قووتی دەدات!! دەستیم گـرت و چـیتر نەمهێشـت ئـەمـە بکـات، وتی: دەترسم ژن بەسەر کچەکەم بێنیت! وتم: وا ناکـەم. وتـی: سـوێندم بـۆ بخـۆ! سـوێندم خـوارد، ئـیتر زێڕەکـانی دیکـەی دامـیٚ، پاشـان مـرد، ناشـتم، دوای چـەند مانگێك منداڵێکمان مرد، بردمە کن وی و پارچە خامێکم برد، بە گۆڕهەڵکـەنم گـوت: ئێسك و پروسکی ئـەو پیرێژنـەم بـۆ بخـەرە نـاو پارچـە خامەکـە، هێنامـەوە مـاڵ و خستمە ناو تەشتێك و ئاوم بەسەردا کرد و تێکمـدا، هەشـتا دینـارم لیٚ دەرهێنـا کـە قووتی دابوو!!

هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە: پیاوێـك مـرد و لـە ماڵـەوە نێـژرا، پاشـان دوای ماوەیـەك گۆڕەکـەی هەڵدرایـەوە و دەرهێنـرا، لـەژێر سـەریدا خشـتێکی بـە قـیڕ داپۆشـراو دۆزرایەوە، لەبارەیەوە لە کەسوکارەکەی پرسیار کرا؟ وتیـان: خـۆی ئـەم خشـتەی قیرپۆش کردووە و وەسییەتی کردووە لە گۆڕەکەیدا بخرێتە ژێر سەریەوە و گـوتی: خشتی ئاسایی زوو تێکدەچێت، ئەمەش لەبەر قیرەکە هیچی لیٚ نایەت. خشتەکەیان

برد و دیتیان قورسه، شکاندیان و لەناویدا نۆ سەت دیناریان دیتەوە، خاوەن میراتەکان لەنێوان خۆیاندا بەشیان کرد! !

هەروەها پیاوێك هەبوو مزگەوتی گسك دەدا و خۆڵەکەی کۆدەکردەوە، پاشان دەیکردە خشت، پێی وترا: ئەمە بۆ چییە؟ وتی: ئەمە خۆڵێکی پاکە و دەمەوێ لەسەر گۆڕەکەمی دانێن. کاتێ مرد، خرایە سەر گۆڕەکەی و هەندێکی لێ مایەوە، لە ماڵەوە فڕێیاندایە لایەك، باران لێیدا و خشتەکان لەبەریەك هەڵوەشانەوە پڕبوون لە دینار! ئیتر چوون خشتەکانیان لەسەر گۆڕەکەی لابرد دیتیان پڕە لە دینار! !

هاوڕێیەکم مرد، دەمزانی ماڵ و پارەیەکی زۆری هەیە، نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا و هیچ شتێکی بە کەسوکاری نەوت، من گومانم هەبوو لەوەی لەبەر ڕەزیلی و سووربوونی لەسەر ژیان و ئومێدی مانەوە پارە شاراوەکەیان پێ ناڵێت لە ترسی ئەوەی ببردرێت و ئەویش چاك ببێتەوە و بژی و ماڵەکەش بردرا بێت، دوای ئەم ڕیسواییەش شتێك نابێ! !

هاوڕێیەکم لەبارەی حاڵەتێکی لەم جۆرە کە دیویەتی بۆی گێڕامەوە و وتی: فلان دوو کوڕ و کچێکی هەبوو، هەزار دیناری شاردراوەشی هەبوو، بەتوندی نەخۆش کەوت، کەسوکارەکەی دەورەیان لێدا، بە یەکێك لە کوڕەکانی گوت: لە کنم مەڕۆ! کاتێ تەنیا مانەوە گوتی: براکەت بە یاریکردن لەگەڵ باڵندان مەشغوولە، خوشکەکەشت مێردێکی تورکی هەیە، هەر کاتێ شتێك لە ماڵەکەم بگاتە دەستیان لە گەمە و یاری خەرجی دەکەن، تۆش لەسەر ئاکار و ڕەوشتی منیت، لە فلان شوێن هەزار دینارم هەیە، ئەگەر مردم تەنها خۆت بیبە.

نەخۆشیی کابرا توند بوو، کوڕەکەش چوو پارەکەی برد، باوکەکە چاك بوویەوە و داوای لە کوڕەکەی کرد پارەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە ئەویش بۆی نەگەڕاندەوە، ئەم جارە کوڕەکە نەخۆش کەوت و گەیشتە لێواری مەرگ، باوکەکە لێی دەپاڕایەوە و دەیگوت: ماڵوێران! تەنها پارەکەم بە تۆدا و ئەوانم بێبەش کرد، تۆش دەمریت و پارەکە دەڕوات! هەر وازی لێ نەهێنا تا شوێنی پارەکەی پێ گوت، پارەکەی بردەوە پاشان کوڕەکە چاکبوویەوە و ماوەیەکی پێچوو باوکەکە نەخۆش کەوت، کوڕەکە چەند هەوڵیدا تا شوێنی پارەکەی پێ بڵێت بەڵام پێی نەوت، ئیتر مرد و پارەکەش چوو!!

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی عەقڵ و تێگەیشتنی بەمانە نەداوە!

﴿إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾﴾ (الفرقان: ٤٤) واتە: ئەوانە هەروەکوو ئاژەڵ وان، بەڵکوو گومڕاتر و خراپتریشن.

## ٢٨٦- زۆریی ناسیاو و دەگمەنیی هاوڕێ

چەند هاوڕێ و برایەکم هەبوون متمانە و شانازیم پێ دەکردن، سەیر و سەمەرەم لە بێوەفایی و شکاندنی مەرجەکانی هاوڕێیەتی و برایەتی لێ دیتن، دەستم کرد بە گلەیی پاشان بە خۆ هاتمەوە و گوتم: گلەیی چ سوودێکی هەیە، ئەگەر باش بوون ئەوا بۆ گلەییە نەك بۆ سەفا و وەفا، ئیتر بڕیارمدا لێیان دابڕێم و دوورکەومەوە !

پاشان بیرم کردەوە، دیتم خەڵك لەنێوان ناسیاو و هاوڕێی ڕواڵەت و برای ناوەکی دابەش بوون، گوتم: دابڕان و دوورکەوتنەوە لێیان باش نییە، بەڵکوو پێویستە لە دیوانی برایەتی بیانگوازیتەوە بۆ دیوانی هاوڕێیەتیی ڕواڵەت، ئەگەر شیاوی ئەوێش نەبوون ئەوا دەیانگوازمەوە بۆ ناو ناسیاوان و چەشنی ناسیاوان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم، هەڵەیە سەرزەنشت و گلەییان لێ بکەیت.

یەحیای کوڕی مەعاز گوتوویەتی: خراپترین برا ئەو برایەیە کە پێویست بکات پێی بڵێیت: لە دوعاکانت باسم بکە و ناوم بێنە.

ئەمڕۆ زۆربەی خەڵك ناسیاون و هاوڕێیەکی ڕواڵەتی لەناویاندا دەگمەنە، بەڵام برایەتی و هاوڕێیەتیی ڕاستەقینە ئەوە شتێکە هەڵوەشاوەتەوە و نەماوە، بە تەمای مەبە، هیچ مرۆڤێك نابینم برایەتی ڕاستەقینە و خاوێنی نە لە نەسەب دەست کەوێت

نه له منداڵ و ژن، واز له تەمابوون له دڵسۆزی و خاوێنی بێنـه، لایـەك لـه هـەمووان بگره و وەكـوو نـامۆ و بێگانـه مامەڵـەیان لەگـەڵ بكـه! نەكـەیت فریـو بخۆیـت بـەو كەسەی خۆشەویسـتیت بـۆ دەردەخـات، لەگـەڵ كـات و زەمـان بـۆت دەردەكـەوێت حاڵەكه چی لێ دێت، ڕەنگه بۆ دەسكەوتنی شتێك لێت ئەوەت بۆ دەربخات!

فوزەیلی كوڕی عیاز وتوویه: ئەگەر ویستت بەڕاستی هاوڕێیـەتیی هاوڕێیـەك بكـەیت ئەوا تووڕەی بكه، ئەگەر بەو شێوەیەت دیت كـه پێویسـته وابێـت ئـەوا هاوڕێیـەتی بكه.

ئەمه ئەمڕۆ بۆته مەترسی و سەركێشـی، چـونكه ئەگـەر یـەكێكت تـووڕه كـرد ئـەوا دەمودەست دەبێته دوژمنت.

هۆكاری هەڵوەشانەوه و نەمانی حوكمی دڵسۆزی و هاوڕێیەتیی ڕاسـتەقینه ئەوەیـه كه پێشینان هـەموو هـەوڵ و خـەمێكیان تـەنها ئـاخیرەت بـوو، بۆیـه لـه برایـەتی و تێكەڵاویدا نیازیان خـاوێن بـوو، برایـەتییان بـۆ دیـن بـوو نـەك دونیـا. بـەڵام ئێسـتا خۆشەویسـتیی دونیـا دەسـتی بەسـەر دڵەكانـدا گرتـووه، ئەگـەر لـه بابـەتی دیـن ماستاوچییەكت دیت ئەوا حەقیقەتی تاقی بكەوه ڕقت لێی دەبێتەوه.

## ٢٨٧- ئارەزووەكانى نەفس

دیتم لەشساغ قەدری تەندروستی نازانیٚ تەنها لە کاتی نەخۆشیدا نەبیٚ هەروەکوو سوپاسگوزاریی ئازادی نازانیٚ ئیللا لە بەندی و حەپسدا نەبیٚ.

حاڵەتێکی سەیرم لە بنیادەم سەرنجدا ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر ژنێکی بێخەوشی هەبوو بەڵام دڵی وەها بە خۆشویستنی پەیوەست نابیٚ کە چێژی لیٚ وەربگریٚ، ئەوەش لەبەر دوو هۆ: یەکەم: لەوپەڕی جوانیدا نەبیٚ. دووەم: هەموو شتێك کە هەتە و لەبەردەستتە و خاوەنیت بێزراوە و نەفس داوای شتێك دەکات کە توانای بەسەردا نییە و دەستی ناکەوێت. دەبینی هاوار دەکات و ئیشتیای شتێك دەکات کە پێی خۆشە یان ژنێك ئاشقی دەبێت، نازانیٚ کە ئەو داوای کۆتوبەندێکی قورس دەکات کە ڕێگری لە دڵ دەکات لە کاروباری ئاخیرەت ڕەفتار بکات یان لە هەر زانست یان کردەوەیەك و لە هەڵسوڕاندنی کاروباری دونیاش شڕ و وڕی دەکات، ئەو ئاشقە دەبێتە دیلی مەعشووق، هەموو خەمی لەگەڵ وییە.

سەیرە ئازادێك کۆتوبەند هەڵدەبژێریٚ و ئیسراحەتێك ماندووبوون هەڵدەبژێریٚ!!

ئەگەر ئەو ژنە ئاتاج بە پاراستن بێت واوەیلا بۆی، نە ئۆقرەی هەیە و نە ئارامی. ئەگەر لەو ژنە خۆئارایشتکەرانە بێت کە خراپبوونیان جێی دڵنیایی نییە ئەوا بە

جارێك لەناوچووە، ئەگەر نووست چێژ لە نووستنەکەی وەرناگرێ، ئەگەر لە ماڵ دەرچوو لە هیچ بەڵایەك دڵنیا نییە. ئەگەر ژنەکە خەرجییەکی زۆری بوێت و ئەویش نەیبێت ئەوا لەپێناویدا تووشی چەندان ڕێگای خراپ دەبێ. ئەگەر ژنەکە حەزی لە جووتبوون بێت و ئەویش بەتەمەندا چووبێت ئەوا ئەوە لەناوچوونی هەرە گەورەیە. ئەگەر ژنەکە ڕقی لێ ببێتەوە ئەوا بەتەواوی لەناوچووە و هیچ هۆکارێکی مانەوەی نەماوە، ئیتر ئەمە بە دەستی خۆیەوە خۆی بەرەو لەناوبردن دەبات، هەروەکوو شاعیر وتوویە:

نُحِبُّ القُدودَ و نَهوى الخُدود ونعلمُ أنّا نُحِبُّ المَنونا

قەد و باڵامان خۆش گەرەکە و ئارەزووی کوڵمەکان دەکەین و دەشزانین بەمانە حەز بە مردن دەکەین.

لە ڕاستیدا ئەمە بتپەرستە. کەسێك ژنێکی بێخەوشی هەیە با لە خوا بترسێت و با ڕوو وەرگێڕێ لە چرپە و ئاواتی نەفس، چونکە کۆتایی نییە.. ئەگەر ئەو مەبەست و ئامانجەی دەیەوێت هاتەدی ئەوا بێزاری ڕوودەدات و داوای سێیەم دەکات، پاشان وەڕسی ڕوودەدات و داوای چوارەم دەکات...ئیتر ئەمە کۆتایی نایەت، سوودی ئەوە لە دونیا وابەستەبوونی دڵ و مێشکیەتی، وەکوو واقوڕماو و حەپەساوی لێ دێت، هەموو بیری لای وەدەسهێنانی ئەو شتانەیە کە خۆشەویستەکەی دەیەوێت، ئەگەر جیابوونەوە یان نەخۆشییەك ڕوویدا ئەوا ئەگەر مایەوە ئەمە دەبێتە خەم و خەفەتی بەردەوام، یان زوو لەناودەچێت.

کوا ئەو کەسەی دینی پارێزراوە و ڕازییە بەوەی خۆشی دەوێت؟! ئەمە لە گۆگردی سوور کەمترە.

با بڕوانێتە وەدەسهێنانی ئەوەی زۆربەی دەبێتە مایەی خاترجەمی و دڵنیایی و ئاوڕ نەداتەوە بۆ تارمایی ئارەزوو و ئەوپەڕی ئاوات ئیتر سەلامەت دەبێ.

## ٢٨٨- زانستی سوودبەخش دەبێتە مایەی ترس و خاکەڕایی

ئەگەر زانستی مرۆڤ تەواو بوو، هیچ کارێك بە هی خۆی نازانێ، بەڵکوو نیعمەتی ئەو زاتە دەبینێ کە یارمەتی و تەوفیقی داوە بۆ ئەو کارە، کە ڕێگری لە کەسی ژێر دەکات کارێك بۆ نەفسی خۆی ببینێ یان پێی سەرسام بێت، ئەوەش بە شتگەلێکە:

وەکوو: خودا بۆ ئەو کارە یارمەتی و تەوفیقی داوە: ﴿حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ﴾ (الحجرات: ٧) واتە: خودا ئیمانی لە کن خۆشەویست کردوون و لە دڵەکانتان جوانی کردووە.

وەکوو: ئەگەر ئەو کارە بە نیعمەتەکان قیاس بکرێ ناکاتە بارتەقای دەیەکی دەیەکی.

وەکوو: ئەگەر تێبینی گەورەیی خزمەتکراو (خودا) بکرێ هەموو کار و خواپەرستییەك کەم و سووك دێتە بەرچاو.

ئەمە ئەگەر لە هەموو خڵتە و بێئاگایەك ساغ و سەلامەت بوو.

بەڵام کە بێئاگاییەکان دەورەیان دابێت پێویستە لە کاردانەوەی خودا وریا بێت و لە کەمتەرخەمیکردن تێیدا بترسێت، نەوەك بێئاگا بێت لە ڕوانینی خودا بۆی.

لەوەدا سەرنجی حاڵوباری ژیر و تێگەیشتووان بدە:

ئەو فریشتانەی شەو و ڕۆژ تەسبیحاتی خودا دەکەن و ناوەستن وتوویانە: ئەی خودایە هێشتا بەتەواوی و بەڕاستی نەمانپەرستوویت.

پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت دەڵێ: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِى﴾ (الشعراء: ٨٢) واتە: ئەو خودایەی تەمام هەیە لێم خۆش بێت.

بە ئارامگرتنی لەسەر ئاگر و تەسلیمبوونی بە سەربڕینی کوڕەکەی سەلماندی کە شیاوی ڕێزگرتنە.

پێغەمبەری خوداش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ((هیچ کەسێك لە ئێوە کار و کردەوەکەی ڕزگاری ناکات)) گوتیان: ئەتووش؟ فەرمووی: منیش، مەگەر خودا بمخاتە بەر ڕەحمەت و سۆز و بەزەییی خۆیەوە.)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە.

ئەبووبەکر خودا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا خۆم و ماڵەکەشم هەر هی تۆ نین؟!

عومەر خودا لێی ڕازی بێت دەڵێ: ئەگەر ئەندازەی هەموو زەویم هەبێ ئەوا لە ترسی ئەوەی لە پێشمە دەیبەخشم بەر لەوەی بزانم هەواڵ چییە.

ئیبن مەسعوود دەڵێ: خۆزگە کە مردم زیندوو نەبمەوە.

عائیشه خودا لێی ڕازی بێت دەڵێ: خۆزگە شتێکی بێنرخ بوومایە کەس باسی نەکردمایە.

ئەمە حاڵی سەرجەم ژیرەکانە، خودا لە هەموویان ڕازی بێت.

لە کۆمەڵێك لە پیاوچاکانی بەنی ئیسرائیل شتگەلێك گێڕدراوەتەوە کە نیشانەی کەم تێگەیشتنیانە لەوەی ڕوونم کردەوە چونکە ئەوان سەیری کارەکانیان کردووە و شانازی و متمانەیان پێ کردووە:

وەکوو باسی ئەو خواپەرستەی لە دورگەیەك پێنج سەت ساڵ خواپەرستی کرد و خودا هەموو شەوێك هەنارێکی بۆ دەنارد و ئەویش داوای لە خودا کرد لە کڕنووشدا بیمرێنێ، کاتێ حەشر کرا پێی وترا: بە ڕەحمەتی من بڕۆ بەهەشتەوە! گوتی: بەڵکوو بە کردەوەی خۆم. هەموو کردەوەکانی کێشرا بارتەقای یەك نیعمەت نەبوو، گوتی: ئەی پەروەرێن! بە ڕەحمەتی خۆت.

هەروەها ئەهلی ئەو ئەشکەوتەی تاوێرەکە دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ گرتن: یەکێکیان بە کردەوەیەك کە دەبوو شەرم بکات لە باسکردنی لە خودا پاڕایەوە ئەویش ئەوە بوو بڕیاری زینای دابوو پاشان لە سزاکەی ترسا و وازی لێ هێنا، خۆزگە دەمزانی ئەو کەسەی لە ترسی ئەوەی نەوەك سزا بدرێ وازی لە شتێك هێناوە شانازی بە چییەوە دەکات؟! بەڵکوو ئەگەر شتێکی ڕێپێدراو بووبایە و ئەو وازی لێ هێنابایە ئەوا مافی ئەوەی هەبوو شانازی پێوە بکات. ئەگەر تێگەیشتبا شەرمەزاری هەوڵدان بێئاگای دەکرد لە بەخۆنازین، هەروەکوو یوسف سەلامی

خوای لیٚ بێت وتوویەتی: قَالَ تَعَالَى: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ﴾ (یوسف: ٥٣) واتە: نەفسی خۆم تەبرییە و بێتاوان دەرناکەم.

یەکێکی تر لێگەڕا منداڵەکانی تا بەیانی بگرییێن بۆ ئەوەی شیرەکە بداتە دایك و باوکی. لەم چاکەیەدا ئازاردانی منداڵان هەیە بەڵام تێگەیشتن قورسە. وەك ئەوەی کاتیٚ پێیان وابوو باشیان کردووە زمانی حاڵ وتی: ئەوەی داوایان کردووە بیاندەنیٚ، ئەوان داوای کرێی کارەکانیان دەکەن.

ئەگەر سەختیی تێگەیشتن نەبووایە هیچ خۆبەزلزانێك بەسەر هاوڕەگەزەکەی خۆی بە گەورە نەدەزانی و هەموو کەسێکی کامڵ دەترسا و کردەوەکەی بە کەم و سووك دەزانی و وریا و ترساو دەبوو لە کەمتەرخەمیکردن لە سوپاسکردنی ئەو نیعمەتانەی پێی دراوە.

تێگەیشتنی ئەم ڕوونکراوەیە سەری خۆبەگەورەزانی شۆڕ دەکات و دەبێتە هۆی زەلیلی و سەرکزکردن، ڕابمێنە و وردبەوە، ئەوە بنچینەیەکی گەورەیە.

## ٢٨٩- شەرمکردن لە گوناه

پێویستە کەسی ژیر لە گوناهەکانی بترسێت ئەگەر تەوبەشی لێ کردن و لەسەریان گریا.

من زۆرینەی خەڵکم بینیوە لە قەبووڵبوونی تەوبە دڵنیا بوونەتەوە وەك ئەوەی بڵێیت ئەوەیان یەکلا کردبێتەوە! ئەمە شتێکی نادیارە!! پاشان ئەگەر خوداش لێیان خۆش بووبێت شەرمەزاری لە کردنی گوناهەکە هەر دەمێنێتەوە.

ئەو فەرموودەیەی لە (الصحاح)دا هاتووە پاڵپشتی ترس دوای تەوبە دەکات: خەڵك دێنە لای ئادەم سەلامی خوای لێ بێت و دەڵێن: تکا و شەفاعەتمان بۆ بکە! دەڵێت: گوناهەکەم... دەچنە لای نوح سەلامی خوای لێ بێت، دەڵێت: گوناهەکەم....هەروەها دەچنە لای ئیبراهیم و مووسا و عیسا سەلامی خوایان لێ بێت.. ئەمانە ئەگەر تەماشای گوناهەکانیان بکەیت زۆربەیان گوناهی ڕاستەقینە نەبوون، پاشان ئەگەر گوناهیش بووبن ئەوا تەوبەیان کردووە و پەشیمان بوونەتەوە بەڵام هێشتا لێی دەترسن.

پاشان، شەرمەزاری دوای قەبوولبوونی تەوبە لاناچێت.. ئەم قسەیەی فوزەیلی کوڕی عیاز ڕەحمەتی خوای لێ بێت چەند جوانە کە وتوویە: ئەگەرچی چاوپۆشیت کردووە بەلام هێشتا شەرمەزارین!

سوێند بە خوا ئاخ و ئۆف بۆ کەسێك کە گوناه و چێژی ساتێك هەڵدەبژێرێ کە خەم و خەفەتەکەی هەر لە دڵی ئیماندار دەمێنێتەوە تەنانەت ئەگەر خوداش لێی خۆش بێت.

تکایە زۆر زۆر وریا بن لە هەموو ئەو شتانەی دەبێتە هۆی شەرمەزاری.

ئەمەش شتێکە زۆر بە کەمی تۆبەکار یان زاهید بۆی دەڕوانێت چونکە ئەو پێی وایە لێخۆشبوون بە هۆی تەوبەیەکی ڕاستگۆیانە گوناهەکەی ڕامالیوە! ئەوەی باسمکرد وا پێویست دەکات بەردەوام وریا و شەرمەزار بین.

## ٢٩٠- ترسناكیی خراپ تێگەیشتن

پەنا بە خوا دەگرین لە خراپ تێگەیشتن بەتایبەتی لەوانەی بە زانست ناودارن.

ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەكەی گێڕاوەتەوە كە (ئەبوو عەبدولڕەحمان ئەلسەلمی و حیببان كوڕی عەتییە بووە ململانێیان، ئەبوو عەبدولڕەحمان بە حیببانی گوت: زانیوتە چ شتێك هاوڕێكەتی (واتە عەلی) بوێر كرد. گوتی: ئەو شتە چییە؟ وتی: قسەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كە فەرموویەتی: ((ڕەنگە خودا ئاگاداری ئەهلی بەدر بووە و فەرموویەتی: چی دەتانەوێ بیكەن، من لێتان خۆش بووم)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە.

ئەمە خراپ تێگەیشتنە لە ئەبوو عەبدولڕەحمانەوە كاتێ وا گومانی بردووە كە عەلی پاڵپشت بەوەی كە خودا لێی خۆشبووە شەڕ و كوشتاری كردووە!!

دەبێ بزانرێ كە واتای فەرموودەكە ئەمەیە: كارەكانی پێشووتان هەرچییەك بووبێت من لێتان خۆشبووم. سەبارەت بە لێخۆشبوونی دواتر ئەوا ئەوە ناگرێتەوە.

ئایا ئەگەر لە ئەهلی بەدر – دوور لەوان – شیرك ڕوویدا چونكە پارێزراو نین ئایا خودا سزای نەدەدان؟! هەروەها سەرپێچی و گوناهیش بە هەمان شێوە.

پاشان ئەگەر گوتمان: فەرموودەكە لێخۆشبوونی دواتریش دەگرێتەوە ئەوا واتای ئەوەیە چارەنووستان بەرەو لێخۆشبوونە.

پاشان وازبێنە لە واتای فەرموودەكە، چۆن دروستە موسڵمان گومان لە عەلی میری ئیمانداران – خوا لێی ڕازی بێت – بكات گوایە ئەوا پاڵپشت بەوەی خودا لێی خۆش دەبێت كاری نادروست و ناجایەزی كردووە؟! حاشا و دوور لەمە، بەڵكوو بە بەڵگەیەك كە ناچاری كوشتاری كردووە شەڕی كردووە، بۆیە لەسەر هەق بووە.

زانایان لەوە جیاواز و ناكۆك نین كە عەلی خوا لێی ڕازی بێت شەڕی هیچ كەسێكی نەكردووە ئیللا هەق لەگەڵ عەلی بووە، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((خودایە! هەق چۆن سووڕا ئەوها لەگەڵ وی بیسووڕێنە)) زۆر لاوازە، تیرمیزی گێڕایتیەوە.

ئەبوو عەبدولڕەحمان هەڵەیەكی زۆر ناشیرینی كردووە، هۆكاری ئەوەش ئەوەبوو چونكە ئەو عوسمانی بوو (لایەنگری ئیمامی عوسمان بوو).

## ٢٩١- زوهدی درۆیین

سەرنجی شتگەلێکی زاهیدانی ئەم سەردەمەی خۆمانم دا دیتم نیشانەی دووڕوویی و ڕووپامایین و بانگەشەی دڵسۆزیش دەکەن:

وەکوو: گۆشەیەك دەگرن، نە سەردانی هاوڕێیەك دەکەن و نە نەخۆشێك بەسەردەکەنەوە و بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە دەیانەوێ لە خەڵك دابڕێن و بە خواپەرستی سەرقاڵ بن، بەڵکوو ئەمەیان بۆ ئەوەیە تا ئاماژەیان پێ بکرێ کە دابڕاون چونکە ئەگەر بێنە نێو خەڵکەوە سام و هەیبەتیان دەڕوات!

خەڵك پێشتر وەها نەبوون... پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) نەخۆشی بەسەر دەکردەوە و پێویستییەکانی لە بازاڕ دەکڕی، ئەبووبەکر خوا لێی ڕازی بێت بازرگانیی لە کوتاڵ دەکرد، ئەبوو عوبەیدە کوڕی جەڕاح گۆڕی هەڵدەکەند، هەروەها ئەبوو تەڵحەش، ئیبن سیرین مردووی دەشۆرد..

هاوڕێکانمان لەناو خەڵك بێدەنگی و سەرکزی و خۆمراندن نیشان دەدەن، ئەمەش دووڕووییە، ئیبن سیرین بە ڕۆژ لەناو خەڵك پێدەکەنی و بە شەویش دەگریا.

زاهیدم بینیوە گۆشەی مزگەوت دەگرێ و نوێژان دەکات، خەڵك کۆدەبنەوە و شەو و ڕۆژ لە پشتی نوێژ دەکەن، ئەمە بۆی بڵاو دەبێتەوە و نەفسی بەسەریدا زاڵ دەبێ

و حەز بە ستایش و دەسخۆشی دەکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی نوێژی سوننەتەوە وتوویەتی: ((ئەم نوێژە لە ماڵەوە بکەن)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە.

هاوڕێمان هەیە ڕۆژووی بەردەوام دەردەخات و بە قسەی خەڵك دڵخۆش دەبێ: فلان هەمیشە بەڕۆژووە ! ! ئەم گەمژەیە نازانێ لەپێناو خەڵك ئەوە دەکات، ئەگەر ئەمە نەبووایە بەردەوام بە ڕۆژوو نەدەبوو و خەڵکیش دوو یان سێ ڕۆژ دەیاندیت بەڕۆژووە، ئیتر ئەم ناوەی لێ دەڕۆیشت پاشان دەگەڕایەوە سەر ڕۆژووان، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ئەگەر نەخۆش کەوتبایە خواردنی لەشساغانی لە کن خۆی دادەنا (تا ئەوانەی سەردانی دەکەن وا بزانن ئەو نان دەخوات و بێ ڕۆژووە).

زاهیدم بینیوە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی بۆ خەڵك کردووە و هەردوو سوڕەتی (الفلق) و (الناس)ی بۆ خەڵك خوێندووە ! واتە: قورئانم خەتم کردووە ! ! (مەبەستی ئەوەیە بە خەڵك بڵێ ئەمشەو هەموو قورئانم خوێندووە و ئەمەش دوا سوڕەتە ! !).

ئەم کار و کردەوانە لە دووڕوویی و ڕووپامابیدا ڕوون و ئاشکران.

هەیانە: دەوڵەمەندە و صەدەقات وەردەگرێ و گوێ بەوە نادات لە ستەمکارانی وەرگرتبێت یان لە خێرخوازان، دەچێتە لای بەرپرسان و سواڵیان لێ دەکات و دەشزانێ ئەم پارە و داهاتەیان لەکوێ بەدەست هێناوە.

بۆ خاتری خودا نییەت و نیازتان چاك بکەن چونکە زۆربەی ئەم کارانە ڕەتکراوەن.

مالیکی کوڕی دینار گوتوویەتی: بەوەی ڕاستگۆ نییە بڵێن: با خۆی ماندوو نەکات!

با ڕیاکار بزانێت ئەوەی مەبەستیەتی و نیازی کارەکەی بۆ ئەوە لە دەستی دەچێت کە بریتییە لەوەی دڵەکان ئاوڕی لێ بدەنەوە و ڕووی تێ بکەن، هەر کات ئەو دڵسۆز و نیازی پاك نەبێ لە خۆشەویستیی دڵەکان بێبەش دەبێ و هیچ کەسێك ئاوڕی لێ ناداتەوە، دڵسۆزیش خۆشەویستە.

ئەگەر ڕیاکار زانی ئەو دڵانەی ڕووپامایيان بۆ دەکات بە دەستی ئەو کەسەیە کە ئەو سەرپێچی دەکات ئەوا وای نەدەکرد.

چەندان کەسمان بینی جلوبەرگی خوری لەبەر دەکرد و خواپەرستی دەردەخست کەس ئاوڕی لێ نەدایەوە، یەکێکی تریش شمەکی باشی لەبەر دەکرد و دەخەنیەوە و دڵەکانیش خۆشیاندەوێ.

لە خوا داوای دڵسۆزییەك دەکەین ڕزگارمان بکات و پەنای پێ دەگرین لە ڕووپامایيەك کە کردەوەکانمان پووچەڵ بکاتەوە، ئەو تواناداره.

## ٢٩٢- دونیا خانەی تاقیکردنەوەیە

ونبوونی مەبەستی تەکلیف لە مرۆڤ نەزانییە، ئەو پێچەوانەی مەبەستەکان دانراوە. پێویستە مرۆڤی ژیر لەگەڵ ئاوەژووبوونەوەی مەبەستەکان ڕابێت، ئەگەر دوعا و داوای گەیشتن بە مەبەستێکی کرد، ئەوا بە دوعاکردن خواپەرستی کردووە: ئەگەر مەبەستەکەی پێدرا سوپاس بکات و ئەگەریش مەبەستەکەی نەهاتەدی پێویست ناکات پێداگری لەسەر داواکارییەکە بکات، چونکە دونیا بۆ گەیشتن بە مەبەستەکان نییە، با بە خۆی بڵێ: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ (البقرة: ٢١٦) واتە: ڕەنگە ڕقتان لە شتێك بێت و بۆتانیش باشتر بێت.

لە گەورەترین نەزانیی (مرۆڤ) ئەوەیە لە ناخەوە لەبەر ئاوەژووبوونەوەی مەبەستەکانی تووڕە بێت، ڕەنگە لە ناخەوە پەڵپ بگرێت، یان لەوانەیە بڵێ: هاتنەدی مەبەستەکەم زیانی نییە و دوعاکەم گیرا نەبوو!! هەموو ئەمانە بەڵگەیە لەسەر نەفامی و کەم ئیمانی و کەم تەسلیمبوونی بە حیکمەت.

کێ هەیە مەبەستێکی هاتبێتەدی پاشان تێك نەچووبێت و تووشی گرفت نەبووبێت؟!

ئەمە ئادەم، ژیانی لە بەهەشت خۆش بوو و لێی دەرکرا، نوح داوای کرد کوڕەکەی ڕزگار بکرێ بەڵام مەبەستەکەی پێ نەدرا، ئیبراهیمی خۆشەویست بە ئاگر

تاقیکرایەوە، ئیسحاق بە سەربڕین (ڕاستییەکەی ئیسماعیلە)، یەعقووب بە ونبوونی یوسفی کوڕی، یوسف بە ڕووبەڕوو بوونەوەی هەوا و ئارەزوو، ئەییووب تووشی نەخۆشی بوو، داوود و سولەیمان بە فیتنە تاقیکرانەوە...ئیتر هەموو پەیامبەران بەم شێوەیە.. ئەوەشی پێغەمبەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لە برسێتی و ئازار و ژیانی سەخت تووشی بوو دیار و زانراوە.

دونیا بۆ بەلا و تاقیکردنەوە دانراوە. پێویستە کەسی ژیر نەفسی خۆی لەسەر ئارامگرتن ڕابێنێ و بزانێت ئەو مەبەستانەی بەدەستی هێناوە لوتف و میهرەبانییە، ئەوەشی نەهاتۆتەدی لەسەر بنچینەی سروشت و خوارسکی دونیایە، هەروەك وتراوە:

طُبِعت على كَدَرٍ وأنت تُريدها ... صَفوًا من الاقذاء والاكدارِ

ومُكلِّف الايام ضد طِباعِها ... مُتَطلِّبٌ في الماء جذوة نارِ

دونیا خۆی لەسەر ناخۆشی دروست کراوە و تۆش دەتەوێ پاك و بێگەرد بێت لە ناخۆشی و دڕکودالْ..ئەوەی بیەوێت دونیا پێچەوانەی سروشتی دروستکراوی خۆی بێت ئەوا داوای سکڵی ئاگر لە ئاو دەکات.

ئا لێرەدا هێز و لاوازیی ئیمان دەردەکەوێت. با ئیماندار لە دەرمانەکانی ئەم نەخۆشییە بەکاربێنێ کە تەسلیمبوونە بە خودای خاوەندار و تەحکیمی حیکمەتی و بلێت: بە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) کە گەورەی هەمووانە وتراوە: ﴿لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ﴾ (آل عمران: ١٢٨) واتە: هیچ شتێك بە دەست تۆ نییە.

پاشان بەوە دڵی خۆی بداتەوە کە پێنەدان لەبەر ڕەزیلی نییە بەڵکوو بۆ سوود و بەرژەوەندێکە کە ئەو نایزانێ و بۆ پاداشتدانەوەی ئەو کەسەیە کە ئارامی لە مەبەستەکانی گرتووە و تا خودا بەو کەسانە بزانێ و بیناسێتەوە کە تەسلیم و ڕازی بوون.. وە کاتی بەڵا و تاقیکردنەوە ماوەیەکی کەمە و مەبەستەکان هەڵگیراون و دوای کەمێکی تر پێی دەگات، وەك ئەوەی بڵێیت تاریکاییەکە ڕووناك بووبێتەوە و سپێدەی پاداشت هەڵهاتبێت.

هەر کاتێ (مرۆڤ) ئاستی بەرز بۆوە و تێگەیشت کە ئەوەی ڕوویداوە مەبەستی خودای گەورە بووە، ئیتر ئیمانەکەی وای لێ دەکات کە ئەو شتەی بوێت کە خودا دەیەوێت و بە تەقدیری وی ڕازی بێت، ئەگەر ئەوها نەبێت ئەوا لە واتای ڕاستەقینەی بەندایەتی دەرچووە.

ئەمە بنچینەیەکە پێویستە سەرنج بدرێت و لە هەموو مەبەستێکی ئاوەژوو کاری لەسەر بکرێ.

## ٢٩٣- له دەرگا و دیاریی دەسەڵاتداران دووربن

خەڵكێك لە زانایان و چیرۆكخوێنانم دیت كە دونیایان لێ تەنگ دەبێتەوە، یەكسەر پەنا دەبەنە بەر تێكەڵاوبوونی دەسەڵاتداران تا شتێك لە ماڵ و پارەكەیان دەست بكەوێت و دەشزانن كە دەسەڵاتداران نە دونیا لە ڕێی خۆی بەدەست دێنن و نە لە هەقی خۆشی خەرجی دەكەن.

زۆربەیان: ئەگەر باج و زەوییانەیەك (خراج) ی دەست كەوت كە پێویستە لە سوود و بەرژەوەندەكان خەرج بكرێ كەچی ئەو دەیداتە شاعیرێك! ڕەنگە ئەو سەربازەی لەگەڵیدایە شیاوی ئەوە بێت مانگانەكەی دە دینار بێت دە هەزاری بداتێ! لەوانەیە غەزا بكات و ئەو دەسكەوتەی پێویستە بەسەر سوپا دابەشی بكات بۆ خۆی گلی بداتەوە! ئەمە بێجگە لەو ستەمەی لە مامەڵەكان دەكرێت.

یەكەم شت كە بەسەر ئەم زانایە دێت ئەوەیە سوود لە زانستەكەی وەرناگیرێت. پیاوچاكێك پیاوێكی زانای دیت لە ماڵی یەحیای كوڕی خالیدی بەرمەكی دێتە دەرێ، وتی: پەنا بە خوا لە زانستێكی بێسوود.

ئایا خراپەی نەبینیوە و، نکوولّی لیّ ناکات؟! ئەو خواردنەیان دەخوات کە بە ستەم بەدەست هاتووە، چرای دلّی دەکوژێتەوە و تاریک دەبیّ و لە چێژی مامەلّەی خودا بێبەش دەبیّ، پاشان هیچ کەس بە هۆی وییەوە هیدایەت نادریّ. بەلّکوو لەوانەیە کردنی ئەمە هۆکاریّك بووبیّت بۆ گومراکردنی خەلّك و دوورخستنەوەیان لە شوێنپیّ هەلّگرتنی!

ئەو خۆی و میرەکەی ئازار دەدات چونکە (میرەکە) دەلّیّ: ئەگەر ئەمن لەسەر ڕاستی نەبوومایە (ئەو زانایە) هاوڕێیەتی نەدەکردم و ڕەخنەی لیّ دەگرتم. ئازاری ڕەشۆکییانیش دەدات، جاریّك بەوەی دەبینن ئەوەی میر تێیدایە ڕاستە و جاریّکیش بەوەی چوونە لای و بێدەنگبوون لە ڕەخنە و نکوولّیکردن جایەز و دروستە، یان دونیایان لە کن خۆشەویست دەکات، سوێند بە خوا سوود لە فراوانی و هەراویی دونیایەك نییە کە ڕێی ئاخیرەت تەنگ بکاتەوە.

خەلّکانێك هەبوون لە چەقەی گەرمای ئارەزووەکان ئارامیان گرت لەسەر تینوێتیی دونیا تا ڕۆژی مردن لە شەرابی خۆشنوودی تێراو بوون و یاد و باسیان مایەوە و ئەوە دوای ئەوە دەگێڕدرایەوە و تینوێتیی دلّانی دەشکاند و ژەنگی لادەبرد.

ئەمە ئیمام ئەحمەد، کاتیّ ئاتاج دەبیّ، دەچیّت گولّەگەنمی کەوتووی دوای دروێنە هەلّدەگرێتەوە و مالّی دەسەلّاتدار و سولّتان قەبوولّ ناکات.

ئەمە ئیبراهیمی حەربی پاقلە دەخوات و هەزار دیناری (المعتضد) ڕەت دەکاتەوە.

ئەمە بیشری حافی، برسییە و ناڵەی دێ، پێی دەوترێ: شۆرباوێك لە ئاردت بۆ دروست دەکەین؟ دەڵێ: دەترسم خودا پێم بڵێ: ئەم ئاردەت لەکوێ هێنا؟!

سوێند بە خوا باسوخواسی ئەم خەڵکانە هەر ماوە و ئارامگرتنیش تەنها چەشنی خەوەنووچکەیەکە و چێژی شلڕەوانیش ڕۆیشت و جەستەکان ڕزین و دینیش لاواز بوو.

ئەی ئەو کەسەی یارمەتی و تەوفیق دراویت ئارام بگرە ئارام! ئاوات بەو کەسە مەخوازە کە دونیای بۆ فراوان کراوە، تۆ ئەگەر سەرنجی ئەو هەراوییەتدا دەبینی لە دەرگای دیندا تەنگییەکە! بە تەئویل جڵەو بۆ نەفست شل مەکە، تەمەنت لە دونیا کەم و کورتە!

وسواءٌ إذا انقضى يومُ كِسرى … في سرورٍ ويوم صابرٍ كِسرة

ڕۆژ کە ڕۆیشت، لەگەڵیدا چێژەکانی خۆشبەخت و ئازارەکانی بەدبەخت دەڕوات و حاڵیان وەکیەکی لێ دێت.

هەر کاتێ نەفس لەبەر کەم ئارامییەوە هاتوهاواری لێ هەستا باسوخواسی زاهیدەکانی بۆ بخوێنەوە ئیتر وازدێنێ و شەرم دەکات و دەشکێتەوە ئەگەر هیممەت یان بێداری هەبێ، نموونەی بە شلڕەویی عەلی کوڕی

ئەلمەدینی و قەبوولکردنی ماڵ و پارەی ئیبن ئەبی دوئاد و ئارامگرتنی ئیمامی ئەحمەدی بۆ بێنەوە، چ جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئەم دوو پیاوە و ناوودەنگیان هەیە، بڕوانە لەبارەی هەر یەکێکیانەوە چی دەگێڕدرێتەوە و باسی چی دەکرێ...ئیبن ئەلمەدینی پەشیمان دەبێتەوە ئەگەر ئەحمەد گوتی: دینەکەم سەلامەت بوو.

## ٢٩٤- بارودۆخی خراپی موسڵمانان

لە حاڵوباری خەڵك وردبوومــەوە، دیـتم زۆرینــەیان جڵــەوی بەندایــەتییان لــە ئەسـتۆ داڕنیوە، ئەگەر خواپەرستییان کرد ئەوا وەکوو عادەت و نەریت وایە یان بەو جۆرە دەیکەن کە پێچەوانەی مەبەستەکانیان نەبێت کە دڵان ئازار بدات:

زۆربەی دەسەڵاتدارەکان لە ڕێگای خراپەوە ماڵ و پارە وەدەست دێنن و لە ڕێگـای نەشیاو خەرجی دەکـەن وەکوو ئـەوەی خۆیـان خـاوەنی بـن و مـاڵی خـودا نـەبێ! ئەگەر یەکێکیان بە ناوی خودا غەزای کـرد و مـاڵ و پـارەی دەسـت کـەوت ئـەوا بـۆ خۆی گلی دەداتەوە و بە ئارەزووی خۆی چۆن حەز بکات دەیداتە هاوڕێکانی! !

زانایانیش لەبەر زۆر هەژاری و زۆر چڵێسییان هاوساز و هاوئاوازی میرەکـان دەبـن و دەچنە سەر ڕێچکەی ئەوان!

بازرگانــەکانیش لەســەر گرێبەســتە خراپــەکانیانن! ڕەشــۆکییانیش لــە گونــاه و سەرپێچی و پشتگوێخستنی لایەنی شەریعەتن، ئەگەر هەندێ مەبەستیان لەدەست بچــێت ڕەنگــە بڵــێن: نامانــەوێ نوێــژ بکــەین! خــودا ڕەحمــەتیان بەســەردا نەبارێنێ...زەکات نادەن و وازیان هێناوە لە فەرمانکردن بە چاکە.

خەڵك هەیە دواكەوتنی سزا دەسخەرۆی دەكات و هەیانە دڵنیایە لە لێخۆشبوون و زۆربەشیان ئیمانیان شلۆق و لەرزۆكە، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە بە موسڵمانی بمانمرێنێت.

## ٢٩٥- پەیداکردنی بژێوی ماڵومنداڵ

لە شتە سەیرەکان ئەوەیە دینی خاوەن ماڵومنداڵ سەلامەت بێت ئەگەر بێکار و دەستەنگ بوو، وێنەی وی وەکوو وێنەی ئەو ئاوەیە کە ئەگەر بەردەمی گیرا ئەوا لە ناوەوە کار دەکات تا کەلێنێك بکاتەوە، خاوەن ماڵومنداڵیش ئەوهایە، ئەگەر تووشی تەنگدەستی بوو ئەوا بەردەوام هەوڵ دەدات ڕێگایەك بدۆزێتەوە، ئەگەر نەیتوانی حەڵاڵ بەدەست بێنێ ئەوا لە وەدەسهێنانی گومانلێکراو و شوبوهاتەکان شلڕەوی دەکات، ئەگەر دینی کز بوو ئەوا دەست بۆ حەرام درێژ دەکات.

ئیماندار ئەگەر زانی لە نان پەیداکردن لاوازە ئەوا هەوڵ دەدات خۆی لە پەڕین بپارێزێ و ئەگەریش منداڵ هاتە دونیاوە ئەوا خەرجی کەم دەکاتەوە و بە کەم قەناعەت دەکات.

بەڵام ئەوەی هیچ کار و کاسبییەکی نەبێت وەکوو زانایان و زاهیدان ئەوا سەلامەتییان دوور و دەگمەنە، چونکە داهاتی سوڵتان و خاترگرتنی ڕەشۆکییانیان لێ براوە، ئەگەر ماڵومنداڵیان زۆر بوو ئەوا دوور نییە ئەوەی تووشی نەفامەکان بووە یەخەی ئەوانیش بگرێت.

هەر یەکێك لەوان توانای هەیە بە نووسینەوە و شتی تر نان پەیدا بکات با هەوڵی بۆ بدات لەگەڵ کەمکردنەوەی خەرجی و قەناعەتکردن بە کەم، چونکە هەر یەکێکیان ئەمڕۆ شلڕەوی بکات حەرام دەخوات، چونکە لە ستەمکاران وەردەگرێت بەتایبەتی بە بیانووی هەوڵدان بۆ نان پەیداکردن و زوهدەوە.

هەر یەکێکیشیان ماڵ و پارەی هەبوو با هەوڵی گەشەپێدان و پاراستنی بدات، کەس نەماوە باودان (إیثار)ی هەبێ یان قەرز بدات، هەموو خەڵك وایان لێ هاتووە دەڵێی ماڵ و پارە دەپەرستن، هەر کەسێ ماڵ و پارەی خۆی پاراست ئەوا دینەکەی پاراستووە.

گوێ بە قسەی ئەو نەزانانە نادرێت کە فەرمان بە دەرکردنی ماڵ و پارە دەکەن، ئێستا ئەمە کاتی نییە.

بزانە، ئەگەر خاترجەم و دڵنیا نەبیت نە زانست بە دەست دێت و نە کار و کردەوە، نە مەشغوولبوون بە بیرکردنەوە لە گەورەیی خودا.

پێشینان بە شتگەلێك خاترجەم دەبوون، زۆربەیان هەموو ساڵێك لە خانەی دارایی (بیت المال) پشکێکیان هەبوو، دەگەیشتە دەستیان و لێیان زیاد دەبوو... هەیانبوو ماڵ و پارەی هەبوو بازرگانی پێوە دەکرد، وەکوو سەعیدی کوڕی موسەییب و سوفیانی کوڕی موبارەك، خاترجەم و دڵنیا بوون.

سوفیان لەبارەی ماڵەکەیەوە وتوویە: ئەگەر تۆ نەبووایەی دەیانکردمە دەستەسڕ!

كالآيەكى ئيبن موبارەك ون بوو، گريا و گوتى: ئەو ڕاگرى دينەكەمە !

كومەڵێك هەبوون بە بەخششى ئەو برايانەى منەت ناكـەن ڕازى و خۆشـنوود بـوون: ئيبن موبارەك پارەى بۆ فوزەيل و غەيرى ويش دەنارد.

(لەيسى كوڕى سەعد) سۆراغى پياوە گەورەكانى دەكـرد، هـەزار دينـارى بـۆ ماليـك نارد، بۆ (ئيبن لەهيعە) هەزار دينار و، هەزار دينار و كەنيزەكێكى سێ سەت دينارى دايە مەنصووڕ كوڕى عەممار.

دونيا هەر لەسەر ئەمە بوو تا نەريتەكە بەرەو پووكانەوە و نـەمان چـوو، بەخششـى دەسەڵاتداران كەم بوويـەوە و ئـەو برايانـەش كـەم بوونـەوە كـە بـاودان (إيثـار)يـان هەبوو... بەڵام ئەم كەمەش هەر باش بوو و گرفتى زەمانى چارەسەر دەكرد..بـەڵام ئەم سەردەمەمان هەموو دەستەكان قووچاو بوون تا گەيشـتۆتە ئـەوەى زەكاتـدانى واجبيش كەم بۆتەوە !

ئەو كەسە چۆن خاترجەم دەبێـت كـە دەيـەوێت زانايـان و زاهيـدان بـۆ پەيـداكردنى نانێك شەو و ڕۆژ كار بكەن، ئەمە كارى ئەوانيش نييە و لێيشى نازانن؟ !

ديتمان كە دۆخەكـە وايكـرد ناچـارى داواكـردن لـە دەسـەڵاتدارەكان و شـلڕەوى لـە وەرگرتنـى شـتى نەشـياو بـن و زاهيـدانى بـەرەو ئـەوە بـرد لـەپێناو وەدەسـهێنانى دونيادا مەرايى و خۆنواندن بكەن.

بۆ خاتری خوا ئەی ئەوەی دەتەوێ دینەکەی بپارێزێت! چەند جارێك ئامۆگاریم کردی خەرجی و دەسبلاوی کەم بکەوە و تا دەتوانی پەیوەندییەکان سووك و تەنك بکەوە و ئەو درهەمەی پێتە بیپارێزە چونکە دینەکەتە! تێ بگە لەوەی ڕوونم کردەوە!

ئەگەر نەفس بۆ مەبەستەکانی خۆی هاتوهاواری کرد پێی بڵێ: ئەگەر ئیمانت هەیە ئارام بگرە، ئەگەر دەتەوێ بە لەناوبردنی دین دونیای فانی بەدەست بێنی ئەوا سوودی بۆت نییە، بیر لەو زانایانە بکەوە کە پارەیان لە ڕێی ناشەرعییەوە بەدەست هێنا دین و دونیایان ڕۆیشت و لەدەستدا! بیر لە زانایە ڕاستگۆیەکانیش بکەوە وەکوو ئەحمەد و بیشر، ڕۆژگار ڕۆیشت و یادی باشیان مایەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ﴾ (الطلاق: ٢ - ٣) واتە: هەر کەسێك تەقوای خودا بکات دەروویەکی لێ دەکاتەوە و بە جۆرێك ڕۆزی دەدات هەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتبێت و حیسابی بۆ نەکردبێت..

ڕۆزی خوداش بە ئاسانکردنی ئارامگرتن لەسەر بەلا و تاقیکردنەوە دەبێت، ڕۆژانیش دەڕۆن و سەرەنجامی ئارامگرتنی جوانیش هەر جوانە.

## ٢٩٦- لەگەڵ ژنەكانتان باش بن

پیاوێك سكاڵای ئەوەی لە كن كردم گوایە ڕقی لە ژنەكەیەتی، پاشان گوتی: لەبەر چەند شتێك ناتوانم لێی جیاببمەوە، وەكوو: قەرزی زۆری لەسەرم و منیش ئارامم كەمە، بەردەوام قسە لە زارم دەردەپەڕێ و سكاڵا دەكەم، چەند وشەیەك دەڵێم كە دەزانێ من ڕقم لێیەتی.

پێم وت: ئەمە سوودی نییە، بەڵكوو دەبێ لە دەرگای خۆیەوە بۆی بچیت!

پێویستە خۆت بە تەنیا دانیشیت و بیر بكەیتەوە و بزانیت كە ئەو بە هۆی گوناهەكانتەوە بەسەرتدا زاڵ كراوە، تۆش زۆر داوای لێبووردن لە خودا بكە و بگەڕێوە.

سەبارەت بە بێزاری دەربڕین و ئازاردانی، ئەوا سوودی نییە، هەروەكوو حەسەنی كوڕی حەجاج وتوویەتی: سزایەكە لە خوداوە بۆتان هاتووە، بە شمشێر ڕووبەڕووی سزاكەی مەبنەوە، بەڵكوو بە داوای لێخۆشبوون ڕووبەڕووی ببنەوە.

بزانـه تـۆ لـه پایـه و مـهقامی گرفتاریـت و بـه ئـارامگرتن پاداشـتت هەیـه: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ (البقـرة: ٢١٦) واتـه: ڕەنگـه ڕقتـان لـه شتێك بێت و بۆتانیش باشتر بێت.

بـه ئـارامگرتن لەسـەر ئـەوەی بڕیـاری لەسـەر داوە و هێناویەتـه پـێش مامەڵـه لەگـەڵ خـودا بکـه و داوای دەرووکردنـەوەی لێ بکـه، ئەگـەر داوای لێخۆشـبوون و تەوبـەکردن لـه گوناهـەکان و ئـارامگرتن لەسـەر بڕیـاری خـودا و داوای دەرووکردنـەوەت بەیەکـەوە کۆکردەوە ئـەوا سـێ جـۆر خواپەرسـتی هاتۆتـەدی که پاداشتی هەمووان وەردەگریت.

کـات بـه شـتی بێسـوود بـەفیڕۆ مـەدە، وا گومـان مەبـه کـه تـۆ ئـەوەی تەقـدیر کـراوە وەپـاش دەدەیـت: ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا﴾ (الأنعـام: ١٧) واتـه: ئەگـەر خـودا تووشـی ناخۆشـی و زیانێکـت بکـات هـەر ئـەو دەتـوانێ لەسەرت لاببات..

گێڕدراوەتـەوە کـه ڕۆژێـك سـەربازێك چـووەته مـاڵی (ئـەبی یەزیـد) ئـەویش بینیویـەتی و بـه هاوڕێیـەکی گوتـووە: بـڕۆن فـلان شـوێن، قـوڕە تـازە و شـلەکه دەربێنـه، لـه ڕوویەکـەوە گومـانێکی تێدایـه. ئـەویش چـوو دەری هێنـا، ئـیتر سەربازەکه ڕۆیشت.

بـەڵام ئـازاردانی تـۆ بـۆ ژنەکـه هـیچ ڕوویـەکی نییـه چـونکه ئـەو زاڵکـراوە، بـا کـار و مژوولبوونت به غەیری ئەمەوە بێت.

لـه هەنـدێ لـه پێشـینان گێڕدراوەتـەوه کـه پیاوێـك جنێـوی پـێ داوه، ئـەویش ڕوومـەتی لەسـەر زەوی دانـاوه و وتوویـەتی: خودایـه! لـەم گوناهـەم خۆشـبه که به هۆیەوه ئەمەت بەسەردا زاڵ کردم.

پیاوەکـه گـوتی: ئـەم ژنـه زیـاد لـه حـەد خۆشـی دەوێـم و زۆر بـاش خزمـەتم دەکات بەڵام ڕقی من بۆی له ناخ و دەروونم ڕەگی داکوتاوه.

پێم وت: به ئارامگرتن لەسەری، مامەڵەی خودا بکه، پاداشتت دەدرێتەوه.

بـه ئـەبی عوسمـان نەیسـابووری وتـرا: ئـەو کـاره چـییه کـه زۆر ئومێـدت پێـی هەیـه؟ گـوتی: لـه گەنجێتیمـدا کەسـوکارم هـەوڵیان دەدا ژن بێـنم، منـیش ملـم نـەدەدا..ژنێك هاتــه لام و گــوتی: ئــەی ئــەبوو عوسمــان! ئــەمن حــەزم لــێ کردوویـت و بـۆ خـاتری خـوا داوات لێ دەکـەم هاوسـەرگیریم لەگـەڵ بکـه. بـاوکیم هێنـا کـه هـەژار بـوو، لێـی مـاره کـردم و دڵـی پـێ خـۆش بـوو. کـاتێ ژنەکـه هاتـه کـنم دیـتم کـوێر و شـەل و ناتـەواوه، ئەوەنـده خۆشـی دەویسـتم نەیدەهێشـت بچـمەدەرێ، منـیش بـۆ ئـەوەی دڵـی نەشـکێنم دادەنیشـتم، ئەگەرچـی لـه ناخـەوه ڕقـم لێـی بـوو بـەڵام هـیچ ڕقـێکم بـۆی پیشـان نـەدەدا.. پـازده سـاڵ ئەوها مامـەوه تـا مـرد، هـیچ کـارێکم هێنـده ئومێـدم پێـی نییـه جگـه لـەوەی دڵـم نەشکاند.

پـێم وت: ئەمـە کـاری پیاوانـە! هاتوهـاواری کەسـی گرفتـار بـە بێـزاری دەربـڕین و دەرخسـتنی ڕقوکینــە چ سـوودێکی بـۆی هەیــە؟! بــەڵکوو ڕێگــای بــاش ئەوەیە بۆم باس کردیت: تەوبەکردن و ئارامگرتن و داوای دەرووکردنەوە.

ئـەو گوناهانــە وەبـیر خـۆت بهێنــەوە کـە ئەمــە سـزاکەیەتی، ئەگـەر دەروویــەك کرایەوە ئەوا باشە وەگەرنا ئارامگرتن لەسەر بڕیاری خودا خواپەرستییە.

ئەگـەر لــە دڵیشــەوە نــەبێ بــەڵام خۆشەویسـتیی خـۆتی بـۆ دەرخــە بـا بــەزۆر لەخۆکردنیش بێت.

کۆتوبەنـد هـیچ گونـاهێکی نییــە تــا ســەرکۆنە بکـرێ، بـەڵکوو دەبـێ مەشـغوول بێت لەگەڵ ئەو کەسەی کۆتوبەندی کردووە.

## ٢٩٧- خاترجەمی و خەڵوەت

گومـانی تێـدا نییـە کـە دڵـی بـاوەڕدار بـە خـودا و فەرمانـەکانی پێویسـتی بەوەیـە سەرقاڵ بێت بە یاد و گوێڕایەڵی و جێبەجێکردنی فەرمانـەکانی، ئەمـەش پێویسـتی بە خاترجەمی و دڵنیاییە، سروشتی مـرۆڤیش بـەو حـەزەی بـۆ ئارەزووەکـان تێیـدا دانراوە بەسە بۆ ئەوەی خاترجەمی و بیر و ئەندێشە پەرتوبڵاو بکات.

پێویستە مرۆڤ هەوڵ بدات بیر و خەیاڵ و کۆششی کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی دڵـی یـەکلا ببێتەوە بۆ یادی خوای گەورە و جێبـەجێکردنی فەرمانـەکانی و خۆئامـادەکردن بـۆ دیـداری، ئـەوەش بـەوە دێتـەدی ڕێگرەکـان نـەهێڵرێن و واز لـەو شـتانە بێنـێ کـە مەشغوولی دەکەن، ناشکرێ هەموو ڕێگری و کۆسپەکان بە جارێك نـەهێڵرێن بـەڵکوو پێویستە ئەوانە نەهێڵرێن کە لە توانادا هەیە.

نەمبینیوە لە دووشت زیاتر ببێتە مایەی پـەرتوبڵاوکردنی بـیر و خـەم و ئەندێشـەی دڵ:

یەکەم: گوێڕایەڵیی هەر شـتێك بکـەیت کـە نـەفس حـەزی لێیـەتی و داوای دەکـات، ئەوەش لە هیچ سنوورێك ناوەستێ، دیـن و دونیـا دەڕوات و هـەموو مەبەسـتەکەش بەدەست نایەت، وەکوو ئەوەی هەموو خەم و هەوڵێکی بۆ ژنانی جوان بێت یـان لـە

کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی، یان لە خواستی سەرۆکایەتی...هاوشێوەی ئەم شتانە. ئەمانە شتگەلێکن بیر و هۆش و کۆشش وەها پەرشوبڵاو دەکەن کە کۆناکرێنەوە، تەمەن دەڕوات و هەندێ لە مەبەستەکانی نایەنەدی!

دووەم: تێکەڵبوونی خەڵك – بەتایبەتی ڕەشۆکییان – و هامۆشۆی ناو بازاڕ، چونکە نەفس داوای ئارەزووەکان دەکات و کۆچکردن لە دونیای بیر دەچێتەوە و حەز بە تەنبەڵی لە گوێڕایەڵی و بێکاری و بێئاگایی و پاڵدانەوە دەکات، ئەو کەسەی دەقی گرتووە بە تێکەڵبوونی خەڵك سەختە بۆی بە زانست یان خواپەرستی مەشغوول بێت، ئیتر بەردەوام تێکەڵیان دەبێت تا ئەوەی غەیبەت و کات بەفیڕۆدانی لە هیچدا لە کنی ئاسان و ئاسایی دەبێت.

هەر کەسێك دەیەوێ خاترجەم بێت و هەوڵ و کۆشش و خەمی جەم بێت با گۆشەگیر و دابڕاو بێت، بە جۆرێك دەنگی هیچ کەسێك نەبیستێ، ئەو کات دڵ لەگەڵ زانست و زانیارییەکانی تەنها دەبێت و نەفس هاوڕێیەکی وەکوو ئارەزووی دەست ناکەوێ تا ئەو شتانەی بیربخاتەوە کە حەزی لێیەتی، ئەگەر ناچاری تێکەڵبوون بوو با بە ئەندازە و سنوور بێت، هەروەکوو بۆق کەمێك بۆ هەواگۆڕکێ دێتە دەرەوە پاشان دەگەڕێتەوە ناو ئاو.

ئەمە ڕێگای سەلامەتییە، سەرنج بدە سوودەکانی، بۆت باش و سوودبەخش دەبێ.

## ٢٩٨- جوێندان به ڕۆژگار

هیچ موسیبەتێکم نەدیوە گرفتاری خەڵك بووبێت گەورەتر لە جوێندانیان بە زەمان و عەیبەگرتنیان لە ڕۆژگار و سەردەم.

ئەمە لە سەردەمی نەفامی و جاهیلییەت بوو پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەهی لەوە کرد و فەرمووی: ((لا تَسُبّوا الدَّهرَ، فإنَّ اللهَ هو الدَّهر)) رواه البخاري و مسلم.. واتە: سوێند بە زەمان و ڕۆژگار مەدەن، چونکە خوای گەورە خولقێنەری سەردەم و ڕۆژگارە..

مەبەستی ئەوەیە: ئێوە جنێو بەو کەسە دەدەن کە پەرتوبڵاوی کردوون و کەسوکاری مراندوون و دەیدەنە پاڵ سەردەم و ڕۆژگار، بکەری ئەوەش خوای گەورەیە.

سەیرم هات چۆن نەخۆشەکان بەم حاڵەیان زانی و هێشتا لەسەر ڕەوشتی ئەهلی نەفامیین و نەگۆڕاون؟! تەنانەت ڕەنگە وێژەوانە زیرەك و ژیرەکان – بە گومانی خۆیان – کۆببنەوە و هیچ ئیشێکیان نەبێت جگە لە زەمکردنی ڕۆژگار! ڕەنگە دونیا بکەنە خودا و دەڵێن: دونیا وای کرد و وای چیێ کرد!! تەنانەت بینیومە (ئەبی قاسم ئەلحەریری) دەڵێ:

ولمّا تعامى الدهرُ وهو أبو الردى عن الرشد في أنحائه ومقاصده

تعاميتُ حتى قيل إني أخو عمى ولا غرو أن يحذو الفتى حذو والده

کاتێ ڕۆژگار له هەموو لایەك و مەبەستێکی چاوی لە تێگەیشتن نووقاند، منیش چاوم نووقاند تا ئەوەی وترا من وەکوو کوێر وام، هیچ سەیر نییە کوڕ چاو لە باوکی بکات!!

خەڵکێکم بینیوە پێیان وایە زانا و تێگەیشتوون و خۆیان لەمەش ناپارێزن! ئەمانە ئەگەر مەبەستیان لە ڕۆژگار تێپەڕبوونی کات و زەمان بێت ئەوا زەمان نە هەڵبژاردنی هەیە نە مەبەست، ڕاست و گومڕایی لێك جیاناکاتەوە، ناشبێت سەرزەنشت بکرێ، چونکە زەمان ڕێکخراوە نەك ڕێکخەر، هەڵسوکەوتی تێدا دەکرێ و هەڵسووڕاوە نەك هەڵسوکەوت بکات و هەڵسووڕێنەر بێت.

گومان نابرێ کەسی ژیر ئاماژە بکات بەوەی کە زەمکراو و ڕوو وەرگێڕ لە تێگەیشتن و پێگەیشتن، بڕیارخراپ زەمان و ڕۆژگار بێت!

ئەوانەشی باوەڕیان بە ڕۆژگار هەیە و جنێوی پێ دەدەن لە گرێبەستی ئیسلام دەرچوون و ئەم شتە ناشیرینانەیان داوەتە پاڵ خولقێنەر و پێیان وایە کە حیکمەتی کەموکورتە و کاری ناڕاستی کردووە، هەروەك ئیبلیس لەبارەی بەگەورەتر زانینی ئادەم باوەڕی وابوو.

ئەمانە لەگەڵ ئەم لادانەیان، بیروباوەڕی ئیسلام و نوێژکردن سوودی بۆیان نییە، بەڵکوو لە بێباوەڕان خراپترن، خوای گەورە کاروباریان ڕێك و ڕاست نەکات و ڕێنوێنی ڕێی ڕاستیان نەکات!!

## ٢٩٩- بەفیڕۆدانی تەمەن

لەو سەیر و سەمەرانەی لە خۆم و هەموو خەڵك دەیبینم: مەیل و ئارەزووە بۆ بێئاگابوون لەوەی لە دەستمانە لەگەڵ ئەوەی دەزانین تەمەن کورتە و پاداشتی زۆری ئاخیرەتیش بە ئەندازەی کارکردنی ئێرەیە.

ئەی تەمەنکورت! سوود لەم دوو ڕۆژەی دونیا وەرگرە و چاوەڕێی ساتی مردن بە! ئامان، نەکەیت دڵت بە شتێك سەرقاڵ بکەیت کە بۆی دورست نەکراوە و نەفست ناچاری تاڵی بکە و ئەگەر ملی نەدا سەرکوتیکە و جڵەوی بۆ شل مەکە چونکە تۆ لەناو لەوەڕگادایت نەوەك دوورکەوێتەوە و لێت ون بێت..کەسێك لە گەرمەی شەڕدا بێت عەیبە بۆی خۆی بدزێتەوە و خۆی بە شتی تر مەشغوول بکات.

## ٣٠٠- پاراستنی نهێنی

چەند جار ئەم واتایەم لەم کتێبەدا دووبارە کردۆتەوە ئەویش بریتییە لە پاراستنی نهێنی و وریابوون لە کرانەوەی نەشیاو لە بەردەم خەڵك.

ڕەنگە کەسێکی کراوە و ئاشوبۆش لە بەردەم کەسێك کە بە هاوڕێی دادەنێ لەبارەی هاوڕێیەکیەوە یان لەبارەی دەسەڵاتدارەوە قسەیەك بکات و بەلایەوە گرینگ نەبێ، ئەوە ببێتە هۆی لەناوچوون.

ئامۆژگاری ئەو کەسەی دڵ و دەروون پاکە و گومانی باش بە خەڵك دەبات دەکەم کە: خۆی لە خەڵك بپارێزێت و لەبارەی خەڵکەوە قسەیەك نەکات کە بۆ خەڵك باش نەبێت و فریو نەخوات بەو کەسەی هاوڕێیەتی یان دینداری دەردەخات، خراپی و پیسی هەموو کەسێکی گرتۆتەوە.

## ٣٠١- یادی ڕاستەقینەی خودا

سەرنجی خواپەرستیی زۆربەی خەڵکم دا دیتم بریتییە لە عـادەت و خووپێـوەگرتن، بەڵام بێدار و بەئاگایان عادەت و نەریتەکانیشیان خواپەرستیی ڕاستەقینەیە.

بێئاگا وەکوو عـادەت دەڵـێ سـوبحانەڵڵا! بـەڵام بێـدار و بـەئاگا بـەردەوام بـیر لـە سەیروسەمەرەکانی مەخلووقات یان گەورەیی خودا دەکاتەوە، بیرکردنەوە لـەوەدا دەیبزوێنێ و دەڵێ: سوبحانەڵڵا، پاکوبێگەردی بۆ خودا.

ئەگەر مرۆڤ بیر لە هەنارێك بکاتەوە و سەیری ڕیزکردنی دەنکەکانی و پاراسـتنی بـە توێکڵ بکاتەوە نەوەك گچکە و پووچ ببێتەوە، هەروەها بیر لەمانە بکاتـەوە: بـوونی ئاو لەناو تۆو و دەنکۆڵە و دروستکردنی توێکڵێك بۆ پاراستنی، دروستکردنی بێچـوو لە سکی هێلکە، مرۆڤ لە منداڵدانی دایك... مەخلووقاتی تـریش، ئـەم بیرکردنەوەیـە هــەڵێنا بــۆ بەگــەورەگرتنی خــودای خولقێنــەر و گــوتی: ســوبحانەڵڵا! ئــەوا ئــەم تەسبیحە بەرهەمی بیرکردنەوەیە.

ئەمە تەسبیحی بێدار و بەئاگایانە... بەردەوام بیرکردنەوەیان لە جووڵە و گەڕدایـە، ئیتر بەم تەسبیحاتە خواپەرستییان هاتۆتەدی و مسۆگەرە.

هەروەها بیر لە گوناهە ناشیرینەکانی پێشوو دەکەنەوە و ئەو بیرکردنەوەیە دەبێتە هۆی جوولەی ناخ و نیگەرانیی دڵ و پەشیمانیی نەفس، ئەوەش وا دەکات بڵێن: خودایە داوای لێخۆشبوون دەکەم (ئەستەغفیروڵڵا).

ئەمە بریتییە لە تەسبیح و داوای لێخۆشبوون.

بەڵام بێئاگاکان ئەوە وەکوو عادەت دەڵێن..بێگومان جیاوازییەکی زۆر لەنێوان هەر دوو کۆمەڵەدا هەیە.

## ٣٠٢- دابڕان له خه‌ڵك

خواپه‌رستی و زوهد و مژوولبوون به ئاخیره‌ت پاك و پوخت نابێ ئیللا به دابڕانی ته‌واو له خه‌ڵك نه‌بێ، به جۆرێك له کاتی پێویست نه‌بێ نه بیانبینێ و نه قسه‌یان ببیستێ وه‌کوو نوێژی هه‌ینی یان به‌کۆمه‌ڵ، له‌و کاتانه‌ش هه‌ر خۆی لێیان بپارێزێت.

ئه‌گه‌ر زانا بوو ده‌یویست سوودیان پێ بگه‌یه‌نێ ئه‌وا کاتێکی دیاریکراویان بۆ دابنێت و له قسه‌کردن له‌گه‌ڵیان خۆ بپارێزێت.

به‌ڵام ئه‌وه‌ی ئه‌مڕۆ هاموشۆی بازاڕ ده‌کات و له‌گه‌ڵ ئه‌م جیهانه تاریکه‌دا کڕین و فرۆشتن ده‌کات و شتی خراپ و ناشیرین و ناڕێك ده‌بینێ، ناگه‌ڕێته‌وه ماڵ ئیللا دڵی تاریك داهاتووه.

مورید ده‌بێ ده‌رچوونی ته‌نێ بۆ بیابان و گۆڕستانه‌کان بێت. کۆمه‌ڵێك له پێشینان کڕین و فرۆشتنیان ده‌کرد و خۆیان ده‌پاراست، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا بۆ پاکه‌کانیان کات ساف و پاك نه‌بوو تا له خه‌ڵك دابڕا.

ئه‌بوو ده‌رداء وتوویه: خواپه‌رستی و بازرگانیم کرد، به‌یه‌که‌وه دانوویان نه‌کولا، منیش خواپه‌رستیم هه‌ڵبژارد.

هـەر کەسـێك توانـای پـارێزیی سوودبەخشـی هـەبوو و ناچـار بـوو لەبـەر خـاتری خێزانەکەی تێکەڵاوی و کار بکات با وەکوو کەسێك کە بەناو درودالّدا دەڕوات خـۆی بپارێزێت هەرچەندە سەلامەتبوونیشی دووره.

## ٣٠٣- خۆپاراستن له گومانلێکراوەکان

هەر کەسێك دڵێکی پاك و چێژی لاڵانەوەی پێدرا با ئاگای له حاڵی بێت و لـه گۆڕان خۆی بپارێزێت! به بەردەوامبوونی تەقوا، ئەم حاڵەی بەردەوام دەبێت.

ئەمن دڵێکی پـاك و موناجـاتی تـەنیاییم پێـدرا بـوو، یـەکێك لـه خـاوەن پۆسـتەکان داوەتی کردم و نەدەکرا نەچم، لـه خواردنەکـەیم خـوارد، تووشـی چـەندان کێشـه و ناخۆشی بووم و دەمودەست سزاکەیم بینی و ماوەیەك بەردەوام بوو، دڵم لێ سەندرا و هەموو ئەو خۆشی و چێژەی هەمبوو لەدەستم دا.

وتم: سەیره! من لەمەدا وەکوو زۆرلێکراوێك بووم! (بۆچی ئەم سزایه درام؟)

بیرم کردەوە، دەکرا به چەند پارووییەکی گچکه دۆخەکه بەڕێ بکەم بەڵام تـەئویل و لێکدانەوە وای کرد ئەم خواردنه به ئارەزوویەکی زیـاتر لـه بـەڕێکردنی بـه مـودارات بخۆم.

نەفس وتی: جا من لەکوێوه بزانم که خود و سەرچاوەی ئەم خواردنه حەرامه؟!

ئاگایی گوتی: ئەی کوا خۆپاراستن له گومانلێکراو و شوبوهاتەکان؟!

کاتێ پارووییەکم به تەئویلکردن خـوارد و بـه تـەبیات خواسـتم، بـه لەدەسـتدانی دڵ تووشی گرفتی گەوره بووم، ئیتر خاوەن دڵ و بیناییەکان پەند و وانه وەربگرن!

## ٣٠٤- بیر و دڵی ئیماندار وابەستەی ئاخیرەتە

هیممەتی ئیماندار وابەستەی ئاخیرەتە، هەموو ئەوەی لە دونیادایە بەرەو یادی ئاخیرەت دەیجووڵێنێت، هەر کەسێ شتێك مەشغوولی بکات ئەوا هیممەتی دەبێتە کاری ئەو شتە.

نابینی کە ئەگەر پیشەوەران بچنە نێو خانوویەکی ئاوەدانەوە دەبینی کوتاڵفرۆش سەیری مافوور و ڕایەخەکان دەکات و نرخیان دیاری دەکات، دارتاش سەیری بنمیچەکە دەکات و نژیار (بەننا) دەڕوانێتە دیوارەکان و جۆلا تەماشای چنراوەکان دەکات.

ئیماندار ئەگەر تاریکاییەکی بینی تاریکایی گۆڕی بیردەکەوێتەوە، ئەگەر ئازاردەرێکی بینی سزای بیردەکەوێتەوە، ئەگەر دەنگێکی گەورەی بیست فووی کەڕەنای بیردەکەوێتەوە، ئەگەر بینی خەڵك نووستوون مردووەکانی گۆڕی بیردەکەوێتەوە، ئەگەر چێژێکی بینی بەهەشتی بیردەکەوێتەوە، هیممەتی وابەستەیە بەوەی لەوێیە، ئەوەش مەشغوولی دەکات لە هەموو ئەوەی تەواو بووە.

گەورەترین شت لە لای ئەوەیە کە بەردەوام خەیاڵی مانەوەی لە بەهەشت دەکات و مانەوەشی ناپچڕێ و بەردەوامە و تووشی هیچ ناخۆشییەك نابێ، کاتێ خۆی دێنێتە

بەرچاو کە لەناو ئەو چێژە بەردەوامانەدا دەخوولێتەوە کە تەواو نابن خەریکە لە خۆشییان خەنی دەبێ و ئیتر ئەو شتانەی لە ڕێگای گەیشتن بەم بەهەشتە دێنە ڕێی لە کن ئاسان دەبێ لە ئێش و نەخۆشی و تاقیکردنەوە و لەدەستدانی خۆشەویست و شالاوی مردن و چارەسەرکردنی خەم و ناخۆشییەکانی، ئەو کەسەی پەرۆشی کەعبەیە ماندووبوونی ڕێگای لە کن ئاسانە، ئەوەی شەیدای لەشساغییە گرینگی بە تاڵیی دەرمان نادات و دەزانێ کە باشیی بەرهەم و بەروبوومی ئەوێ بە ئەندازەی باشیی تۆوی ئێرەیە، بۆیە ئەو باشترین هەڵدەبژێرێ و چاندن لە تشرینی تەمەن بێ ساردبوونەوە دەقۆزێتەوە.

پاشان ئیماندار خەیاڵی چوونە ناو دۆزەخ و سزا دەکات، ژیانی ناخۆش دەبێ و نیگەرانی زیاد دەبێ.

بە هەردوو حاڵ لە دونیا و ئەوەی تێیدایە مەشغوول دەبێ، جارێك دڵی لە چۆڵەوانیی شەوق سەرگەردانە و جارێکی تر لە بیابانی ترس، هیچ ئاوەدانییەك نابینێت.

ئەگەر مردن یەخەی گرت گومانی بەسەلامەتبوون بەهێز دەبێ و ئومێدی ڕزگاربوونی بۆ نەفسی هەیە، ئیتر لەسەری سووك دەبێ.

کاتێ چووە ناو گۆڕەوە و فریشتەکان هاتن پرسیاری لێ بکەن هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان دەڵێن: وازی لێ بێنن، تازە ئیسراحەتی کردووە.

داوا لە خوای گەورە دەکەین بێدارییەکی تەواومان بداتێ کە بەرەو چاکەکان بمانبزوێنێ و لە هەڵبژاردنی خراپە و ناشیرینییەکان ڕێمان لێ بگرێ، ئەگەر سەرکەوتوو بوو ئەوا باشە وەگەرنا بێسوودە.

## ٣٠٥- جوانیی واتا و شێوه

شتێکی سەیرم لە خوای گەورە تێبینی کرد ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە کەسێك بۆ خۆشەویستی و نزیکایەتی هەڵدەبژێرێ کە لە ڕووی شێوە و واتاوە کامڵ و تێروتەواو بێت.

مەبەستم جوانیی وێنە و خەت و خاڵ نییە بەڵکوو کەماڵیی شێوە ڕێکوپێکییەتی، ڕێکوپێکیش لە جوانی خاڵی نییە، جوانیی وێنەی ناوەوەی بەدوادا دێت ئەویش کەماڵیی ڕەوشتەکان و نەمانی لێڵییەکانە کە لە ناخیدا پیسی و لێڵی و ناسازگارییەك نابینرێ، بەڵکوو چۆن ڕواڵەتی جوان کردووە ئەوهاش ناوەوەی جوان دەکات.

پێغەمبەر مووسا سەلامی خوای لێ بێت هەر کەسێك بیبینیایە خۆشی دەویست.

پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) وەکوو مانگی چواردەشەو بوو.

ڕەنگە دۆستی خوا ڕەشپێست بێت بەڵام جوانیی شێوە و وێنەکەی لە ڕووی واتاوە جوانە.

بە ئەندازەی تەواویی مرۆڤ لە ڕووی کەماڵی شێوە و ڕەوشت کاریشی وەها دەبێ، نزیك خستنەوەشی لە خودا بەو پێیە دەبێت، هەیانە وەکوو خزمەتکاری بەر دەرگایە، هەیانە دەرگەوانە، هەیانە نزیکخراوەیە.

دەگمەنن ئەوانەی کەماڵ و تێروتەواون، ڕەنگە لە سەت ساڵدا تەنها یەکێك هەڵکەوێت.

ئەمەش حیکایەتێکە بە هەوڵ و کۆشش نایەتەدی، بەڵکوو هەوڵ و کۆشش لەوەوە دێتەدی، چونکە ئەگەر تەواوکاری ڕوویدا ئەوا بە ئەندازەی کەموکورتی هانی هەوڵدان و خۆماندووکردن دەدات... ئەمەش هیچ توانایەك لە بنچینەدا نییە، بەڵکوو سروشت و خواڕسکە، ئەگەر خودا بۆ کارێك تۆی ویست ئەوا بۆی ئامادەت دەکات.

## ٣٠٦- ڕەخنەگرتن لە حیکمەتی خودا

سەرنجی خەڵکێکم دا کە بانگەشەی هۆش و ژیری دەکەن و ڕەخنە لە حیکمەتی خودای خولقێنەر دەگرن!

پێویستە پێیان بگوترێ: ئەم تێگەیشتنەی ڕێنوێنی کردوون حیکمەتی وی ڕەت بکەنەوە ئایا هەر ئەو پێی نەبەخشیون؟! ئایا کەماڵی بە ئێوە داوە و بۆ خۆشی بە کەموکورتی ڕازی بووە؟! ئەمە ئەو سپڵەییە تەواو و پەتییەیە کە لە بێباوەڕی و نکوڵیکردن ناشیرینترە.

یەکەم کەسی ئەم خەڵکانە ئیبلیس بوو، ئەو بە عەقڵی خۆی پێی وابوو کە جەوهەری ئاگر لە جەوهەری قوڕ باشتر و بەڕێزترە، بۆیە حیکمەتی خودای ڕەت کردەوە.

خەڵکێکی زۆر لە ڕەخنەگران لەسەر ئەمە ڕۆیشتن وەکوو: (ئیبن ئەلڕاوەندی) و (ئەلبەقەری)..

ئا ئەمە (ئەلمەعەڕڕی)ی نەفرەتکراو دەڵێ: چۆن ئیبن ئەلحەججاج بە گەوجی و گەمژەیی عەیبدار دەکرێ کەچی ڕەفتاری زەمان و ڕۆژگار لەو ناشیرینترە؟!

ئایا پێت وایە مەبەستی زەمانە؟! نا، چونکە زەمان کە گوزەرگای کاتە هیچ شتێك ناکات بەڵکوو ئەو قسەیەی ڕەخنەگرتنە لە خوای گەورە! ناوبراو پەلەی مردنیشی بوو بەو گومانەی ئیسراحەت دەکات! داوای دەسبەرداربوون لە هاوسەرگیری و خواپەرستی دەکرد! پێی وابوو هێنانەبوون جگە لە چەرمەسەری و ماندووبوون هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە و! چارەنووسی جەستەش ڕزیبوونە!!

ئەمەش ئەگەر وابێت هەروەك ئەو گومانی بردووە ئەوا هێنانەبوون گەمە و پووچە، خوای گەورەش لە گەمە و یاری دوور و خاوێنە، خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا﴾ (ص: ٢٧) واتە: ئاسمان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە پووچ و هەوەنتە نەمانخوڵقاندووە.

ئەگەر ئەوەی بۆمان خوڵقێنراوە بەخۆڕایی و یاری چێ نەکراوە، ئایا ئێمە — کە شوێنی مەعریفەتی خودا و بواری تەکلیفی ئەوین — پووچ و هەوەنتە خوڵقاوین؟!

نموونەی ئەم نەزانییە لە کەسێکەوە دەردەچێت کە بە ڕواڵەت سەیری بابەتەکانی عەقڵ دەکات وەکوو ئەوەی ببینێ بنیاتنراوێك هەڵبوەشێت و عەقڵی پەتییش هیچ حیکمەتێك لەمەدا نابینێ، ئەگەر حیکمەتی ئەوەی بۆ ئاشکرا بوو دەزانێ کە ئەوە ڕاستە، هەروەکوو بۆ مووسا ئاشکرا بوو کە مەبەستی خدر لە کونکردنی کەشتی و کوشتنی منداڵەکە چییە.

دیاره كه سەربڕینی ئـاژەڵ و پارچە پارچەكردنی كولێره و جوینی خـواردن هـیچ سـوودێكی دیـار نییـە، ئەگـەر زانـرا ئـەم ئاژەڵـە خـۆراكی جەسـتەی كەسـێكە كـە جەستەی لەو بەڕێزترە ئەوا ئەو كردەوەیە جوان و باش دەبێت.

سەیره! ئایا عەقڵەكان بڕیار نـادەن بـە گوێڕایـەڵیكردنی ئـەو خـودا حەكیمـەی كـە دەستەوسـانە لـە زانینـی حیكمـەتی مەخلووقاتـەكانی؟! چـۆن لـە كردەوەكـانی بەرهەڵستی دەكەن؟! پەنا بە خوا لە پشت تێكردن و دەست لێ بەردان.

## ٣٠٧- ئامۆژگاریکردنی دەسەڵاتداران

پێویستە ئەوانەی ئامۆژگاریی سوڵتان و دەسەڵاتدار دەکەن ئەوپەڕی نەرم و نیانی بەکاربێنن و بەوپێیە ڕووبەڕووی نەبنەوە کە ئەو ستەمکارە، چونکە دەسەڵاتدارەکان تاکڕەو و خۆسەپێنن، ئەگەر جۆرێك سەرزەنشتکردنیان ئاراستە کرا ئەوا بۆ ئەوان سووکایەتی و زەلیلکردنە و بەرگەی ئەوە ناگرن، بەڵکوو پێویستە ئامۆژگارییەکەی تێکەڵ بکات بە گەورەییی بەرپرسیارێتی و دەسکەوتنی پاداشت لە چاودێریی کاروباری هاووڵاتییان و باسکردنی ژیاننامەی دەسەڵاتدارە دادپەروەرەکانی پێشوویان...

پاشان با ئامۆژگار بەر لە ئامۆژگارییەکەی سەیری حاڵی ئامۆژگاریکراوەکە بکات:

ئەگەر دیتی ڕەوشت و ئاکاری باشە و مەبەستی خێرە — هەروەکوو مەنصووری کوڕی عەممار و غەیری وی ئامۆژگاریی هاروون ئەلرەشیدیان دەکرد و ئەویش دەگریا — ئەوا با ئامۆژگاری و وەسییەتی زۆری بکات.

ئەگەر بینی ستەمکارە و گرینگی بە چاکە نادات و نەزانی بەسەریدا زاڵ بووە، با هەوڵ بدات نە بیبینێ و نە ئامۆژگاریشی بکات، چونکە ئەگەر ئامۆژگاری کرد ئەوا

خۆی تووشی مەترسی دەکات، ئەگەریش ستایشی کرد ئەوا دەبێتە ماستاوچی و مەراییکەر.. ئەگەر ناچار بوو ئامۆژگاری بکات ئەوا با بە ئاماژە بێت.

هەندێك دەسەڵاتدار هەبوو لە کاتی ئامۆژگاریدا نەرم دەبوون و بەرگەی ئامۆژگارانیان دەگرت تەنانەت ئەبوو جەعفەری مەنصوور ڕووبەڕوو پێیان دەگوت تۆ ستەمکاریت و ئەویش ئارامی دەگرت..

بەڵام زەمان گۆڕا و زۆربەی دەسەڵاتدار و بەرپرسەکان خراپ و گەند بوون و زاناکانیش ماستاوچێتی و مەراییان بۆ دەکردن، ئەوەشی مەرایی نەدەکرد قەبووڵکردنی ڕاستی نەدەبینی بۆیە بێدەنگ دەبوو.

پێشتر کەس داوای بەرپرسیارێتی نەدەکرد مەگەر کەسێك زانستەکان پتەو و ئەزموونەکان قاڵ و پەروەردەیان کردبێت، بەڵام ئێستا زۆربەی بەرپرسەکان لە نەزانیدا وەکیەکن، بەرپرسیارێتی دەدرێتە ئەو کەسانەی ئەهل و شیاو نین.

ئەم جۆرە کەسانە پێویستە لێیان وریا و دوور بین، هەر کەسێك گرفتاری ئامۆژگاریکردنیان بوو با لەوەی دەیڵێت ئەوپەڕی وریا و بەپارێز بێت و نابێ فریو بخوات بەو قسەیان کە دەڵێن: ئامۆژگاریمان بکە! چونکە ئەگەر قسەیەکی کرد هاوڕێکی مەبەستەکانیان نەبوو ئەوا پلەی گەرمییان بەرز دەبێتەوە.

ئەو کەسەی ئامۆژگاریی سوڵتان دەکات با وریا بێت لەوەی بەخراپە باسی خاوەن دەسەڵات و بەرپرسی هەرێمەکان بکات چونکە ئەگەر ئەوەیان بیستەوە ئەوا هەوڵی

نەناوبردنی دەدەن لە ترسی ئەوەی سوڵتان چاودێریی حاڵوباریان بکات و کاریان لێ تێك بچێت.

لەم سەردەمە دوورکەوتنەوە لێیان باشترە و بێدەنگبوون لە ئامۆژگاریکردنیان سەلامەتترە، هەر کەسێکیش ناچار بوو با ئەوپەڕی نەرم و نیانی بەکاربێنێ و ئامۆژگاریی خەڵکی ڕەشۆکی بکات کە گوێی لێ دەگرن باشترە..

## ٣٠٨- بانگەشەکارانی پێغەمبەرایەتی

هەق بە ناهەق لێڵ و وێڵ نابێ، بەڵکوو ناهەق لای کەسێك کە فام و تێگەیشتنی نییە ڕاستییەکەی ون دەبێ.

ئەمە دەرهەق بەو کەسەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و دەرهەق بەوەیە بانگەشەی کەرامات دەکات.

سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی، ئەوا خەڵکێکی زۆر بانگەشەیان کردووە، ناشیرینییەکانیان دەرکەوتووە و کەتن و ئابڕووچوونەکانیان ڕوون بۆتەوە، هەیانە بە هۆی هیممەت نزمی و گەوزین لەناو ئارەزووەکان و ڕۆچوون لە قسە و کردار تا ئەوەی ئابڕوویان چوو.

لەوانە (ئەسوەدی ئەلعەنسی): بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و ناسناوی خۆی کردە (ذا الخمار) چونکە دەیگوت: (ذا الخمار) دێتە لام، سەرەتا کاهین بوو جادوو و تەڵەکەبازی دەکرد و شتی سەیر و سەمەرەی دەردەخست، لە ئاخروئۆخری ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرکەوت، (مەزحەج و نەجران) لەگەڵی ڕێك کەوتن و (عەمرو کوڕی حەزم) و (خالید کوڕی سەعید)ی نوێنەری پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) دەرکرد، یەمەنیش بۆی یەکلا بوویەوە و شەڕی

(شەهر کوڕی بازان)ی کـرد و کوشـتی و کچـەکەی مـارەکرد، ئـەویش لـە کوشـتنیدا هاوکاری کرد، بۆیە هەر لە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەناوچوو و بۆ ژیران دەرکەوت کە جادووکەر و تەڵەکەباز و فێڵزان بوو.

هەر لەو کەسانە (موسەیلەمە) بوو کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کـرد و نـاوی لێنـرا (رحمان الیمامة) چونکە دەیگوت: ڕەحمان دێتە لام! بـاوەڕی بـە پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) هێنا و بانگەشەی ئەوەی کرد گوایە لەگەڵ ئەو هاوبەشی پـێ کراوە! سەیر ئەوەیە ئەو باوەڕی بە پێغەمبەرێك هەبوو و دەیگوت: ئەو درۆزنە!

پاشان قورئانێکی هێنا کە خـەڵکی دەخستە پێکـەنین، وەکـوو ئـەم قسـەیەی: (یـا ضفدعُ بنتَ ضفدعين! نُقّي ما تَنُقّين، أعلاك في الماء وأسفَلُكِ في الطـين! ومـن العجائـب شـاةٌ سوداءُ، تَحلِبُ لبنا أبيض!) لەم ڕەوانبێژییەدا حەیا و ئابڕووی چوو..

واتە: ئەی بۆقی کچـی دوو بۆقـان! تـا دەتـوانی بقیڕێنـە، سـەرەوەت لـەناو ئـاوە و خوارەوەت لەناو قوڕ! لە شتە سـەیر و سـەمەرەکان مەڕەڕەشـێکە شـیری سـپیمان دەداتێ!

پاشان دەستی بە سەری منداڵێکدا هێنا هەموو مـووی سـەری هـەڵوەرا! تفێکـی لـە بیرێکی ئاو کرد وشك بوو!

ژنێکی بەناوی (سەجاح) کە بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەکرد مارەکرد، وتیان: دەبـێ مارەییەکی بۆ دانێیت. گوتی: مارەییەکـەی ئەوەیـە ئـەمن نوێـژی بـەیانی و عیشـام لەسەر هەڵگرتن!

ئەم سەجاحە دوای مردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگەشەی پێغەمبەرێتی کرد، کۆمەڵێك خەڵك بەدەمیەوە هاتن، گوتی: سوارەکان ئامادەکەن و بۆ تالآنی تەیار بن، پاشان پەلاماری هۆزی ڕیباب بدەن هیچ شتێك ڕێگر نییە و نایانپارێزێ، لەگەڵیان بجەنگن!

پاشان ڕووی کردە یەمامە و موسەیلەمە لێی ترسا، نامە و دیاری بۆ نارد، چووە کن موسەیلەمە و گوتی: ئەوەی جیبریل بۆت دێنێ بۆم بخوێنەوە! ئەویش وتی: (إنكن معشر النساء خلقتن أفواجًا، وجعلتن لنا أزواجًا، نولجه فيكن إيلاجًا.) واتە: ئێوەی ژنان پۆل پۆل دروست کراون و، کراون بە هاوسەری ئێمە، ئێمەش بەباشی بۆتان تێ دەنێین!

ئەویش وتی: ڕاست دەکەیت تۆ پێغەمبەریت. موسەیلەمە پێی گوت: دە هەستە بۆ ژووری نووستن جێخەوت بۆ ئامادە کراوە، ئەگەر ویستت لەسەر پشت یان لەسەر چوار پەل یان بە سێ چنگی یان بە هەموویەوە. سەجاح گوتی: بەڵکوو بە هەموو جۆرەکانیەوە، ئەوە باشتر کۆم دەکاتەوە!

ئیتر بەمە لە کن هاوەڵە ژیرەکانی ئابڕووی چوو، (عوتارد کوڕی حاجیب) گوتی:

أضحت نبيتنا أنثى يطاف بها ... وأصبحت أنبياءُ الناس ذكرانا

فلعنةُ الله ربِّ الناس كلهم ... على سجاحِ ومن بالإفك أغوانا

أعني مسيلمةَ الكذّابَ لا سُقيت ... أصداؤهُ من رُعَيثٍ حيثما كانا

پێغەمبەرەکەی ئێمە بووە مێ و خەڵك بەدەوریدا دەخولێنەوە و پێغەمبەری خەڵکیش بووە نێرینە، نەفرەتی خوای خەڵك لە سەجاح و ئەو کەسەی بە درۆ فریودراین، مەبەستم موسەیلەمەی درۆزنە کە هەرگیز و لە هەرکوێیەك بوون تێر ئاو نەخۆنەوە.

پاشان ئەم ژنە لە گومڕاییەکەی پەشیمان بوویەوە و موسڵمان بوو. تا موسەیلەمە کوژرا هەر باسی کەتن و گەندەڵی و ئابڕووچوونەکانی دەکرد.

(تولەیحەی کوڕی خوەیلد)یش هەر لەوانەیە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، دوای موسەیلەمە هات و ڕەشۆکییان بەدوای کەوتن و لە (سەمیراء) دانیشت و ناوی لێنرا (ذي النون)، دەڵێ: ئەوەی دێتە لای پێی دەوترێ(ذي النون)!

لە قسەکانی: (إن الله لا يصنع بتعفير وجوهكم و لا فتح أدباركم شيئا، فاذكروا الله أعفة قياما!)

واتە: خودا هیچ پێویستی بەوە نییە ڕوخسارتان لە زەوی وەردن و سمتتان بکەنەوە، بە خاوێنی و وەستاوی یادی خودا بکەن!

هەروەها لە قورئانەکەی: (والحمام واليمام، والصرد الصوام، ليبلغن ملكنا العراق والشام.)

سوێند بە کۆتر و یەمام و، جوقە شینکە! بەدڵنیاییەوە دەسەلات و موڵکمان دەگاتە عێراق و شام!

دوای وی، (عویەینەی کوڕی حیصن) هات، خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵی جەنگا، عویەینە هاتە لای تولەیحە، وتی: واویلا بۆت! فریشتە هاتۆتە لات؟ گوتی: نا، بگەڕێوە شەڕ بکە پاشان هاتەوە، وتی: هاتە لات؟ گوتی: نا. گەڕایەوە شەڕی کرد، پاشان هاتەوە، وتی: هاتە لات؟ گوتی: بەڵێ. وتی: چی پێی وتیت؟ گوتی: وتی: دەستارێکت هەیە وەکوو دەستاڕی وی و وتەیەکت هەیە لەبیرت ناچێتەوە. عویەینە هاواری کرد: سوێند بە خوا پیاوەکە درۆزنە. ئیتر خەڵك بە تێکشکاوی ڕۆیشتن و تولەیحەش بەرەو شام ڕایکرد پاشان موسڵمان بوو و ئیسلامەتییەکەی باش کرد و لە شەڕی نەهاوەند کوژرا.

واقیدی وتوویە: پیاوێك لە بەنی یەربووع پێی دەوترا: جوندەب کوڕی کولسوم، ناسناوی (کەردان) بوو، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیە وسلم) بانگەشەی پێغەمبەرێتی کرد و پێی وابوو بەڵگەی پێغەمبەرێتییەکەی ئەوەیە ئاگر بەر دەداتە بزماری ئاسن و قوڕەوە!! ئەمەش چونکە بە ڕۆنی بەیلەسان چەوری دەکرد و ئاگری تێ بەردەدا.

هەروەها پیاوێك بە ناوی (کەهمەش ئەلکیلابی) داوای پێغەمبەرێتی کرد و گومانی وا بوو خودا ئەمانەی بە سروش بۆ ناردووە: (یا أیها الجائع! اشرب لبنا تشبع، ولاتضرب الذي لا ینفع، فإنه لیس بمقنع!!)

ئەی برسی! شیر بخۆوە تێر دەبیت و لە شتی بێسوود مەدە...

گومانی وابوو بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەی ئەوەیە دەچێتە بەردەم ئاژەڵی دڕندە و نایخۆن، فرتوفێڵەکەشی ئەوە بوو جەستەی بە هەندێ دەرمان و پێکهاتەی ڕووەکی و ئاژەڵی چەور دەکرد، کاتێ دڕندەکان لێی نزیك دەبوونەوە بۆنی ئەو پێکهاتانەیان بۆ دەچوو دوور دەکەوتنەوە !

لە تائیفیش پیاوێك بە ناوی (ئەبوو جەعوانەی ئەلعامری) داوای پێغەمبەرێتی کرد و پێی وابوو بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەیە ئاگر فرێ دەدات ناو پەمۆ و ناسووتێ! ئەمەش لەبەرئەوەی بە ڕۆنێکی ناسراو چەوری دەکرد.

هەروەها (هوزەیلی کوڕی یەعفوور) لە بەنی سەعد کوڕی زوهەیر، ئەصمەعی لەبارەیەوە وتوویە: ئەو بەرهەڵستی سورەتی (الاخلاص)ی کرد و گوتی: (قل هو الله أحد، إله كالأسد، جالس على الرصد، لا يفوته أحد !)

بڵێ خودا تاك و تەنیایە، خوایەکی وەکوو شێرە، لە بۆسەدا دانیشتووە، هیچ کەسێك لە دەستی دەرناچێت !

هەر لەو کەسانە (هوزەیلی کوڕی واسیع) کە پێی وابوو لە نەوەی (ئەلنابیغەی ئەلزوبیانی)ە، بەرهەڵستی سورەتی (الكوثر) کرد، پیاوێك پێی گوت: چیت وتووە؟ گوتی: ( إنا أعطيناك الجواهر، فصلّ لربّك و جاهِر، فما يَرُدَنَّكَ إلا كل فاجر.)

ئێمە گەوهەر و مرواریمان پێ بەخشیت، تۆش نوێژ بکە و ئاشکرای بکە، تەنها بەدکار تۆ ڕەت دەکاتەوە !

(ئەلسنوری) بەسەریدا زاڵ بوو و کوشتی و لەسەر کۆڵەگەیەك لە خاچی دا، پیاوێك بەلایدا تێپەڕی و گوتی: (إنا أعطيناك العمود، فصل لربك من قعود، بلا ركوع ولا سجود، فما أراك تعود.)

ئێمە کۆڵەگەمان پێدایت، بۆ خۆت بەدانیشتنەوە نوێژ بکە، بێ چەمینەوە و کڕنووش، پێم وانییە جارێکی دیکە بگەڕێیتەوە !

یەکێکی تر لەوانەی کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد گوایە سروشی بۆ دێت ناوی (ئەلموختار کوڕی ئەبی عوبەید)ە، لە بانگەشەیدا شڕ و وڕ و پەشۆکاو بوو و خەڵکێکی زۆری کوشت، پێی وابوو ئەو یارمەتیی حوسەین – خودا لێی ڕازی بێت – دەدات، پاشان کوژرا.

یەکێکی تر لەمانە، (حەنزەڵەی کوڕی یەزیدی کوفی)ە، پێی وابوو بەڵگەی ئەوەیە هێلکە دەخاتە نێو کەمولەی شووشەوە و بە ساغی دەریدێنێ!

هێلکەکەی لەناو سرکەی لیمۆ دەخووساند و توێکڵەکەی نەرم دەبوو، پاشان ئاوی دەکردە شووشەکەوە، پاشان هێلکەکەی تێ دەپەست، کە ئاو بەر هێلکەکە دەکەوت ڕەق دەبوو.

هەروەها خەڵکێکی تر بەر لە هاتنی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) داوای پێغەمبەرێتییان کرد وەکوو زەردەشت و مانی و ئابڕوویان چوو. (ڕای بەهێز هەیە لەوەی زەردەشت پێغەمبەر بووە نەك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردبێت، ئابڕووشی نەچووە بەڵکوو شوێنکەوتەیەکی زۆری هەبووە.)

هەر کەسێك بانگەشەی پێغەمبەرێتی کردبێت ئیللا ڕیسوا بووە.

قەرامیتە فرتوفێڵی سەیریان هێنا، هەموو ئەمانە و فرتوفێڵەکانیانم لە کتێبی مێژووم بە ناوی (المنتظم) باس کردووە، هیچ کەسێکیان تێدا نەبووە ئیللا حەیای چووە و شکستی هێناوە.

بەڵگەی ڕاست و دروستیی پێغەمبەرمان لە هەتاو ڕووناکترە:

بە هەژاری دەرکەوت و خەڵك دوژمنی بوون، بەڵێنی ئەوەی پێدرا کە دەبێتە خاوەن خاك و زەوی، بوویەش، هەواڵی پێدرا کە دواتر چی دەبێت بوو، لە سەردەمی پێغەمبەرێتییەوە لە چڵێسی و هیممەتنزمی و درۆ و خۆبەزلزانی پارێزرا، بە متمانە و ئەمانەت و دەسپاکی و داوێنپاکی پاڵپشتی کرا، پەرجووەکانی بۆ دوور و نزیك دەرکەوتن.

کتێبێکی وەهای بۆ هات کە عەقڵی ڕەوانبێژان تێیدا سەراسیمە بوو و نەیانتوانی ئایەتێکی هاوشێوەی بێنن چ بگات بە سورەتێك، خەڵك هەبوو هەوڵیدا و شتی گوت و حەیای چوو.

پاشان هەواڵی دا کە کەس ناتوانێ بەرهەڵستی قورئان بکات، چۆنی وت وەها بوو، ئەوەش ئەم ئایەتەیە: ﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ﴾ تەنها سورەتێك بێنن، پاشان فەرمووی: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ (البقرة: ٢٣ - ٢٤) ئەگەر نەیانتوانی و ناشتوانن.
هەروەها ئایەتی: ﴿فَتَمَنَّوُاْ الْمَوْتَ... ۝٩٤ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا﴾ (البقرة: ٩٤ - ٩٥) خۆزگەی مردن بخوازن.....هەرگیز خۆزگەی پێ ناخوازن..

هیچ کەسێك خۆزگەی مردنی نەخواست چونكە ئەگەر یەكێك بیگوتبایە خۆزگەی مردنم خواستووە ئەوا بانگەشەكەی پووچەڵ دەبووەوە.

لە شەوی غەزای بەدر دەیگوت: سبەینێ فلان لێرە دەكوژرێ، ئیتر هەر لەو شوێنە كوژرا.

دەیفەرموو: ((ئەگەر كیسرا لەناوچوو، كیسرایەكی تر دوای وی نایەت، ئەگەر قەیسەر لەناوچوو قەیسەرێكی دیكە دوای ئەو نایەت)) بوخاری و موسلیم گێڕاپتیانەوە.

ئیتر دوای ئەوان كەسێك دەسەڵاتێكی وای نەبوو كە هێز و پێزی زۆری هەبێ و حاڵوباری سەقامگیر بێت.

گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستگۆییەكەی دونیانەویستییەكەیەتی، شەوان بە برسێتی سەری دەخستە سەر سەرین، ئەگەر لە خۆی پێویستتر هەبووایە بەشی خۆی پێ دەدا، خوری دەپۆشی و شەوان بۆ خواپەرستی هەڵدەستایەوە...لێهاتوویی و فرتوفێڵ بۆ دەسكەوتنی ئارەزووەكان بەكاردەهێنرێت، كاتێ ئەو دونیای نەویست ئیتر ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو مەبەستی ئاخیرەتە و خەڵك بەرەو ئەوێ ڕێنوێنی دەكات.

پاشان ئایینەكەی هەمیشە بەرز دەبوویەوە تا هەموو دونیای گرتەوە، ئەگەرچی بێباوەڕی لە گۆشەكانی زەویدا ماوە بەڵام ڕیسوا و كزۆڵە.

پاشـان لـه شـوێنكه‌وتووانی ئوممه‌ته‌كـه‌ی زاناگـه‌لێك په‌یـدا بـوون كـه ئه‌گـه‌ر پێغه‌مبـه‌رانی دێـرین گوێیـان لـه قسـه‌یان بووایـه ئـه‌وا لـه هه‌ڵێنجانـه جوانـه‌كانیان سه‌رسام ده‌بوون، هه‌روه‌ها ئه‌و زاهیدانه‌ی كه ئه‌گه‌ر ڕاهیبـه‌كان بیاندیبوونایـه ئـه‌وا لـه ڕاسـتگۆییی زوهـدیان واقوڕمـاو ده‌بـوون، هـه‌روه‌ها ئـه‌و ژیـر و زیره‌كانـه‌ی لـه پێشیناندا وێنه‌یان نه‌بووه.

ئه‌وه نییه گه‌لی مووسا مانگایان ده‌په‌رست و وازیان له سـه‌ربڕینی مانگـا دێنـا و لـه ده‌ریا ده‌په‌ڕینه‌وه پاشان ده‌یانگوت: خوایه‌كمان بۆ دانێ؟!

گه‌لی عیسا ئه‌گه‌رچی نه‌هییان لێ كرابوو به‌ڵام خواردنی سـه‌ر خوانیـان هه‌ڵده‌گرت و داده‌كـرد؟! سنوورشـكێنانی ڕۆژی شـه‌ممه لـه پێنـاو ماسـیدا سه‌رپێچـی خودایـان ده‌كرد؟!

بـه‌ڵام ئوممـه‌تی ئێمـه سـوپاس بـۆ خـوا لـه‌م شـتانه سـاغ و سـه‌لامه‌ته، بـه‌ڵكوو لـه هه‌ندێكیان ئاره‌زوویه‌ك بۆ ئه‌و ئاره‌زووانه‌ی جڵه‌وگیرییان لێ كراوه هه‌یه، ئه‌وه‌ش لـه لـق و پۆپـه‌كان نـه‌ك لـه بنچـینه‌كان، ئه‌گـه‌ر ئامۆژگـاری كـران، ده‌گـریێن و لـه‌و كه‌مته‌رخه‌مییه‌یان په‌ژیوان ده‌بنه‌وه.

سوپاسی خودا ده‌كه‌ین له‌سه‌ر ئه‌م ئایینه و له‌سه‌ر ئه‌وه‌ش كه ئێمـه ئوممـه‌تی ئـه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ین (صلى الله عليه وسلم).

كۆمه‌ڵێك له‌وانه‌ی به ڕووكه‌ش خۆیـان بـه زاهیـد پیشـان ده‌دا بـه‌ره‌و لای خواسـتنی دونیا و سه‌رۆكایه‌تی وه‌رچه‌رخان، ئاره‌زوو گومڕای كـردن، بـه ده‌رخسـتنی هه‌نـدێ

لەو شتانەی بە کەڕامات دەچن فێڵ و تەڵەکەیان لـە خـەڵك کـرد، وەکـوو حـەللاج و ئـیبن ئەلشـاش و هـیتر لەوانـەی لـە کتێبـی (تلبیس إبلـیس) باسـی فرتوفێڵـەکانیانم کردووە...ئەو شتانەیان لەبەر جیاوازیی مەبەستەکانیان کرد.

خوای گەورە بەردەوام لەم ئایینـەدا زانایـانی وەهـا پـێ دەگەیـەنێ کـە ئـەو شـتانە دەردەخەن کە کەمتەرخـەمان دەیشـارنەوە، هـەروەها زانایـانی فـەرموودە دروسـت دەکـات کـە ئـەتك و کەشـفی ئـەو شـتانە بکـەن کـە فەرموودەهەڵبەسـتان بـڵاوی دەکەنەوە، ئەوەش بۆ پاراسـتنی ئـەم ئایینـە و دوورخسـتنەوەی گومانـەکان لێـی، بەردەوام زانا و فەرموودەناس عەیب و عاری درۆودەلەسەچیان لە دانانی فـەرموودە یان دەرخسـتنی بانگەشـەی زوهـد ئاشـکرا دەکـەن، بانگەشـەکانیان کـار لـە کـەس ناکات مەگەر نەزانێکی دوور لە زانست و کردەوە.

﴿ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ (الأنفال: ٨) واتە: بۆ ئەوەی هەق دامەزرێنێ و ناهەقیش پووچەڵ بکات ئەگەر تاوانکارانیش پێیان ناخۆش بێت.

## ٣٠٩- تێگەیشتن لە واتـای بوون

سەیر لە پەیداکراو و هەبوویەك (موجود) کە واتای بوونی تێ ناگات، ئەگەر تێگەیشتنیش بە گوێرەی تێگەیشتنەکەی کارناکات!! دەزانیێ تەمەن کورتە کەچی بە نووستن و دەسبەتاڵی و قسەی پڕوپووچ و گەڕان بە دوای چێژەکان بەفیڕۆی دەدات، بەڵکوو ڕۆژەکانی تەمەن ڕۆژانی کار و کردەوەن نەك کاتی بەتاڵی.

لە لایەن شەرعەوە داوای لێ کراوە بە ماڵ بەخشین سەرپێچی لە تەبیاتی بکات کەچی ئەو چروکی و ڕەزیلی دەکات تا ئەوەی دەگاتە لێواری گۆڕ ئەو کات دەڵێ: دوای مردنم پارەم بۆ ببەخشنەوە و ئەوە بکەن! ئەگەر کرا ئەمە دەکەوێتە کوێ؟! دووریشە بکرێت، مەبەست لە بەخشینت لە کاتی سەلامەتیدا سەرپێچیکردنی تەبیاتە بەوەی زۆر لە خۆت بکەیت بەرگەی ناخۆشییەکان بگریت، ئەگەر فام و تێگەیشتنت هەیە جیاوازی بکە لە نێوان دوو حاڵەتەکە!

بەختەوەر ئەو کەسەیە ئاگای لە نەفسی خۆی بووە و بە گوێرەی عەقڵی کاری کردووە و سوودی لە کاتێك وەرگرتووە کە کۆتاییەکەی نەخۆشیی درێژخایەنی پەکخەرە و تەمەنێکی قۆستۆتەوە کە تەواوبوونی نزیکە!

واوەیلا بۆت! چ لە پاشەکەوت و داکردنی ماڵ و سامانێك دەکەیت کە نە چاکەیەك لە پەڕاوی کردەوەت زیاد دەکات و نە ڕێز و ناوبانگێکت لە مێژوو بۆ تۆمار دەکات؟! بەخشینی ئەبووبەکر و ڕەزەیلیی سەعلەبەت نەبیستووە؟! کاریگەریی ستایشکردنی حاتەم و چرووکیی حەباحیبت نەبینیوە؟!

مـالۆیران! ئەگـەر خـودا لـە مـاڵ و سـامانەکەت بـە کەمبوونـەوە تاقیـت بکاتـەوە هاتوهـاوارت لێ هەڵدەسـتێ، یـان شـەوێك گرفتـاری نەخۆشـییەکت بکـات دەسـت دەکەیت بە سکاڵا و ناڵەناڵ، تۆ هەموو خواستەکانت لە خودا بەتەواوی وەردەگریت بەڵام ئەو مافانەی وی کـە لەسـەرتن نایـدەیت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١﴾ (المطففـين: ١) واتە: واوەیلا بۆ ئەوانەی شتی خەڵك کەم دەکەنەوە.

با بزانرێت کە ئەو ئەندازە کەمتەرخەمی تێدا کراوە نەمریی هەمیشەیی لـە پاداشـتی کار تێیدا هەڵدەوەشێنێتەوە.

پـاك و بێگـەردی بـۆ ئـەو زاتـەی نیعمـەتی ڕژانـدووە بەسـەر ئـەو خەڵکانـەی لـە مەبەستەکە تێ گەیشتن و جەستەیان ماندوو کرد و دڵی کەسـانی تریشـی داپۆشـی، بوونیان وەکوو نەبوون وایە.

کەسی ژیر چۆن جەستەی وەکوو حوشتر ماندوو ناکـات کـە مەبەسـتی گەیشـتن بـە مینایە؟!

ئەی بەندە! حاڵ و کاری هەق چییە کە لە پەیداکردنتدا ڕوون و ئاشکرایە؟!

بەڵێ سوێند بە خوا، بوونی تـۆ بەڵگـەی بـوونی ئـەوە و، نیعمەتـەکانی بەسـەرتەوە بەڵگەی بەخشندەییتی، هەروەك تۆی باو داوە بەسەر هەموو گیانلەبـەران تـۆش لـە دڵتدا بەسەر هەموو خواستەکان باوی بدە.

ئای چەند بێهیوا و داماوە ئەوەی خودای نەناسیوە ! چـەند هـەژارە ئـەوەی پشـتی تێ کردووە ! چەند زەلیلە ئەوەی شانازی بە غەیری ویەوە کردووە ! خەم و مخابن بۆ ئەو کەسەی بە غەیری خزمەتکردنی ویەوە سەرقاڵە !

## ٣١٠- ئامادەكاری بۆ دوارۆژ

من سەیرم بەو كەسە ژیرە دێت كە مردنی هاوڕێ و دراوسێیەكانی دەبینێ چۆن ژیانی خۆش دەبێ؟! بەتایبەتی ئەگەر تەمەنی هەڵكشا!

سەیر لەو كەسەی دەبینێ مارەكان بۆی دەخشن و نیگەران نابێ؟! ئایا كەسی پیر خشۆكی مردن لە ئەندامەكانی نابینێ، هێز و پێزی لێ بڕاوە و ڕەش سپی بووە، پاشان هەموو ڕۆژێك كەموكورتی زیاد دەبێ.

ئەگەر عەقڵ سەیری نەفسی خۆی بكات ئەوە مەشغوولی دەكات لە تەماشاكردنی وێرانبوونی دونیا و دابڕانی برایان ئەگەرچی ئەوە ناخۆش و مایەی بێزاری بێت، بەڵام مەشغوولبوونی كەسێك كە ماڵی ئاگری گرتووە بە گواستنەوەی كەلوپەلەكانی بێئاگای دەكات لە باس و یادی ماڵە دراوسێیەكان.

ئەوەی دونیا لەبیر دەباتەوە و دابڕان لێی سووك دەكات گۆڕینەوەی ناسراوەكانە بە نەناسراوەكان... دەوڵەمەندگەلێكمان بینی (ایثار)یان هەبوو، بەر لە خۆیان خەڵكی تریان بە لاوە گرینگ بوو، وە هەژارانێك ئارامیان دەگرت و كەسانێك كە موحاسەبەی نەفسی خۆیان دەكرد خۆپارێزییان دەكرد... گەمژەكان بە عاقڵەكان و ڕەزیلەكان بە بەخشندەكان گۆڕدران.

ڕۆیشتن و كۆچكردن چەند ئاسانە! ڕەنگە نەفس ئەوەی لە دەستی داوە ببینێتەوە و بگات بەوەی خۆشی ویستووە.

## ٣١١- گەمژەیی بێباوەڕان

سـەیری وتـەی خـوای گـەورەم کـرد کـە دەفـەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ﴾ (الحج: ١٨) واتە: نابینی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە و خـۆر و مانگ و ئەستێرەکان و چیاکان و درەخت و گیانلەبەران و زۆرێك لە خـەڵك کڕنـووش بۆ خودا دەبەن.

دیتم هەموو شتە بێگیانەکان بە کڕنووش وەسف کراون و لە عاقڵان هـاوێر کـراون! ئەم قسەیەم بیرکەوتەوە:

ما جحدَ الصامتُ مَن أنشأهُ ... ومن ذوي النطقِ أتى الجحود

بێدەنگ نکوڵی لەو زاتە نەکردووە کە دروستی کردووە، بەڵام نکوڵی و بێباوەڕی لـە خاوەن زمانەوە هاتووە!

وتم: ئەمە توانایـەکی گەورەیـە، عـەقڵ بـە کەسـێك دەدرێـت پاشـان سـوودەکەی لێ وەردەگیرێتەوە! ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر خوایـەکی بـەتوانای زاڵ، وەگـەرنا چۆن دەگونجێ عاقڵێك بـە بـوونی خـۆی بـوونی ئـەوەی دروسـتی کـردووە نـەزانێ؟ چۆن بە دەستی خۆی بتێك دەتاشێ پاشان دەیپەرستێ؟!

بەڵام خوای گەورە عەقڵی بە خەڵكانێك بەخشیوە تا بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنێ و بیانوویان ببڕێت و هەروەكوو ویستوویەتی چاوی لە ئاست ڕێگای ڕوون كوێر كردوون.

## ٣١٢- وازهێنان له تێکهڵاویی کهسانی نهشیاو

بۆ ئیماندار هیچ شتێك ئەوەندە ئازاری زۆر نییە وەك لە تێکەڵاوی کەسانی نەشیاو، چونکە سوخەت (الطبع) لە یەکتر وەردەگیرێ، ئەگەر لاساییان نەکاتەوە و لێیان وەرنەگرێ ئەوا لە کار و کردەوەی سارد دەبێتەوە.

بینینی دونیا هاندەرە بۆ خواستن و گەڕان بەدوایدا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پەردەیەکی بەسەر دەرگاکەیەوە بینی لێی کردەوە و دڕاندی و فەرمووی: ((من و دونیا کوجا مەرحەبا؟!))..کراسێکی لەبەرکرد نەخشی تێدا بوو، فڕێیدا و فەرمووی: ((نەخش و نیگارەکانی مەشغوولیان کردم))..ئەنگوستیلەیەکی لە دەست کرد پاشان فڕێیدا و فەرمووی: ((سەیری ئێوەم کرد و سەیری ئەوم کرد))..

هەروەها بینینی دونیادۆستان و کۆشك و تەلار و حاڵوباریان، بەتایبەتی بۆ کەسێك نەفسێکی هەبێ خوازیاری بەرزی بێت.

هەروەها بیستنی گۆرانی و تێکەڵبوونی ئەو سۆفییانەی ئەمڕۆ تەنها سەرنجیان لەو ڕۆزییەیە کە وەدەستیان هاتووە جا لە هەر شوێنێکەوە بێت قەبووڵی دەکەن و پارێز ناکەن لە وەرگرتنی لە ستەمکار و هیچ ترسێکیان نییە وەکوو ئەوانەی

پێشـووی خۆیـان، (سـەری سـەقتی) بەدرێـژاییی شـەو دەگریـا و لـە خۆپـارێزیش زیادەڕەوی دەکرد، ئەمانەی ئێستاش نـە خۆپـارێزیی (سـەری) و نـە خواپەرستیی (جونەید)یان هەیە، بەڵکوو هەر خەریکی خواردن و سـەما و بێکـاری و گـوێگرتن لـە گۆرانیی منداڵە لووسکەڵەن، تەنانەت یەکێکی متمانـەپێکراو وتـی: لەگـەڵ پیـاوێکی گـەورە کـە بـە یـەکێك لـە شـێخەکانی خانـەقا ئامـاژەی پـێ دەکـرێ ئامـادە بـووم، گۆرانیبێژەکەیان لووسکەڵەیەك بوو، شێخ هەستا و بە دینارێك نیشـانەیەکی لەسـەر ڕوومەتی کرد!

بانگەشەکردنیان بەوەی کە ئەم شتانە بـەرەو ئـاخیرەت بانگیـان دەکـات درۆیـەکی شاخدارە!

سەیر و سەمەرە لەمان نییە، بەڵکوو سەیر و سەمەرە لەو نەفامانەیە کە پارەیـان لێ خەرج دەکەن و ئەو فرتوفێڵەیان بەسەردا تێدەپەڕێ!

کۆمـەڵێك لـە پێشـینانی کـۆن دەیـانبینی سـۆفییەکانی سـەرەتا خواپەرسـتی و خۆپـارێزی دەکـەن، ئـیتر سەرسـامی حاڵیـان دەبـوون، ئـەوان لـەم سەرسـامبوونە بەخشـراون، ئەگەرچـی زۆربـەیان لـە خواپەرسـتییاندا لەسـەر ڕاسـتەڕێ نـەبوو هەروەکوو لە کتێبەکەم بە ناوی (تلبیس إبلیس)دا باسم کردووە.

بەڵام ئەمڕۆ ئەوەی بن بەڕەی هەمووی هاتۆتـە سـەر بـەڕەی، یـەکێکیان هاتوچـۆی ستەمکاران دەکـات و مـاڵ و سـامانیان دەخـوات و بـە کراسـێك تەوقـەیان لەگـەڵ دەکات کە هیچ نەخشێکی تێدا نییە! ئەمە تەنها تەسەووفە!!

ئەوە ئەو کەسە شەرم لە خوا ناکات کە لە پێناو خەڵك نەك خودا وازی لە جلوبەرگی بەرز هێناوە و واز لە خواردن و شتی گومانلێکراو ناهێنێ؟!

دووربوون لەمانە پێویستە. پێویستە ئەو کەسەی بۆ خواپەرستی لە خەڵك دابڕاوە تا پێی بکرێ نەچێتە بازاڕ، ئەگەریش چوونی پێویست بوو با چاوی داگرێ و سەردانی بەرپرس و خاوەن پۆست و هاونشینەکانی نەکات، ئەگەر ناچار بوو با موداراتی بابەتەکە بکات و لەگەڵ ڕەشۆکی تێکەڵ نەبێ تەنها بۆ زەرورەت لەگەڵ خۆپارێزی، دەرگای ژنهێنان لە خۆی نەکاتەوە، بە تاکە ژنێکی دیندار قەناعەت بکات، شاعیر وتوویەتی:

والمرءُ ما دامَ ذا عينٍ يُقَلِّبها — فِي أعينِ العينِ موقوفٌ على خَطَرِ
يَسرُّ مُقلَتَهُ ما ضرَّ مُهجَتَهُ — لا مرحباً بسرورٍ عادَ بالضَّررِ

مرۆڤ ماتووڵ خاوەن چاوێك بێت چاو ببڕێتە چاوجوانان هەمیشە لە مەترسیدایە، بەو سەیرکردنەی چاوی شاد دەبێ بەڵام بە زیانی ڕۆحی تەواو دەبێ، خۆشییەك بەخێرنەیەت کە زیانی هەبێ.

ئەگەر زانست بەسەریدا زاڵ بێت خۆی بە لێکۆڵینەوەی زانست مەشغوول دەکات و یەکلا دەبێتەوە و خۆی لە شوێنکەوتە فێرخوازەکان دەپارێزێ، ئەگەریش خواپەرستی بەسەریدا زاڵ بوو ئەوا زیاتر خۆی دەپارێزێ! با خەڵوەت و تەنیایی بکاتە هاودەم و سەیرکردنی ژیاننامەی پیاوچاکان بکاتە هاونشین! با جاروباریش سەردانی گۆڕی پیاوچاکان بکات و خەڵوەت بکات! نابێ ویردی شەونوێژی

لەدەست بچێت، با دوای نیوەی یەکەم بێت، تا دەتوانێ درێژی بکاتەوە، ئەم کاتانە بێ وێنەن! با کۆچکردنی لە دونیا بەم نزیکانە بێنێتە بەرچاو تا هیوا و ئومێدی کورت بێت و! بە ئەندازەی دوور و درێژیی سەفەر توێشوو لە ڕێگا کۆبکاتەوە!

لە خودا داواکارین لە فەزڵی خۆی بێدارییەك و ڕووکردنە خزمەتیمان بداتێ و بە ڕوو لێ وەرگێڕانی ڕیسوا و داماومان نەکات، ئەو نزیکی وەڵامگۆیە.

## ٣١٣- نيعمەتەكانى خودا بێسنوورن

هەركات سەيرى دابارينى بەردەوامى نيعمەتەكان بەسەرمدا بكەم، لە سوپاسكردنيان سەرگەردان و سەراسيمە دەبم!

دەزانم كە سوپاسگوزاريش لە نيعمەتەكانە، چۆن سوپاسگوزارى بكەم؟! بەلاَم من دان بە كەمتەرخەميم دادەنێم و هيوادارم ئەو دانپێدانانەم هەندێ ماف و هەق جێبەجێ بكات.

ئەمن سيفەتێكم هەيە هەموو هيوايەكى خێرم پێيەتى ئەويش ئەوەيە: هەر كەسێك كە بەڕۆژوو دەبێ يان نوێژ دەكات پێى وايە ئەو خواپەرستى كردووە و خزمەت دەكات وەك ئەوەى بلێيت ماف و هەقى خزمەتكراوى داوە، بەلاَم من پێم وايە كە ئەگەر دوو ڕەكات نوێژم كرد ئەوا دەرۆزە و سوالْ دەكەم، بۆ نەفسى خۆم كار دەكەم، چونكە خزمەتكراو لە خواپەرستيى من بێنيازە.

هەندێ مەشايەخ دەلێن: لە فەرموودەدا هاتووە: ((**الدعاء عبادة**)) صحيح، رواه أحمد و ابن ماجه و أبو داوود...واتە: نزاكردن خواپەرستييە.

من دەلێم: خواپەرستى نزاكردنە.

سەیر ئەو کەسەیە کە بۆ خزمەت دەوەستێ داوای بەشی خۆی دەکات، چۆن پێی وایە شتێکی کردووە؟! تۆ داوای پێویستی خۆت دەکەیت، خزمەتی تۆ بەرەنگاری ئەو زاتەی پێ ناکرێت کە نیعمەتی وی بەئاگای هێناویت، منیش وەکوو سەرەتا دەڵێم:

يا مُنتهى الآمالِ أنتَ كفلتَني وحفِظتَني

وعدا الزمانُ عليَّ كي يجتاحني فمنعتني

فانقادَ لي مُتخشعًا لمّا رآكَ نصرتني

وكسوتني ثوبَ الغنى ومِن المطالبِ صُنتني

فإذا سكتُّ بدأتني وإذا سألتُ أجبتني

فإذا شكرتُكَ زدتني فمنحتني وبهرتني

لو إنني أجُد بالمالِ فالأموالِ أنتَ أفدتني"

ئەی ئەوپەڕی هیوا و ئاواتم، تۆ دەستەبەرت کردم و پاراستمت، زەمان دەسدرێژی کردە سەرم تا لەناوم ببات تۆ ڕێت لێ گرت، کاتێ دیتی تۆ یارمەتیت داوم بۆم ملکەچ بوو، بەرگی بێنیازیت لەبەرکردم و لە تێکشکان پاراستمت، کە بێدەنگ دەبووم قسەت لەگەڵ دەکردم و ئەگەر داوام لێ کردبایت پێت دەدام، ئەگەر سوپاسم کردبایت بۆمت زیاتر دەکرد، ئەوەندەی پێ بەخشیم سەرسامت کردم! ئەگەر ماڵ و سامان ببەخشم هەر هی تۆیە و تۆ پێت داوم..

## ٣١٤- خەڵك یان خوا

دیتم زۆربەی زانایان بە شێوە و ڕووکەشی زانستەوە سەرقاڵن، خەمی فەقیـە و زانـا وانەوتنەوەیە، خەمی ئامۆژگار (واعین) ئامۆژگارییە.

ئەمە ئاگای لە وانەکەی خۆیەتی، بە زۆریی ئەوانەی گوێی لێ دەگرن دڵـی خۆشـە و تانـە دەدات لـە قسـەی ئـەوەی پێچـەوانەی وییـە، کـاتی لـە بیرکردنـەوە لـە شـتە هاودژەکان بەسەر دەبات بۆ ئەوەی ئەو کەسە تێك بشـکێنێ کـە مشـتومڕی لەگـەڵ دەکات و چاویشی لەوەیە هەمیشە لە سەرووی مەجلیسان دانیشێت، ڕەنگە هەوڵ و هیممەتی بۆ کۆکردنەوەی ماڵی دونیا و تێکەڵبوونی دەسەڵاتداران بێت!

ئامۆژگار هەوڵ و هیممەتی بۆ ئەوەیە قسە و وتـەکانی بڕازێنێتـەوە و خـەڵکی زیـاتر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و دڵی بۆ بەگەورەزانینی ڕابکێشێ، ئەگەر لە کارەکەیدا هاوشێوەی هەبوو ئەوا تانەی لێ دەدات.

ئەم دڵانە لە خودا بێئاگـان چـونکە ئەگـەر مەعریفـەتیان لەبارەیـەوە هەبووایـە بـەو مەشـغوول دەبـوون و بـە موناجـاتکردنی هـۆگر دەبـوون و گوێڕایـەڵیکردنی ئـەویان هەڵدەبژارد و ڕوویان دەکردە خەڵوەت و تەنیایی لەگەڵ خـودا... بـەڵام کـاتێ لەمـە خاڵی بوو بە دونیاوە سەرقاڵ دەبێ ئـەو دونیایـەش وەکـوو وییـە. ئەگـەر خـەریکی

خزمەتكردنی خوداش بوو هیچ چێژێكی لێ نابینێ، كۆبوونەوەی خەڵكی لە دەوروبەری لە لا خۆشەویستترە و سەردانیكردنی خەڵكی بۆ كنی لە لا لە پێشترە..ئەمەش نیشانەی ڕیسوایی و دەست لێ بەردانە.

پێچەوانەی ئەمە، هەر كاتێ زانا ڕوو لە خوا بوو، بە گوێڕایەڵیكردنیەوە مەشغوول بوو، قورسترین شت لە لای دیدار و قسەكردنە لەگەڵ خەڵك، خۆشەویسترین شت لە لای خەڵوەت و تەنیاییە، ناپەرژێتە سەر تانەدان لە هاوشێوەكانی یان خواستنی سەرۆكایەتی، ئەوەی لە ئاخیرەت هیممەتی پێوە بەستووە زۆر بەرزترە لەوە.

دەبێ نەفس شتێكی هەبێ پێوەی مژوول بێت، هەر كەسێك بە خزمەتكردنی خەڵكەوە مەشغوول بوو و پشتی كردە هەق ئەوا پەرە بە سەرۆكایەتییەكەی دەدات، ئەوەش دەبێتە هۆی پشتكردن لە هەق، خوای گەورە لە هەناوی هیچ كەسێك دوو دڵی دانەناوە.

## ٣١٥- بینینی شتەکان وەکوو خۆیان

لە وتەیەکدا هاتووە: خودایە! شتەکان وەکوو خۆیان کە هەن پیشانمان بدە!

ئەمە قسەیەکە لەوپەڕیی جوانیدا و زۆربەی خەڵکی شتەکان وەکوو خۆیان نابینن، لەناوچوو وەکوو هەمیشە ماوە دەبینن، خەیاڵی نەمانی ئەوەی لەناویدان ناکەن، ئەگەر ئەوەشیان زانی وەڵێ چاوی هەست مەشغووڵە بە سەیرکردنی ئەوەی لەبەرچاوە.

ئایا ڕۆیشتنی چێژ و مانەوەی گوناهەکەی نابینێت؟! ئەگەر دز دەستبڕینی خۆی دیت، شتە دزراوەکەی لە کن بێنرخ دەبێ.

هەر کەسێك ماڵ و سامانی کۆکردەوە و نەیبەخشی، ئەوا وەکوو خۆی نەیبینیوە کە بریتییە لە ئامرازێك بۆ وەدەستهێنانی ئامانج و مەبەستەکان، زاتی خۆی مەبەست نییە.

هەر یەکێك بە چاوی ئارەزوو سەرپێچی و گوناهی بینی ئەوا نەیدیوە چونکە عەیب و نەنگی زۆری تێدایە، پاشان بەرهەمەکەی سزایەکی ئاخیرەت و ئابڕووچوونێکی دونیاییە.

سەیری گەورەترین ئارەزووەکانی هەست بکە کە پەڕینە! ئاو پەیدا نابێ ئیللا دوای خواردن و خواردنەوە نەبێ.

هەر کەسێك بیر لە خواردن بکاتەوە سەیری کێلانی زەوی دەکات کە پێویستی بە گا و گۆتاڵ هەیە بۆ زەوی کێلان بە گاسن کە ئاسنێکە لەگەڵ دارێك و پەتێکی پێوە بەستراوە...هەر یەکێك بیر لە دروستکردنی پەت و گوریس بکاتەوە سەیری چاندنی ڕووەکی گوش و ڕستنی و، ئاسن و هێنانی و کوتانی و، دار و ڕووەك و تاشینی و سوڕانەوەی دۆلاب و کارکردنی دەکاتەوە، پاشان دوورینەوەی بەرهەمەکە و شەنوکەوکردنی و هاڕینی و شێلانی و کردنە نانی، هەروەها ئاگردان و تەندوور و هێنانی دار و سووتەمەنی... ئیتر لەم جۆرە گەر بۆی بڕوانیت زۆر زۆرە، تەنانەت وتوویانە: بۆ دەسکەوتنی هەر پاروە نانێك نزیکەی سێ سەت کەس کاری کردووە.

کە ئەو پارووەی خوارد با بیر لە چێکردنی ددانەکان بۆ پارچە پارچەکردنی و کاکیلەکان بۆ هاڕینی بکاتەوە، هەروەها شیرینیی ئاوی دەم بۆ تێکەڵکردنی و زمان بۆ هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی، ماسوولکەکانی زمان بۆ بەرز و نزمکردنی تا بتوانرێ قووت بدرێ... پاشان ڕێخۆڵە دەیخوات و دەیگەیەنێتە جەرگ، ئەویش دەیکوڵێنێ، کە بووە خوێن خڵتە و ئاوەکەی ڕەوانەی میزڵدان دەکات و لە خوێن پاکترین و خاوێنترینی بۆ جگەر و مێشك و دڵ دەپاڵێوێ، لەوەش باشترینی وەردەگرێ و شۆڕی دەکاتەوە بۆ گونەکان و ئامادەی دەکات بۆ خولقاندنی مرۆڤ.

ئەگەر ئاگری شـەهوەت بـزوا ئـەم دڵۆپـەئاوە (نوتفـە) دەردەپەڕێ...شـەرعیش بـە پاکی داناوە، منداڵدان و ئەو شوێنەشی (زەکـەر) دەچـێتە ناویـەوە هـەر بـە چـاکی داناوە... ئیتر لەوێ مرۆڤ دەخولقێت.

ئەم مرۆڤە بە نرخێکی گرانەوە هاتووە دوای ئەو سەیر و سەمەرانەی باسمان کـردن نەك ژماردمان!!

هەر کەسێ لەمە تێگەیشت ئایا شـتێکی جوانـە ئـەو نوتفەیـە لـە حـەرام پـەرتوبڵاو بکاتەوە یان لە شوێنێکی پیس بپەڕێ و بەفیڕۆ بچێت؟!

زینا چەندان ناخۆشی و کێشەی لێ دەکەوێتەوە کە دەیەکی دەیـەکی ناکاتـە چـێژی ساتێك!

وەکوو: ئابڕووچـوونی نێـو خـەڵك و هەڵدانـەوەی عـەورەتی حـەرام و ناپـاکیی بـرای موسڵمان لە هاوسەرەکەی ئەگـەر خێزانـدار بـوو، ئابڕووچـوونی زینـا لەگـەڵکراو کـە وەکوو خوشك یان کچیەتی..ئەگەر ژنەکە مێرددار بوو و لـەو زیناکـەرە ئـاووس بـوو ئـەوا ئـەو منداڵـە زۆڵـە دەدرێتـە پـاڵ مێردەکەیـەوە، ئـیتر ئـەم زیناکـەرە دەبێتـە هۆکارێك بۆ میراتگرتنی کەسێکی ناشایستە و بێبەشبوونی کەسێکی شایسـتە..ئیتر ئەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەڕوات.

خەشم و قینی خوداش ئەوا ئاشکرا و دیارە: خوای گـەورە فەرموویـەتی:﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ٣٢﴾ (الإسراء: ٣٢) واتـە: لـە داوێنپیسـی نزیـك مەکەونەوە چونکە ئیشێکی زۆر قۆڕ و ڕێگایەکی خراپە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((دوای هاوبەشی دانان بۆ خودا هیچ گوناهێك لە لای خودا گەورەتر نییە لە نوتفەیەك كە پیاوێك بیخاتە نێو مندالّدانێكەوە كە بۆی حەلاڵ نییە)) لاوازە..

ئەگەر دروستكردنی شەهوەت نەبووایە پەڕین ڕووی نەدەدا چونكە بەیەككەیشتنی دوو ئەندامی ناشیرینە، كە نە شێوە و وێنەیان جوانە و نە بۆنیشیان خۆشە. بەڵكوو شەهوەت و ئارەزوو چاوی بینەر دادەپۆشێ بۆئەوەی مندالّ پەیدا ببێت.

هەر كەسێ شەهوەتی خواست و بە زینا تاوانەكەی بیرچوویەوە ئەوا شتەكانی وەكوو خۆی نەدیوە.

ئیتر لەسەر ئەمە خواردن و خواردنەوە و كۆكردنەوەی ماڵ و هیتریش قیاس بكە.

## ٣١٦- شتی بێسوود نییه

ئەگەر یەکێك گوتی: خوڵقاندنی شتی ئازاربەخش چ سوودێکی هەیە؟!

وەڵام: حیکمـەت و دانـاییی خـودا سـەلماوە و چەسـپاوە، ئەگـەر لـە هەنـدێ شت ون و نادیار بوو ئەوا تەسلیمبوون پێویستە.

پاشـان شـتە جوانـەکان بـە گشـتی نموونـەی ئـەو پاداشـتەن کـە ئامـادە کـراوە، ئازاربەخشەکانیش نموونەی ئەو سزایەن کە ئامادە کراوە.

هیچ شتێکی زیانبەخش نەخوڵقێنراوە ئیللا سوودێکی تێدایە.

بـە پزیشـکێك وتـرا: فلانکـەس دەڵـێ: مـن وەکـوو دووپشـکم زیـانم هەیـە و سوودم نییە؟

ئـەویش گـوتی: چـەندە بـێ زانسـت و زانیارییـە! دووپشـك سـوودی هەیـە ئەگـەر سـکی شـەق کـرا و پاشـان خراپـە سـەر شـوێنی پێوەدانەکـە. دەخرێتـە نێـو گلێنەیـەکی داخـراو پاشـان گلێنەکـە دەخرێتـە نێـو تەنـدوورەوە، کـە بـووە خۆڵـەمێش پاشـان کـەمێك لـەم خۆڵەمێشـە بدرێتـە ئـەو کەسـانەی بـەردی گورچـیلەیان هەیـە وردوخـاش دەبـێ بـێ ئـەوەی زیـان بـە ئەندامـەکانی تـری

بگەیـەنیٚ! دووپشـك بـە کەسـێکەوە بـدات کـە تـای کـۆنی هـەبیٚ تایەکـەی نـامێنیٚ. بـە کەسـێکی ئیفلیجـی وەدا ئیفلیجییەکـەی نـەما. دەخرێتـە نێـو ڕۆن تـا ڕۆنەکـە هێزەکـەی ڕادەکێشـیٚ، ئـەو ڕۆنـە شـێرپەنجە لـەناودەبات... نموونەی ئەمە زۆرە.

نـەزان دوژمنـی ئەوەیـە کـە نایزانێـت، گـەورەترین گەمژایـەتیش بەرپەرچدانەوەی زانایە لە لایەن نەزانەوە.

## ٣١٧- خۆشەویستی بە ئەندازەی ناسینە

هەرچەند فام و تێگەیشتنەکان لە ناسینی خودا ڕۆبچن و گەورەیی و لوتف و بەرزی ببینن، لە خۆشەویستیدا سەرگەردان دەبێ و لە سنووری جێگیری دەردەچێ.

کۆمەڵێك لـە خـەڵك خۆشەویـستیی خـودا بەسـەریاندا زاڵ بـوو، نـەیانتوانی تێکـەڵی خـەڵك بـبن، هـەیانبوو نـەیتوانی لـە یـاد و زیکرکـردن بێـدەنگ بێـت، تێیانـدا بـوو نەنووست مەگەر بە زاڵبوونی خەو نەبووایـە، تێیانـدا بـوو شـێت و وێڵـی دەشـتودەر بوو، هەبوو لە جەستەیدا سووتا...

(ئـەبوو عوبەیـدە ئەلخـەوواص) عیشـق و ئـەوین بەسـەریدا زاڵ بـوو، بـەناو بـازاڕدا دەڕۆیشت و دەیگوت: ئای چەند پەرۆشی ئەو زاتەم کە دەمبینێ و نایبینم.

(فەتحی کوڕی شەخرەف) دەیگوت: شەوق و پەرۆشیم بۆت درێژ بووەوە، هاتنم بـۆ لات خێراکە.

(قەیس کوڕی ئەلڕەبیع) بێ شەڕاب مەست و سەرخۆش بوو.

ئیبن عەقیل دەیوت: شڕ و شەپرێوی لـە پێنـاو خـودا باشـترە لـە خۆجـوانکردن بـۆ غەیری وی.

ئايا خەڵكى ڕووتت بينيوە جوانتر بێت لە ئيحرامپۆشەكان؟! ئايا بينيوتـە ئەوانـەى خۆيان بە جلكى جوانى دونيا ڕازاندۆتـەوە وەكـوو كراسـى پياوچـاكان جـوان بـن؟! ئايا سەرپۆشێكت ديوە جوانتر بێت لە خەوەنووچكەى شـەوبێداران؟! مەسـتييەكت بينيـوە جـوانتر لـە مووچـڕكە و شـۆكى ئەوينـداران؟! ئاوێكـت ديـوە سـازگارتر لـە فرمێسكى پەژيوانان؟! سـەرانێكت بينيـوە خـوارتر لـە سـەرى تێكشـكاوان؟! هـيچ شتێك جـوانتر و باشـتر بـە زەوييـەوە نووسـاوە وەك هەنيـەى نوێـژخوێنان؟! هـيچ دەسـتێك بەرزبۆتـەوە و هـيچ لـەپێك كراوەتـەوە هاوشـێوەى دەسـت و لـەپى ئارەزوومەندان؟! هيچ ئاوازێك هێندەى سۆز و گريانى پەرۆشان دڵانى بزواندووە؟!

شڕ و شەپڕێوى بۆ وەدەسهێنانى باشترين مەبەستەكان باش و گونجاوە، بۆيـە شـڕ و شەپڕێوى لە پێناو خزمەتى خاوەن نيعمەت باش و جوانە.

## ٣١٨- بەدهۆشی دەسەڵاتداران

زۆربەیان نە دین دەناسیٚ و نە پابەندی ئادابەکانی دەبیٚ... ئەگەر بە ئەسڵ بەدعەقڵ بێت و لەگەڵ ئەم بەدییەش شتێکی وای پیٚ نەدرابیٚ کە تەبیاتی باش و چاك بکات و هزری پیٚ بگەیەنیٚ ئیتر چۆن چاوەڕێی خێری لیٚ دەکریٚ. هۆش و ژیری بە فێربوون و وەدەسهێنانی زانست و مەشق و ڕاهێنان گەشە دەکات وەکوو ئەندامێکی لەش کە بە کارکردنی بەردەوام لێهاتوویی و کارامەیی بەدەست دێنیٚ. هەر ئەندامێك ئەگەر پەککەوتنی لەو کارەی بۆی ئامادە کراوە بەردەوام بوو پەکی دەکەویٚ و دەکوژێتەوە، بۆیە چاوی نووسەر و پینەچییان کز دەبیٚ و چاوی خەڵکی چۆڵ و بیابان تیژ دەبیٚ چونکە هیچ شتێك ڕێگری لە چاویان ناکات.

کاری عەقڵ بیرکردنەوە و سەرنجدانی سەرەنجامی ئەحواڵ و بەڵگەکاری و دۆزینەوە بە بینراو لەسەر نەبینراوە..

ئەمانە بەردەوام مەشکەڕەشیان پڕ دەکەن لە خواردن، ئەوەش زیان بە عەقڵ دەگەیەنیٚ...پاشان زۆر دەخەون، کە لە خەو هەستان مەی و ئارەق دەخۆنەوە..ئیتر عەقڵ تووشی پەکخستن و داپۆشین بوو، بۆیە پلان و نەخشەدانان و ڕێکخستنیش خراپ و بەد بوو.

## ٣١٩- قسەكردن بە پێی عەقڵی خەڵك

لە سەرکێشییە گەورەکان باسکردنی ئەو شتانەیە بۆ ڕەشۆکییان کە دڵیان بەرگەی ناگرێ یان لە ناخیاندا پێچەوانەکەی ڕەگی داکوتاوە. بۆ نموونە: خەڵکێك لە دڵیاندا پێچوواندن (التشبيه) ڕەگی داکوتاوە و پێیان وایە زاتی خودا پەیوەستی عەرشە و بە ئەندازەی عەرشە و بە ئەندازەی چوار پەنجە لە عەرش زیاترە!

نموونەی ئەمەیان لە شێخەکانیان بیستووە و لە لایان چەسپاوە کە ئەگەر خوا هاتە ئاسمانی دونیا شەش ئاسمانەکانی تری لێ خاڵی دەبێ!! ئەگەر یەکێکیان بۆ پاکڕاگرتنی خودا لەم بیرانە بانگ بکرێ و پێی بگوترێ: بەو شێوەیە نییە کە بە بیری تۆدا هاتووە بەڵکوو دەبێ فەرموودەکان چۆن هاتوون ئەوها لێك بدرێنەوە بێ ئەوەی ڕازی بیت بەوەی وەهمت کردووە، لەبەر دوو هۆکار ئەمەی لەسەر قورسە:

یەکەم: لەبەر زاڵبوونی هەست بەسەریدا و هەستیش لەسەر ڕەشۆکییان زاڵترە.

دووەم: لەبەر ئەو شتانەی لەو شێخانەی بیستووە کە لەو نەزانترن.

جا ئەوەی قسە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە دەکات سەرچڵی بە نەفسی خۆی دەکات.

بیستوومه له هەندێ لەو کەسانەی کە دیندار بووە و پێکچوواندن لە دڵیدا ڕەگی داکوتاوە گوێی له هەندێ زانایان بووه که باسی پاکڕاگرتنی خودای له پێکچوواندن کردووه وتوویەتی: سوێند به خوا، دەسەڵاتم بەسەریدا هەبووایە دەمکوشت!

بۆ خاتری خوا وریا بن لەوەی بێ هونەر و نەرمونیانی قسەیەك بۆ ڕەشۆكییان بكەن كه بەرگەی نەگرن، چونكه ئەم قسەیه له دڵی دەرناچێ و قسەكەریش سەرچڵی به ژیانی خۆی دەكات.

هەروەها هەموو ئەوانەی پەیوەست به بنچینەكانەوه.

## ٣٢٠- سەرکەوتوو کێیە؟

بە دەنگەدەنگە و تەنتەنەی پیاو و ئەو نوێژ و ڕۆژوو و سەدەقە و گۆشەگیرییەی دەیکات فریو مەخۆ! پیاو ئەو پیاوەیە کە ڕەچاوی دووشت دەکات: پاراستنی سنوورەکان و دڵسۆزیی کارکردن.

چەندان خواپەرستمان دیت بە غەیبەت و کردنی شتی ناجایەز کە هاوڕێکی ئارەزووی بێت، سنوورەکانی شکاند!

چەندان دیندارمان دیت لە کردەوەکەی نیازی غەیری خوای هەبوو!

ئەم دەرد و ئافەتەش لە نێو خەڵکدا زیاد و کەم دەکات.

پیاو ئەو پیاوەیە کە ڕەچاوی سنوورەکانی خوا بکات کە بریتییە لەو شتانەی لەسەری فەرز کراون و بەرەو هەوا و ئارەزووی نەیبەزێنێ و نیازی باش و جوان بێت، ئیتر گوفتار و ڕەفتاری پاك و پوخت بۆ خوای گەورە بێت، مەبەستی پێی خەڵك و بە گەورەگرتنی ئەوان نەبێت.

ڕەنگە کەسێکی سەرکز (خاشع) بۆ ئەوەی بێت تا بوترێ: خواپەرست! وە بێدەنگ تا بگوترێ: ترساو! وە تەرکەدونیا تا بوترێ: زاهید!

نیشانەی دڵسۆز ئەوەیە کە ئاشکرا و نهێنی وەکیەك بێت، ڕەنگە لەنێو خەڵکدا بەزۆر خەندە و کرانەوە بهێنێتە خۆی تاوەکوو ناوی زاهیدی لێ بکرێتەوە، ئیبن سیرین بە ڕۆژ پێدەکەنی، کە شەو دادەهات وەکوو ئەوە وابوو خەڵکی گوندەکی کوشتبێت!

بزانە خودا هاوبەش و شەریکی ناوێت، کەسی دڵسۆز تاك و تەنها مەبەستی ئەوە، ڕیاکار هاوبەشی بۆی داناوە بۆ ئەوەی ستایشی خەڵکی دەست بکەوێت، ئەوەش هەڵدەگەڕێتەوە و پێچەوانە دەبێتەوە، چونکە دڵیان بە دەستی خودایە، ئەویش دڵەکان لە دژی وەردەگێڕێ نەك بۆ لای ئەو.

سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە مامەڵەی ناوەکی و کردەوەکانی پاك و پوختن، ئەمە ئەو کەسەیە کە خەڵك خۆشیان دەوێت ئەگەر ئەو بایەخیشیان پێ نەدات، هەروەك ڕقیان لە ڕیاکار دەبێتەوە ئەگەر خواپەرستیشی زیاد بێت.

پاشان پیاوێك خاوەنی ئەم ڕەوشتانە بێت واز لە کەماڵیی زانستەکان ناهێنێ و کەمتەرخەمی ناکات لە خواستنی فەزیلەت و چاکەکان، تا بتوانێ زەمان پڕ دەکات لە زۆرترین خێر و چاکە و دڵیشی لە کاری دڵ ناوەستێ تا وای لێ دێت هەموو کاری دەبێتە خوای هەق..

## ٣٢١- ڕواڵەتبازی و خۆدەرخستن

خەڵکێکم دیت قەرزکوێرن و پاشان دەڵێن: ئەگەر مردین بمانبەنە گۆڕستانی ئەحمەد!!

ئایا نەیانبیستووە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر قەرزار و کەسێك دزی لە دەسکەوتی شەڕ کردبێت نوێژی نەکردووە و فەرموویەتی: ((ما يَنفَعُهُ صلاتي عليه)) ضعيف، رواه ابن ماجه و أبو داوود و النسائي.. واتە: نوێژکردنم لەسەری سوودی بۆی نییە.

خەڵکێك لە زانایانم دیت حەزی ناوبانگ هەڵینان تا ئەوەی ئیزنێکیان لە سوڵتان وەرگرت لە گۆڕستانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نێژران و دەشیانزانی کە خەڵکێکی لێیە ئێسکوپروسکی هەندێکیان بەسەر هەندێکیانەوەیە، لەو زانایانە کەسانێکیان تێدا بوو دەیانزانی شایستەی ئەو نزیکبوونەوەیە نەبوو!

کوا بەکەم و سووك زانینی نەفس؟!

ئایا نەیانبیستووە کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پێی وترا: لە ژوورەکەی عائیشە دەنێژرێیت؟ وتی: ئەگەر بە هەموو گوناهێکەوە جگە لە شیرك بە دیداری خودا بگەم پێم خۆشترە نەوەك خۆم بە شیاوی ئەوە بزانم؟!

بەڵام دابونەریت و حەزی سەرۆکایەتی بەسەر ئەمانەدا زاڵ بوو، ئیتر زانستیش هەروەکوو عادەت بەسەر زمانەکان دادێ نەك بۆ کارپێکردنی.

پاشان کار گەیشت بە کۆمەڵێك کە تێکەڵی دەسەڵاتداران بوون و دەستیان کرد بە ستەمکردن، ملە دەکەن بۆ ناشتن لە گۆڕستانی ئەحمەد و بەوە وەسیەت دەکەن!!

خۆزگە وەسیەتیان دەکرد لە شوێنی بەتاڵ بنێژرێن، بەڵکوو لەسەر مردووان دەنێژرێن و ئێسکی ئەمانە دەردەهێنرێت، ئیتر تا مردن هەر لەسەر ئەو ستەمە دەڕۆن کە دەقیان پێوە گرتووە و لەبیریان دەچێتەوە کە ئەوان لە هاوکار و یاریدەرانی ستەمکاران بوون.

ئایا نەیانزانیوە کە هاوکاری ستەمکار ستەمکارە؟!

لە فەرموودەدا هاتووە: ((كَفى بالمرءِ خِيانةً أن يكون أمِيناً للخَوَنة)) واتە: بۆ خیانەت و ناپاکی ئەوەندە بۆ مرۆڤ بەسە کە ببێتە ئەمین و ئەمانەتداری خائین و ناپاکان. (لە ڕاستیدا ئەمە فەرموودە نییە بەڵکوو وتەیەکی ئیمام جەوادە)..

بەندیەوان (السجان) بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی گوت: ئایا من لە هاوکارانی ستەمکارانم؟ وتی: نا، تۆ لە ستەمکارانیت، هاوکارانی ستەمکاران ئەو کەسەیە کە لە شتێکدا یارمەتی تۆ دەدات.

## ٣٢٢- ئێرەیی خراپ

دیتم خەڵك زەمی حەسوود دەکەن و زیادەڕەوی دەکەن و دەڵێن: تەنها بەدکار ئێرەیی بە خەڵك دەبات، دژایەتی نیعمەتی خوا دەکات و بە بڕیاری وی ڕازی نییە و بەخیلی بە برای موسڵمانی دەبات.

سەیری ئەمەم کرد پێم وانەبوو بەم شێوەیەیە کە دەیلێن. لەبەرئەوەی مرۆڤ حەز ناکات هیچ کەسێك لە سەرووی ئەوەوە بێت، ئەگەر دیتی هاوڕێکەی لەسەر وی بەرز بۆتەوە کاریگەر دەبێ و پێی خۆش نابێ لەسەر وی بەرز بێتەوە و حەزی دەکرد هاوڕێکەی ئەو دەسکەوتەی بەدەست نەهێنابایە، یان ئەویش وەکوو وی ئەوەی وەدەست هێنابایە بۆ ئەوەی بەسەر ویدا بەرز نەبووبایەوە.

ئەمەش لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا شێلراوە و هیچ سەرکۆنەیەکی لەسەر نییە، بەڵکوو سەرزەنشتکردنەکە لەوەیە ئەگەر بە قسە یان بە کردەوە کاری پێ بکات.

ئەمن پێم وابوو ئەمەم بە ئەزموون و لێکۆڵینەوە دەست کەوتووە بەڵام دیتم حەسەنی بەصرِی لە وتەیەکدا پێشی منی داوەتەوە، وتوویەتی: لەگەڵ هەموو بنیادەمێك حەسوودی هەیە، هەر کەسێك حەسوودییەکەی لە قسە و کردار ڕەنگی نەدایەوە ئەوا هیچ شتێکی لەسەر نییە.

## ٣٢٣- ژن زۆری و زیانەکانی

گەورەترین زیان کە تووشی مرۆڤ دەبێت زۆریی ژنە. یەکەم: بیر و خەم و هەوڵی لە خۆشەویستی و مودارات و غیرەت و خەرجییان پەرشوبڵاو دەبێت. دڵنیا نییە لەوەی یەکێکیان ڕقی لێ هەڵگرێ و غەیری وی بوێت، بە کوشتن نەبێ لێی ڕزگار نابێ! (مەبەست کوشتنی پیاوەکەیە لە لایەن ئەو ژنەوە کە ڕقی لێیەتی و پیاوێکی تری خۆش گەرەکە).

ئەگەر لە هەموو ئەوانە سەلامەت بوو ئەوا لە پەیداکردنی بژێوی بۆیان ڕزگار نابێ.

ئەگەر سەلامەت بوو، لە بێزاربوون لێیان یان لە هەندێکیان ڕزگاری نابێ، پاشان داوای شتگەلێك دەکات کە بە غەیری ئەوانیش ناکرێت، تەنانەت ئەگەر توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو ژنانی بەغدا شکا پاشان ژنێکی داپۆشراو لە دەرەوەی وڵات هات وا گومان دەبات ئەوەی لە کن ئەوان دەستی نەکەوت لە لای ئەو ژنە دەستی دەکەوێت! سوێند بە خوا، لە نوێتی و تازەییدا چێژ هەیە بەڵام ڕەنگە داپۆشراوێك ئەگەر کەشف کرا حەیای بچێت.

ئەگەر لە هەموو ئازارێکی پەیوەست پێیانەوە سەلامەت بوو جەستەی لە پەڕین ماندوو دەکات، خواستنی چێژوەرگرتن دەبێتە ڕێگر لە بەردەوامیی چێژبینین، ڕەنگە پاروویەك ببێتە هۆی ڕێگریکردن لە چەندان پاروو! ڕەنگە چێژێك هۆکارێك بووبێت لە پچڕانی چێژگەلێك!!

پیاوی ژیر ئەوەیە کە بە ژنێك ڕازییە ئەگەر هاوڕێکی مەبەستی بوو، هەر دەبێ شتێکی تێدا بێت کە بەدڵی وی نییە بەڵکوو کار بە زۆرینە دەکرێ.

پێویستە بەر لە سەیرکردنی جوانی، سەیری دینی بکرێت، چونکە ئەگەر دین کەم بوو هیچ پیاوێکی مەرد و ڕەند سوود لەو ژنە وەرناگرێ.

ئەوەی پیاوی پیر خێرا لەناودەبات پەرینە، با بە ڕەپبوونی چووك و هەبوونی شەهوەت فریو نەخوات، چونکە ئەوە هێز و پێزی وەها لێ دەردێنێ کە هاوشێوەی بۆ ناگەڕێتەوە، نابێ بە جووڵە و شەهوەت دەسخەڕۆ ببێت، ئەگەر دەیەوێت بمێنێتەوە با لە ژنان نزیك نەبێتەوە.

## ٣٢٤- كەمهۆش و فرەهۆش

ئەگەر كەسێكت بینی لە بنچینەدا كەمهۆشە، ئومێدت بە خێر و چاكەی نەبێ! بەڵام ئەگەر فرەهۆش بوو وەلێ ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بوو ئەوا ئومێدت پێی هەبێ!

نیشانەی ئەوەش ئەوەیە ئەو لە نەزانیدا كاروباری خۆی ڕێكدەخات و ئەگەر كارێكی بەدی كرد خۆی لە خەڵك دەشارێتەوە و لە هەندێ حاڵ چاودێری دەكات و لە كاتی ئامۆژگاریدا دەگریێ و ڕێز لە ئەهلی دین دەگرێت....ئەمە ژیر و عاقڵێكە ئارەزووی بەسەریدا زاڵ بووە، ئەگەر بە پەشیمانبوونەوە بەئاگا هاتەوە ئەوا شەیتانی ئارەزوو ون دەبێ و پاشای عەقڵ و هۆش دێت.

بەڵام ئەگەر لە بنچینەدا كەمهۆش بوو – نیشانەشی ئەوەیە كە سەیری سەرەنجامی نزیك و دوور نەكات و شەرم نەكات لەوەی خەڵك لەسەر بەدكاری ببینن و كاروباری دونیاشی ڕێك ناخات – ...ئەوە جێگای ئومێد نییە و دەستی لێ بشۆ، بە دەگمەن ئەم جۆرە كەسانە سەركەوتوو و سەرفراز دەبن، جاروبار ئەگەر سەركەوتوو بن هۆكارەكەی هەوێنێكە لە عەقڵ كە ئارەزوو دایپۆشیوە پاشان كەمێك دەردەكەوێ تا بگەڕێتەوە سەر خۆی، نموونەیان وەكوو فێدارێكە بەهۆش هاتبێتەوە.

## ٣٢٥- سەرنجدانی سەرەنجامەکان

پێویستە خۆت بپارێزیت لە هەموو ئەو شتانەی ئەگەری ڕوودانیان هەیە و نابێ بوترێ: بەزۆری مرۆڤ سەلامەتە.

کەسانێکمان بینی لەگەڵ ئەسپدا چووە ناو کەشتییەوە، کەشتییەکە پەشۆکا و شپرز بوو، ئەوەی لەناو کەشتییەکەدا بوو نقوم بوون، ئەگەرچی بەزۆری لەم حاڵەتەدا سەلامەتی هەیە.

پێویستە مرۆڤ لە خەرجییدا ئیکۆنۆمی بێت و دەست بە پارەوە بگرێت ئەگەر دیتی دونیا بەرەو ڕوویەتی، چونکە ڕەنگە ئەو دونیایە بپچڕێت و پێویستیی نەفسیش هەردەبێ جێبەجێ بکرێ، ئەگەر لە کاتی پارەداری و دەسڕۆیشتوویدا دەسبڵاوی کرد و دواتر کاتی دەستەنگی هات ئەوا دوور نییە تووشی ڕێگای خراپ و سواڵکردن لە خەڵك بێت.

هەروەها پێویستە لەشساغ خۆی بۆ نەخۆشی ئامادە بکات و بەهێز خۆی بۆ پیری ئامادە بکات...

بە گشتی، سەرنجدان لە سەرەنجامەکان و ئەوەی ئەگەری هەیە ڕووبدات کاری ژیرانە.

بەلاّم تەنها سەيركردنى حالّەتى ئێستا حالّى نەزانە گەمژەكانە، وەكوو ئەوەى خۆى بـە لەشسـاغ ببينـىٚ و نەخۆشـى لەبيربچـێتەوە يـان دەولّەمەنـد بێـت و هـەژارى بيربچێتەوە يان چێژێكى كاتى ببينىٚ و سەرەنجامەكەى بيربچێتەوە..

عەقلّ كارێكى نييە جگە لە سەرنجدان لە سەرەنجامەكان، ئەويش بە ڕاسـت ئامـاژە بەوە دەكات كە لەكوێوە دێت.

## ٣٢٦- پەلەنەکردن لە گیرابوونی نزا

لە کاتی تاقیکردنەوەدا ئیمانی باوەڕدار دەردەکەوێت، زیادەڕەوی لە نزا و پاڕانەوە دەکات و هیچ شوێنەوارێکی وەڵامدانەوە نابینێ و ئەگەر هۆکارەکانی بێهیواییش بەهێز بن ئەو هیوا و ئومێدی ناگۆڕێ چونکە دەزانێ خوای گەورە سوود و بەرژەوەندەکان باشتر دەزانێ، یان لەبەرئەوەی خوا دەیەوێ ئارامگری یان ئیمانی تاقی بکاتەوە، خودا بەم تاقیکردنەوەیە دەیەوێ ئەو باوەڕدارە لە دڵەوە تەسلیم بێت تاوەکوو ببینێت ئارامگری چۆنە یان دەیەوێ زۆر بپاڕێتەوە و پەنا بۆ خودا ببات.

بەڵام ئەوەی پەلەی وەڵامدانەوە و گیرابوونی دوعایەتی و ئەگەر نزاکەی زوو گیرا نەبێ بێزار و بێتاقەت دەبێ ئەوا ئەمە ئیمانی لاوازە و پێی وایە مافی ئەوەی هەیە وەڵام بدرێتەوە وەك ئەوەی کرێی کارەکەی وەردەگرێت.

چیرۆکی یەعقووبت نەبیستوە کە هەشتا ساڵ لەناو بەڵا و ناخۆشی بوو بەڵام هیوا و ئومێدی نەگۆڕا، کاتێ لەپاڵ ونبوونی یوسف، بنیامینیشی لەدەست دا هیوا و ئومێدی نەگۆڕا و گوتی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا﴾ (یوسف: ٨٣) واتە: ئومێدەوارم خوای گەورە هەموویانم بۆ بێنێتەوە.

ئەم ئایەتەی خوداش هەر ئەم واتایە دەگەیەنێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾﴾ (البقرة: ٢١٤) واتە: ئایا لاتان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێ تەنگانە و ناخۆشی)؟! مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە، کە تووشی شەڕ و ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بەڕادەیەك، هەتا پێغەمبەرەکەیان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا، دەیانوت: کەی پەروەردگار سەرکەوتن دەبەخشێت؟! ئیتر کەی خوا یارمەتی دەنێرێت؟! ئاگاداربن و دڵنیابن بەڕاستی یارمەتیی خوایی زۆر نزیکە.

ئاشکرایە ئەم قسەیە لە لایەن پەیامبەر و ئیماندارانەوە ناگوترێت ئیللا دوای ماوەیەکی زۆر لە بەڵا و ناخۆشی و نزیکبوونەوە لە بێهیوابوون لە ڕزگاربوون و دەروو لێ کرانەوە.

هەروەها هەر لەم بارەیەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: ((بەندە هێشتا سەلامەت و بەخێرە تا پەلە نەکات)) پێی وترا: پەلەکردن چییە؟ فەرمووی: ((بڵێ: دوعام کرد وەڵام نەدرامەوە و گیرا نەبوو))

نەکەی بۆ خاتری خوا ماوەی بەڵا و ناخۆشی بە درێژ بزانیت و لە زۆر پاڕانەوە بێزار بیت، تۆ بە بەڵا تاقیکرایتەوە، ئارامگرتن و دوعاکەت خواپەرستییە، هەر چەند بەڵا و ناخۆشی درێژ بێتەوە لە بەزەیی و ڕەحمەتی خودا بێهیوا مەبە.

## ٢٣٧- چێژەکان کاتین و زوو دەڕۆن

بیرم لە هۆکاری چوونە دۆزەخ کردەوە دیتم بە هۆی گوناه و سەرپێچییەکانەوەیە، سەیری سەرپێچییەکانم کرد بینیم بە هۆی خواستنی چێژەکانەوەیە، سەیری چێژەکانم کرد دیتم هیچ نین تەنها فرتوفێڵن و لەناویاندا ناخۆشیگەلێك هەن کە دەیانکەنە خەم و پەژارە، ئیتر لەوە دەردەچن چێژ بن، ئیتر عاقڵ چۆن شوێن نەفسی خۆی دەکەوێت و لە پێناو ئەم ناخۆشییانە بە دۆزەخ ڕازییە؟!

یەکێك لە چێژەکان زینا و داوێنپیسییە، ئەگەر مەبەست ڕژاندنی ئاوەکە بێت ئەوا دەکرێ لە حەڵاڵ بڕژێنرێت، ئەگەر لە مەعشووق بێت ئەوا مەبەستی نەفس مانەوەی بەردەوامە لەگەڵ مەعشووق، ئەگەر وەدەستی هێنا ئەوا مرۆڤ لە وەدەستهێنراو بێزار دەبێ، ئەگەر ماوەیەك لێی نزیك بوویەوە پاشان لێی جیا بوویەوە ئەوا خەم و پەژارەی جیابوونەوە زۆر لە چێژی نزیکبوونەوە زیاترە، ئەگەر لە ئەنجامی زیناوە منداڵی بوو ئەوا ئابڕووچوونی بەردەوام و سزای تەواو و سەرشۆڕی لە کن خەڵك و خودای تووش دەبێ... بەڵام نەزان، چێژەکەی لە گەیشتن بەو ئامانجە دەبینێ و لەبیری دەچێت بە هۆی ئەمەوە تووشی چ ناخۆشییەکی دونیا و ئاخیرەت دەبێ.

هەروەها مەی خواردنەوەش هەر لەم بابەتەیە، پیسکردنی دەم و جلك و دوورخستنەوەی عەقڵە و کاریگەرییەکانی لە لای خودا و خەڵك ئاشکرا و دیارە،

سەیر لەو کەسەیە کە چێژی ساتێك هەڵدەبژێرێ کە تووشی سزا و لەدەستدانی پلەوپایەی دەکات! ڕەنگە سەرخۆشییەکەی بەرەو کوشتنی ببات!!

هەموو چێژکراوەکان لەسەر ئەمە قیاس بکە، ئەگەر چێژەکانی بە تەرازووی عەقڵ بکێشرێ ناکاتە دەیەکی دەیەکی سەرەنجامە ناشیرینەکانی لە دونیا و ئاخیرەت، پاشان خودی خۆی شتێکی زۆر نییە... ئیتر چۆن ئاخیرەت بەمە دەفرۆشرێت.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی چاکەی لەگەڵ ئەو کەسانە کردووە کە هەر کاتێ چێژێك هاتبێتە بەرچاویان تەرازووی عەقڵیان داناوە و سەیری بەرهەم و سەرەنجامەکەیان کردووە و تەماشای کاریگەرییەکەیان کردووە ئەگەر وازی لێ بێنن، ئیتر باشتر و شیاوتریان هەڵبژاردووە!

هەر ئەو خودایە دڵانێکی کوژاندۆتەوە کە شێوە و ڕواڵەتی شتەکە دەبینێ و گوناهەکانی بیردەچێتەوە!!

پاشان سەیر ئەوەیە ئێمە دەبینین هەیە گەنجە و لە ژنەکەی دوور دەکەوێتەوە تا لە ڕێگا ڕابکات دەوترێ: کۆششکارە! ئارەزووەکەی تێکدەشکێنێ بۆ داواکردنی ئەوەی بەرزترە کە ستایش و پیاهەڵدانە، چۆن واز لە حەرامێك ناهێنێ بۆ ئەوەی لە دونیا و ئاخیرەت ستایش بکرێ؟!

پاشان تەقدیری وەدەسهێنان و ڕۆیشتنی ئەو چێژانە بکە کە خواستووتە و وا دانێ هەبوون و لەبەرچاو کەوتن و لە ناخۆشییەکانیان ڕزگارت بوو، تۆ لە کوێی غەیری خۆتی؟! کوا ماندووبوونی ئەو زانایەی پەنجا ساڵ زانستی خوێند؟! ماندووبوونەکە ڕۆیشت و زانستەکە مایەوە. کوا چێژی بێکار و دەسبەتاڵ و تەنبەڵ؟! ئیسراحەت و پشوودان ڕۆیشت و پەشیمانی بەدواداهات.

## ٣٢٨- له عەقڵ سەلامەتی و لە ئارەزوو پەشیمانی هەیە

هەر کەسێ بەپێی هەست کاری کرد لەناوچووە و هەر کەسێکیش شوێن عەقڵ کەوت سەلامەت بوو: چونکە هەستی پەتی تەنها ئێستا دەبینێ کە دونیایە.

بەڵام عەقڵ، سەیری مەخلووقات دەکات و دەزانێ خولقێنەرێك بوونی هەیە کە بەخشیویەتی و ڕێی پێداوە و ڕەهای کردووە و یاساغی کردووە و وتوویەتی من لێتان دەپرسمەوە و تاقیتان دەکەمەوە بۆ ئەوەی بەڵگەی بوونم لە لاتان دەرکەوێت بە وازهێنان لەوەی حەزی لێ دەکەن وەکوو گوێڕایەڵییەك بۆم، وە من خانەیەکی تری غەیری ئەمەم بۆ دروست کردوون بۆ پاداشت دانەوەی ئەو کەسەی گوێڕایەڵی دەکات و سزادانی ئەو کەسەشی سەرپێچی دەکات.

پاشان ئەگەر وازهێنرا لە هەست و ئەوەی حەزی لێ دەکات لەگەڵ مەبەستەکانی، شتەکە نزیك دەبێتەوە! زینا دەکات و قامچیکاری دەکرێت، مەی دەخواتەوە و سزا دەدرێ، دزی دەکات و دەستی دەبڕدرێ، هەڵەیەك دەکات و لەنێو خەڵکدا ئابڕووی دەچێ، پشت لە زانست دەکات و ڕوو لە تەنبەڵی و بێکاری دەکات ئیتر لە کاتی هاتنەئارای نەزانیدا پەشیمان دەبێتەوە...

پاشان ئێمە زۆر کەس دەبینین لەوانەی کاریان بە گوێرەی عەقڵ کردووە دونیا و ئاخیرەتی سەلامەت بووە و، لەناو خەڵکدا بە گەورە ناسراوە و ژیانی لەنێو چێژەکانیدا بەزۆری باشتر بووە لە ژیانی ئەو کەسەی هاوئاوازی ئارەزووەکانی بووە.

با تێگەیشتوو و خاوەن فام پەند وەربگرێت لەوەی وتم و کار بەپێی بەڵگە بکات و سەلامەت دەبێت.

## ٣٢٩- ئارەزووەكانی دونیا لەناوبەرن

سەیر لەو كەسەی حەز و ئارەزووەكانی دونیا بـاو دەدات و هەڵدەبـژێرێت! ئایـا بـە ئاوەز لێیان ورد نابێتەوە بەر لەوەی بچێتە سەر ڕاوبۆچوونی شەرع؟!

گـــەورەترین چـــێژەكانی هەســـت پەڕینـــە، كـــەماڵیی ژنـــی جـــوان لـــە كـــاتی پێگەیشتنیەوەیەتی تا تەمەنی سی ساڵی، گە گەیشتە ئەم تەمەنە ڕۆژگار كاری تـێ دەكات، ڕەنگە هەندێ لە مووەكانی سەری سپی ببێت و مـرۆڤ لێـی دووركەوێتـەوە، ڕەنگـــە بـــەر لـــەوە بێـــزاری ڕووبـــدات، زۆر هـــاوەڵێتی و مانـــەوەش بەیەكـــەوە عەیبوعارەكان ئاشكرا دەكات...

بە كاریگەرتر لەم ئایەتە عەیب لە ژنانی دونیا نەگیراوە: ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ (البقرة: ٢٥) واتە: هاوسەرانی پاك و خاوێن لە بەهەشتدا بۆ پیاوانی ئیماندار هەن.

ئەگـەر مـرۆڤ بـیر لـە جەسـتەیەكی پـڕ لـە پیسـی بكاتـەوە هـەرگیز حـەزی بـە لەباوەشگرتنی نەدەكرد، بەڵام شەهوەت خودی بیر دادەپۆشێ.

عاقڵ كەسێكە دین و پیاوەتی خۆی بە وازهێنان لە حەرام بپارێزێ و هێزی خۆی لـە حەڵاڵ بپارێزێ و لە خواستنی چاكە و فەزیلەتی زانست یان كردەوە خەرجی بكـات،

هەوڵ نەدات تەمەنی بەفیڕۆ بدات و دڵی پەرتەوازە بکات لە شتێك کە سەرەنجامی باش نییە.

زۆربەی ئەوانەی بینیمان لە گەورەکان ئارەزووی پەڕین بەسەریاندا زاڵ بوو و تەمەنیان داڕووخا و بەخێرایی کۆچیان کرد.

کەسانی ژیریشمان بینی جڵەوی نەفسی خۆیان لەم بەڵا و ناخۆشییە گرت و تەنها لە کاتی پێویست بەکاریان هێنا، ئیتر ڕەشیی قژ و هێزیان مایەوە و لە ژیاندا چێژیان لێی وەرگرت و ئاکار و ناوودەنگی باشیان وەدەست هێنا و نەفسەکانیان زانیان هێزی ئیرادە و بڕیاریان هەیە بۆیە داوای ئەو شتانەیان لێیان نەکرد کە ئازاربەخش بوون.

## ٣٣٠- بینینی پێغەمبەر ﷺ لە خەودا

بینینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەو فەرموودەیەی لەم بارەوە هاتووە لای هەندێ کەس ئاڵۆز و ناڕوونە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((من رآني في المنام فقد رآني)) رواه البخاري و مسلم.. واتە: هەر کەسێك لە خەودا منی بینی ئەوا منی دیتووە.))..

ڕووکەشی فەرموودەکە دەڵێ بە ڕاستی ئەوی دیتووە! خەڵك هەیە بە پیر و گەنج و نەخۆش و لەشساغ دەیبینێ!

وەڵام: هەر کەسێك پێی وایە کە ئەو جەستەیەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە لە شاری مەدینەدا نێژراوە لە گۆڕ هاتووەتەدەر و لەو شوێنە ئامادەبووە کە تێیدا بینیویەتی ئەمە نەزانییەکە وێنەی نییە، لە یەك کاتدا هەزار کەس لە هەزار شوێن بە چەندان شێوەی جیاواز دەیبینن، ئەمە لە تاکە کەسێکدا چۆن تەسەوڕ دەکرێ؟!

ئەوەی دەبینرێ نموونەیەتی نەك کەسی خۆی. واتای فەرموودەکە کە دەفەرموێت: ((هەر کەسێك منی لە خەو بینی...ئەوا منی دیتووە)) ئەوەیە: نموونەی منی بینیوە کە ڕاستی پێ دەناسێنێ و سوودی خوازراوی پێ دێتەدی.

**ئەگەر وترا: ئەی لەبارەی دیتنی خوای گەورەوە چی دەڵێن؟!**

دەڵێین: نموونەیەك دەبینیٚ نەك هاوشێوە، نموونە پێویستی بە یەکسانی و هاوشێوەیی نییە هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا﴾ (الرعد: ١٧) واتە: هەر ئەو زاتە لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، بەئەندازەی ئەو دۆڵ و نشێوە بەهۆی ئەو بارانە پڕ دەبن..

ئەمەی وەکوو نموونەیەك بۆ قورئان و سوود لیٚ وەرگرتنی خەڵك هێنایەوە.

ئەمە ڕوونی دەکاتەوە ئەوەی خودا بینیوە، لەسەر شێوەیەکی تایبەت دەیبینیٚ، خوای گەورە پاك و بێگەرد و تاك و تەنیایە و هاوشێوەی نییە، ئەوەی گوتمان ڕوون بوویەوە.

## ٣٣١- گرینگترین زانست

ئەم بەشە زۆر سوودبەخشە:

بزانە ئەگەر تەمەن درێژ بێت و بەش بکات ئەوا ڕێگری ناکەم لە ڕۆچوون لە هەموو زانستێك تا کۆتاییەکەی، بەڵام تەمەن کورتە و زانست زۆر:

پێویستە مرۆڤ ئەگەر قورئانی لەبەرکرد لە (القراءات) پشت بە (العشر) ببەستێ.

لە فەرموودەش: پشت بە (الصحاح ) و (السنن) و (المسانید) ببەستێ، زانستەکانی فەرموودە زیاد لە حەد درێژ کراونەتەوە، دەقەکان یەکن و ڕێگاکانی گێڕانەوە جیاوازن.

(ڕێگاکانی گێڕانەوە ئەو کەسانەن کە فەرموودەکەیان لە پێغەمبەر و ئەوانی دواتر گێڕاوەتەوە).

زانستی فەرموودە (فەرموودەزانی) هەندێکی پەیوەستە بە هەندێکیەوە و زانستێکی خۆش و حەزلێکراوە، زانایان ناوی زانستی تەنبەڵانیان لێ ناوە، چونکە بە نووسینەوە و بیستنی سەرقاڵ دەبن و خۆ بە لەبەرکردنی ماندوو ناکەن و زانستی گرینگتریان لە دەست دەچێ کە فیقهە.

لە کۆندا فەرموودەناسەکان زاناکان بوون، پاشان زاناکان وایان لێ هات فەرموودە نەزانن و فەرموودەناسانیش فیقهیان نەدەزانی!

هەر کەسێك خاوەن هیممەت بێت و ئامۆژگاریی نەفسی خۆی کرد و بۆی دڵسۆز بوو ئەوا لە هەموو زانستێکدا بە گرینگەوە مەشغوول دەبێ و هەموو کار و سەرقاڵیی دەبێتە فیقه کە گەورەترین و گرینگترین زانستە.

ئەبوو زەرعە وتوویەتی: ئەبوو سەور بۆی نووسیم: ئەم فەرموودەیە هەشتا و نۆ کەس لە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) گێڕاوەتەوە ئەوانەی ڕاستن ڕێگاگەلێکی کەمە.

مەشغوولبوون بە شتی ناڕاست ڕێ دەگرێ لە سەرقاڵبوون بە شتی گرینگتر.

ئەگەر تەمەن درێژ بێت و بەش بکات زانینی هەموو ڕێگاکانی سەرجەم فەرموودەکان ئەوپەڕی باشییە بەڵام تەمەن کورتە.

کاتێ یەکێکی وەکوو یەحیای کوڕی مەعین بە ڕێگاکان مەشغوول بوو شتێکی زۆری لە فیقه لەدەست چوو تەنانەت کاتێ لەبارەی ژنی حەیزدارەوە لێیان پرسی: جائیزە مردوو بشوات؟ نەیزانی تا ئەبوو سەور هات و گوتی: جائیزە، چونکە عائیشە خودا لێی ڕازی بێت وتوویەتی: من لە حەیزدا بووم و سەری پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) دادێنا (شانە دەکرد). یەحیا لەو زیاتر شارەزا و ئاگاداری فەرموودە بوو بەڵام خۆی بە تێگەیشتنیەوە سەرقاڵ نەکردبوو.

ئـەز نـەهی دەكـەم لـەوەی ئـەهلی فـەرمووده (فەرموودەناسـان) زۆری ڕێگاكـان مەشغوولیان بكات.

ناشیرینترین شت ئەوەیە، ڕووداوێك ڕوودات پرسیار لە شێخێك بكرێت كە شەست ساڵە فەرموودە دەنووسیٚ كەچی حوكمی خودا لەبارەیەوە نەزانیٚ!

هەروەها ڕێگری دەكەم لەوانەی مەشغوولن بە زوهد و دابڕان لە خەڵك پشت بكەنە زانست، بەڵكوو پێویستە شتێك لە زانست بزانیٚ بۆ ئەوەی ئەگەر خلیسكا بزانێت چۆن خۆی ڕزگار دەكات.

## ٣٣٢- مافی جەستە

ناسینی خودا تەنها بۆ کەسێك دێتەدی کە عەقڵی کامڵ و تێروتەواو و میزاجی دروست و ساغ بێت، بەرزبوونەوە بۆ خۆشەویستیی خوداش هەر بەوە دەبێت.

خەڵکێك عەقڵیان کەم و میزاجیان بەد و گەند بوو بۆیە تەما و ئاواتیان بەد و کەم بوو، ئیتر خەیاڵاتی خراپ هاتە بەر چاو و ئەندێشەیان، بانگەشەی ناسین و خۆشەویستیی خودای هەقیان کرد و هیچ زانستێکیشیان نەبوو کە لەو بانگەشەیە رێگریان لێ بکات، ئیتر لەناوچوون.

با بزانرێت لە هەندێ خواردندا شتانێك هەن کە عەقڵ بەد و گەند دەکەن و هەیانە رەشایی زیاد دەکات و دەبێتە هۆی مالیخولیا، دەبینی تووشبوو حەز بە تەنیایی دەکات و لە خەڵك رادەکات، رەنگە خواردنیش کەم بخوات و نەخۆشییەکەی بەهێز بێت، هەندێ خەیاڵات دەکات پێی وایە راستن، هەیانە دەڵێ: فریشتەکانم بینی! هەیانە دۆخەکە بەرەو بانگەشەی ئەوینی خودا و شێت و شەیدابوونی دەبات، ئەوەش لەسەر بنچینەیەکی باوەڕپێکراو نییە.

بەڵام ژیری زانا لە رێگادا لەنێوان دوو هاوەڵدا دەڕوات: زانست و هۆش. ئەگەر لە خواردندا کەمخۆری کرد بە هۆش دەیکات و رادەی کەمخۆرییەکەش: وازهێنانە لە

زێده خواردن و ترسان له چڵێسییه به هۆی گومان یان شەهوەت لـه ترسـی ئـەوەی ڕابێـت.

سەبارەت به زێده کەمخۆریش لەگەڵ هەبوونی توانا ئەوا نه عەقڵ پەسـندی دەکـات و نـه شـەرع، مەگـەر لەبـەر هەژارییـەکی گشـتگیر بێـت ئـەو کـات لەبـەر زەرورەت کەمخۆری بکات.

هەرکەسێك سەرنجی حاڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هـاوەڵانی بـدات دەبینیٚ به ئەندازه وەریانـدەگرت و ئـەو شـتانەی بـۆ نـەفس بـاش بـوون وازیـان لیٚ نەدەهێنان.

باشـترین و دروسـتترین شـت ئەوەیـه کـه پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: ((سێیەك خواردن، سێیەك خواردنەوه، سێیەك هەناسه)).

که عەلی کوڕی ئەبوو تالیب خودا لێی ڕازی بێـت نەخۆش بـوو پێـی فـەرموو: ((ئـەم خواردنه بخۆ، لەمه بۆت باشتره.))

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پرسوڕای به پزیشکان دەکرد و کەڵەشـاخی دەکـرد و هانی بەکارهێنانی داودەرمـانی دەدا و دەیفـەرموو: ((مـا أنـزل الله داء إلا وأنـزل لـه شفاء، فتداووا)) رواه البخاري.. واته: خودا هەر نەخۆشییەکی ناردبێـت ئـیللا شـیفای بۆ داناوه، بۆیه دەرمانکاری بکەن)).

دواتـر خـەڵكێك هـاتن لـەبارەی پێكهاتـەی جەسـتەوە هیچیان نـەدەزانی، هـەبوو نیشـتەجێی چیاكان بـوو تـەنها بـەڕووی دەخـوارد و تووشـی قۆڵـۆن بـوون، هـەبوو خواردنی كەم كردەوە تا ئـەوەی هێزی تێدا نـەما، هـەبوو تـەنها ڕووەكـی بیابـانی دەخوارد، هەبوو تەنها پاقلە و جۆی دەخوارد...

ئـەم ڕەفتارانـە بـووە هـۆی گرفتـاربوونی جەسـتە بـە چـەندان نەخۆشـی و بـەرەو خراپبوونی ئاوەز بەرز بۆوە.

هەموو ئەمانە بە هۆی كەم زانستیانەوە ڕوویدا، چونكە ئەگـەر زانیارییـان هەبووایـە تێ دەگەیشتن حیكمەت نەهی لەم شتانە دەكات، جەستە لەسەر چـەند تێكەڵەیـەك دروست كراوە، ئەگەر هاوسەنگ بوون سەلامەت دەبێ و ئەگەریش هەنـدێكیان زیـاد بوون نەخۆشی پەیدا دەبێ.

زۆربەی ئەمانە نەخۆش كەوتن و مـردن زوو یەخـەی گـرتن، هـەیانبوو هەسـتەكان و هۆشـی لەدەسـت دا، هـەبوو تارماریيگـەلێكی بـۆ دەركـەوت و بانگەشـەی بینینـی فریشتەی كرد...هیتریش.

بەڵام ئەهلی زانست و عەقڵ ڕاكردنیان لە خەڵك لە ترسی گونـاه و دیتنـی خراپەیـە، هەیانە زانیارییەكەی مەشغوولی ناسین و خۆشەویستیی خودای كردووە و لە دیـداری خەڵك بێئاگای كردووە.

ئەمە تەنیایی و خەڵوەتی خاوێن و سازگارە چونکە لە سەرچاوەی زانست و ئاوەزەوە دێت و جەستە دەپارێزێت چونکە جەستە وەکوو باربەر وایە و دەتگەیەنێ بە شوێنی مەبەست.

نابێ لە خواردنەکان کەمتەرخەمی و شلپەوی بکرێت بەتایبەتی کەسێك لە وشکەژیانی ڕانەهاتبێ، نابێ جەستەیەك جلکی خوری لەبەر بکات ئەگەر پێی ڕانەهاتبێ.

با سەیری ڕێگای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی بکات، ئەوان پێشەنگن و ئاوڕ بە لای ڕێچکە و وردەڕێیان نەداتەوە بگوترێ: فلان زاهید قوڕی خوارد! فلان بە پێخواسی دەڕوات! فیسار مانگێك هیچی نەخوارد!

بەڕاستی ئەمانە لەسەر ڕاستەڕێ نین، چونکە ڕاستەڕێ شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان و ڕەفتار و کار و کردەوەکانیانە.

ئەمە و سوێند بە خوا، تێیاندا بوو بە شیرئاوێك قایل بوو و چەندان ڕۆژ ئارامی لە خواردن دەگرت بەڵام یان لەبەر زەرورەت یان لەبەرئەوەی لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو، هەروەك دەشتەکی ڕادێت لەسەر تەنها خواردنەوەی شیر و ئەوەش ئازاری نادات، لە فەرموودەدا هاتووە: ((هەر جەستەیەك لەسەر ئەوە ڕابێنن کە دەقی پێوە گرتووە)) (لە ڕاستیدا ئەمە فەرموودە نییە بەڵکوو قسەی (حارس کوڕی کیلدە)ی پزیشکی عەرەبە).

زاهید هەبوو هەموو ماڵەکەی خۆی دەبەخشی و پێی وابوو ئەوە زوهدە، دیارە پێویستییەکان تەواو نابن بۆیە کاتێ ئاتاج دەبوو دەستی لە خەڵك پان دەکردەوە و ناچار دەبوو پارە لە کەسێك وەربگرێت کە دەیزانی ستەمکارە و حەیاشی دەچوو!

هاوەڵان بازرگانییان دەکرد و پارە وماڵیان هەڵدەگرت کەچی زاهیدە نەزانەکان پێیان وایە ماڵ کۆکردنەوە پێچەوانەی زوهدە ! !

پوختەی ئەم بەشە ئەوەیە بڵێم: پێویستە کەسێك کە تێگەیشتنی پێ دراوە هەوڵ بۆ چاکەی جەستەی بدات و شتێکی بەسەردا نەسەپێنێ کە ئازاری بدات و خواردنی ناسازی پێ نەدات و ماڵ و پارەی بەفیڕۆ نەدات و با هەوڵی وەبەرهێنانی بدات نەوەك ئاتاج بێت، چونکە زاهید تەنها لە پێناو دونیا تووشی دووڕوویی دەبێت، با سەیری ژیانی پیاوە کامڵەکانی پێشینان بکات و بە زانستەوە مەشغوول بێت چونکە زانست ڕێبەرە، ئەو کات زانست و شارەزایی وای لێ دەکات لەگەڵ خودای خۆی بکەوێتە خەڵوەت و بە ئەوینی ئەمەوە سەرقاڵ بێت، ئەو کات ئەوەی لێی دەردەکەوێت دەبێتە بەرهەمێکی پێگەیشتوو نەك کاڵ.

## ٢٣٣- سياسەتی نەفس

شتێکم نەدیوە جوانتر و سەیرتر لە یاریکردنی دونیا بە عەقڵەکان!

بیستمان و بینیمان کۆمەڵێك لە کەسانی زیرەك و ژیر و عەقڵ کامڵ دونیا وەها گەمەی پێ کردن تا وەکوو شێتیان لێ هات، دەسەلاَتیان گرتە دەست و بەرەو کوشتن و لێدان و حەپس و جوێندان و نەمانی دین و ستەمکردن ڕۆیشتن، هەموو ئەمانە لە پێناو دونیایەك کە خێرا دەڕوات و لە ماوەی مانەوەیدا پڕە لە خەم و ناخۆشی.

ئەی ئاوەز پێدراو! مافی عەقڵ کەم مەکەوە و ڕووناکییەکەی مەکوژێنەوە و گوێ بگرە لەوەی ئاماژەی پێ دەکەین و ئاوڕ مەدەوە بە لای گریانی منداڵی سروشت لەبەر ئەوەی مەبەستەکەی لەدەست چووە، چونکە ئەگەر بەزەییت بە گریانەکەیدا هاتەوە ناتوانیت لەو خووەی دابڕیت و ناتوانیت پەروەردەی بکەیت ئیتر نەزان و هەژار پێ دەگات، (مەحموود ئەلوەڕاق)ی شاعیر وتوویەتی:

لا تَسهُ عَن أَدَبِ الصَغيرِ وَإِن بَكى أَلَمَ التَعَب

وَدَعِ الكَبيرَ لِشَأنِهِ كَبِرَ الكَبيرُ عَنِ الأَدَب

واتە: لە پەروەردەی منداڵ بێئاگا مەبە ئەگەر لەبەر ئێش و ئازاری ماندووبوونیش گریا، واز لە کەسی گەورەش بێنە تازە گەورە لەوە دەرچووە پەروەردە وەربگرێت.

بزانە کە زەمانی تاقیکردنەوە میوانێکە و خواردنەکەی ئارامگرتنە، هەروەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتوویەتی: بەڵکوو ئەمە خواردنێکی بێ خواردن و جلێکی بێ جلکە، ڕۆژانێکی کەمە بۆیە سەیری چێژی خۆشگوزەرانان مەکە و سەرنج بدە سەرەنجامیان و دڵت بە سەختی گوزەران تەنگ نەبێ و وشتر بە گۆرانی و لاوك مەشغوولکە دەڕوات:

طاولت بها الليل مالت النجم أم جنحا

وماطل النوم ضن الجفن أم سمحا

فإن تشكت فعللها المجرة من

ضوء الصباح وعدها بالرواح ضحى

ئەگەر نەفست لە شەودا لە خواپەرستی بێزار بوو و خەوی هات بە ڕووناکیی کاکێشان سەرقاڵیکە و وای تێ بگەیەنە کە ئەوە ڕووناکیی بەیانییە و وا خۆر هەڵدێت تاوەکوو چالاك بێتەوە، کە سپێدەش هات بەڵێنی چێشتەنگاوی پێ بدە..

دیارییەك پێشکەشی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرا و ئەویش ڕەتی کردەوە، پاشان دوای ساڵێك بە منداڵەکانی وت: ئەگەر قەبووڵمان کردبایە ئێستا ڕۆیشتبوو.

بیشری حافی به لای بیرێکدا تێ پەڕی، هاوڕێکەی گوتی: تینوومە. وتی: لە بیرەکەی تر ئاو بخۆوە! کە گەیشتنە وی دیسان پێی وت: ئەوی تر! پاشان گوتی: دونیا ئەوها دەقەتێنرێت.

چوونە ماڵی بیشرەوە، لە ماڵەکەیدا تەنانەت حەسیرێکیش نەبوو، پێی وترا: ئایا بەوە ئازار ناخۆی؟ گوتی: ئەمە شتێکە و دەڕوات.

داوودی تائی خانوویەکی هەبوو تێدا دەژیا، بنمیچێکی کەوت، چووە بنمیچێکی تر تا لە ژێرزەمیندا مرد.

ئەمانە ئەو کەسانە بوون کە سەیری سەرەنجامی شتەکانیان کردبوو.

دوای ئەمە، داوای ئەم ئاستەت لێ ناکەم، بەڵکوو پێت دەڵێم: ئەگەر شتێکی ڕێپێدراوت دەست کەوت، هیچ منەت و ئازارێکی تێدا نەبوو، بە سواڵ دەستت نەکەوتبوو، وە لە دەستی ستەمکارێك کە دەزانی ماڵەکەی حەرامە یان گومانی تێدایە دەستت نەکەوتبوو، بەپێی پێویستیت ڕێ بە نەفست بدە سوود لە ڕێپێدراوەکان وەربگرێت و لە خەرجیدا بەئەندازە بە و دەسبڵاو مەبە، چونکە حەڵاڵ بەرگەی زێدەخەرجی و دەسبڵاوی ناگرێت، هەر کاتێ دەسبڵاویت کرد پێویستت بەوە دەبێ دەست لە خەڵك پان بکەیتەوە و خڵتە و پڵتە بخۆیت.

ئەگەر تووشی گرفتێکیش بوویت ئەوا ئارام بگرە، ئەگەر ئارامگرتنت لاواز بوو ئەوا داوا لە خودای گەورە بکە چونکە ئەو دەرگاکان دەکاتەوە و بەخشندەیە و کلیلەکانی غەیب لای ئەوە، ئامان نەکەیت بە مەرایی و ماستاوکردن بۆ خەڵك

دینەکەت سووك بکەیت یان بە نزیکبوونەوەت لە بەرپرسان و داواکردنی ماڵ و پارەیان، ڕێگای پێشینانت لەبیربێت.

(ئیبن سەمعوون) جلکێکی هەبوو کە بۆ خەڵك دادەنیشت دەیپۆشی پاشان بۆ مەجلیسێکی تر هەڵی دەگرت، لە باوکییەوە بۆی بەجێمابوو و ماوەی چل ساڵ مایەوە.

(مەیموونەی کچی شاقوولە) ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد و کراسێکی هەبوو چل ساڵ مایەوە.

هەر کەسێ ڕوانینی پاك و وتەی جوان بوو ئامۆژگارییەکەی سوودی دەبێ، هەر کەسێکیش لێڵ و وێڵی کرد لێی تێك دەدرێ.

حاڵەتی باڵا لەمە ئەوەیە: دڵ ڕوو بکاتە خوای گەورە و پشتی پێ ببەستێ و لێی بڕوانێ و دڵ پشت لە خەڵك بکات، ئەگەر ئاتاج بوویت لە خودا داوا بکە و ئەگەر لاواز بوویت لەو بپاڕێوە و ئومێدت هەر بەو بێت.

هەر کاتێ دڵت بە هۆکارەکانەوە بەست ئەوا لەو دادەبڕێیت، هەر کاتێکیش ناخت ڕاست و سەقامگیر بوو کاروبارەکانت ڕاستەڕێ و سەقامگیر دەبن.

## ٣٣٤- چاودێریی نەفس

دیتم نەفسم هۆگری کەسانێکی تێکەڵ و پێکەڵ و بێسەروبەر بووە کە ناویان لێ دەنێین هاوڕێ، بە تاقیکردنەوە لێیانم کۆڵییەوە دیتم زۆربەیان حەسوودی بە نیعمەتەکان دەبەن و دوژمنن، هەڵەیەك ناپۆشن و مافی هاونشین نازانن و بە ماڵ و داراییان هاوکاریی هاوڕێیەك ناکەن.

سەرنجم دایە بابەتەکە دیتم خوای گەورە لە بەرانبەر دڵی ئیماندار غیرەی هەیە لەوەی شتێکی بۆ دابنێ هۆگری ببێت، بۆیە دونیا و ئەهلی دونیای لێ تەنگ دەکات تاوەکوو تەنها هۆگری ئەو بێت و دڵی پێی بکرێتەوە.

پێویستە هەموو خەڵك بە ناسیاو بزانیت کە هیچ هاوڕێیەکیان تێدا نییە بەڵکوو هەموویان بە دوژمن حیساب بکەیت و نهێنیی خۆت بۆ هیچ یەکێکیان ئاشکرا نەکەیت و هیچ کەسێکیان بە شیاوی کاتی تەنگانە دامەنێ، نە کوڕ و نە برا و نە هاوڕێ، بەڵکوو بە ڕووکەش مامەڵەیان بکە و تێکەڵیان مەبە تەنها لە حاڵەتی زەرورەت نەبێ ئەویش بەپارێزەوە، پاشان لێیان دوورکەوە و سەرقاڵی کاروباری خۆت بە و پشت بە خودا ببەستە، تەنها هەر ئەو خێر دەهێنێ و خراپە دوور دەخاتەوە، با ئەو ببێتە هاونشین و هۆگر و جێگەی پشتبەستن و سکالات، ئەگەر چاوت کز بوو هاواری ئەو بکە، ئەگەر یەقینت کەم بوو داوای هێز لەو بکە، ئامان نەکەی مەیل بۆ غەیری وی بکەیت چونکە ئەو غیرەی هەیە(غیور)ە، ئەگەر سکالا لە

قەدەرەکانی بکەیت ڕەنگە تووڕە بێت و مۆڵەتت نەدات تا تەوبە و داوای لێبووردن بکەیت.

خوای گەورە سروشی بۆ یوسف سەلامی خوای لێ بێت کرد: کێ تۆی لە بیر ڕزگار کرد؟ کێ کردی؟ کێ کردی؟ گوتی: تۆ. فەرمووی: بۆچی باسی غەیری منت کرد؟ دەبێ ماوەی زیندانکردنت درێژ بکەمەوە! یان شتێکی وای فەرموو... ئەمەش تەنانەت لەبەرئەوەی یوسف هۆکارێکی ڕێپێدراویشی بەکارهێنا: ﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ﴾ (یوسف: ٤٢) واتە: باسم بکە لای پاشات (کە بەبێ تاوان من بەند کراوم).. ﴿وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ﴾ (التوبة: ٢٥) واتە: لە ڕۆژی حونەینیش کاتێك کە زۆریی ژمارەی خۆتان سەرسامی کردبوون.

تەنها ئەو کەسە ژیانی ناسیوە کە ئەوی ناسیوە و لەگەڵیدا دەژی و لە جووڵە و وتەکانیدا بەئەدەبەوە دەجووڵێتەوە وەك ئەوەی ببینێ و دەبێتە پاسەوانی چاوەکانی لە سەیرکردنی شتی نەشیاو و زمانی دەپارێزێ لە وشەیەکی ناشیرین، لەسەر دەرگای دڵیشی پاسەوانێك دادەنێ بۆ ڕێگرتن لە چوونی غەوارە و بیانی بۆ ناو ماڵی، بە هۆی مەشغوولبوونی بە خوداوە لەناو خەڵك هەست بە تەنیایی دەکات، ئەمە لەسەر ڕەفتاری ڕۆحانییەکان دەبێ.

بەڵام ئەوەی تێکەڵ و پێکەڵ دەکات خەم و پەژارە بەسەریدا زاڵە. خاوەن هەق تەنها بەرزترین دەخوازێت..شاعیر (قەیس کوڕی مەلووح ناسراو بە مەجنوونی لەیلا) وتوویە:

ألا لا أحِبُّ السَيرَ إلاّ مُصعِّداً وَلا البَرْقَ إلاّ أنْ يَكونَ يَمانِيا

خۆشیم لە ڕۆیشتن نایەت ئیللا بەرەو هەوراز و بڵندبوونەوە نەبێ.

## ٣٣٥- زانستی ڕاستەقینە

دیتم زۆرێك لە زانایان بە شێوە و ڕووکەشی زانستەوە مەشغوولن بێ تێگەیشتنی حەقیقەت و مەبەستی زانست.

قورئانخوێن بە گێڕانەوەکان مژوولە، سەری ناوەتە سەر ڕیزپەڕەکان (الشواذ)، پێی وایە مەبەست خودی خوێندنەوەیە و سەرنجی مەزنیی قسەبێژ و نەهی و بەڵێنی قورئان نادات، ڕەنگە وا گومان ببات کە لەبەرکردنی قورئان بەرگری لێ دەکات و دۆزەخی لێ دوور دەخاتەوە، بۆیە دەیبینیت لە گوناهەکان شلڕەوی دەکات، ئەگەر تێگەیشتبایە دەیزانی کە بەڵگە لە دژی وی بەهێزترە وەك لە کەسێك کە نەیخوێندۆتەوە !

فەرموودەناسیش ڕێگاکانی گێڕانەوەی فەرموودە (کە پێی دەوترێ سەنەد و ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە فەرموودەکەیان لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە) کۆدەکاتەوە و سەنەدەکان لەبەر دەکات و لە مەبەستی فەرموودەکە ورد نابێتەوە و پێی وایە فەرموودەکانی بۆ خەڵك لەبەرکردووە و پاراستووە، بەوەش ئومێدی سەلامەتی دەخوازێ و ڕەنگە شلڕەوی لە گوناهان بکات بەو گومانەی ئەوەی لە شەریعەتدا کردوویەتی بەرگری لێ دەکات.

فەقیهیش پێی وایە بە هۆی زانینی هونەری مشتومڕەوە کە زمانی دەمەتەقێی بەهێز دەکات یان ئەو مەسەلانەی تێیدا مەزهەبەکەی ناسیوە، بای ئەوەندە زانست و زانیاری دەست کەوتووە کە فەتوا بۆ خەڵك بدات تا ڕێز و پایەی بەرزبێتەوە و گوناهی بسڕێتەوە، ڕەنگە پەلاماری گوناهەکان بدات و پێی وابێت ئەوە بەرگری لێ دەکات! لەوانەیە قورئانی لەبەر نەکردبێت و فەرموودەی نەزانیبێ، ئەم دووانە بە توندی و بەنەرمی جڵەوگیری لە بەدکاری و خراپە دەکەن، لەپاڵ نەزانینی ئەم دووانە حەزی سەرۆکایەتی و باودانی زاڵبوون لە مشتومڕ و دەمەتەقێ زیاد دەبێ، ئیتر ڕەقێتیی دڵی زیاد دەبێ!

زۆربەی خەڵك لەسەر ئەمەیە، شێوەی زانست لە کنیان وەکوو پیشە و پیشەسازی وایە، خۆبەزلزانی و گەمژەییان پێ دەدات.

یەکێك دەگێڕێتەوە و دەڵێ: شێخێك تەمەنی خۆی لە زانستگەلێکی زۆر بەسەربردووە، لە ئاخر و ئۆخری تەمەنیدا بە گوناهێك کە لەسەری بەردەوام بووە و بە هۆیەوە دژایەتیی خوای کردووە تووشی فیتنە بووە، حاڵ و دۆخیشی وای دەگەیاند کە زانستەکەم ئەو خراپەیەم لێ دوور دەخاتەوە کە تێیدام و هیچ شوێنەوارێکی نامێنێت! وەك ئەوەی بڵێیت دڵنیا بێت و بڕیاری کۆتایی دابێت لەوەی ڕزگاربوونی مسۆگەرە، بۆیە هیچ شوێنەوارێکی ترس یان پەشیمانبوونەوە لە گوناهی پێوە دیار نەبوو!!

ئیتر لە کۆتاییی تەمەنیدا حاڵوباری گۆڕا و هەژاری بەربینگی گرت، تووشی ناخۆشی و دەردەسەری بوو و وازی لە حاڵی ناشیرینی نەدەهێنا تا ئەوەی ڕۆژێك

بـه هـۆی سـواڵ و دەرۆزەکردنـەوە پـارە و سـامانێکی زۆری بـۆ کۆکرایـەوە، ئـیتر شەرمی لەوە کرد و گوتی: ئەی پەروەرێن! تا ئەم ڕادەیە؟!

چیرۆکبێژ دەڵـێ: سـەیرم لـە بێئاگاییەکـەی هـات! چـۆن خـوای لـەبیرکرد و کەچـی دەیەوێ کاروباری بۆ ڕێکوپێك بکات و بیپارێزێ و ڕۆزی فراوان بکات؟! دەڵێی ئـەم ئایەتەی خودای نەبیسـتووە: ﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا ١٦﴾ (الجـن: ١٦) واتە: جا ئەگەر ئەو خەڵکە ڕێگەی ئیسلامەتی و دینداری بگرنەبەر ئێمـە بـارانی پڕ بەرەکەتیان بەسەردا دەبارێنین.

دیارە نەیزانیوە کە گونـاه و تـاوان دەرگاکـانی ڕۆزی دادەخـەن و ئـەوەی فـەرمانی خـودا پشـتگوێ بخـات خـوداش ئـەو پشـتگوێ دەخـات؟! هـیچ زانسـتێکم نـەدیوە بێسـوود بووبێـت وەکـوو زانسـتی ئەمـە! چـونکە زانـا ئەگـەر خلیسـکا لـە ناخـەوە دەشکێت و پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام ئەمە سوور بوو و گوناهەکەی ئازاری نەدەدا، وەك ئـەوەی ڕەفتارەکـانی جـائیز و ڕەوا بـن، یـان وەك ئـەوەی بـە حـەڵاڵکردن و حەرامکردن لە دیـن مـافی ڕەفتـارکردنی هـەبێ، ئـیتر زوو نـەخۆش کـەوت و لەسـەر ناشیرینترین حاڵ مرد!!

بگێڕەوە دەڵێ: شێخێکی تـرم دیـت، شـێوەکانی زانسـتی بەدەسـت هێنـابوو بـەڵام سوودی پێ نەگەیاندبوو، هەر گوناهێك توانی بیکات خۆی لێ نەپاراست و هەر شتێك لە قەدەر بەدڵی نەبوو بە ڕەخنەگرتن لە قەدەرساز و گازانـدەوە بەرهەڵسـتی کـرد، بە ناخۆشترین ژیان و بە ناشیرنترین بیروباوەڕ ژیا تا مرد.

ئەمانە لە واتای زانست تیٚ نەگەیشتوون، زانست تەنیٚ وێنە و شێوەی وشە و واژەکان نییە، بەڵکوو مەبەست و نیاز لێی تێگەیشتنی ناوەڕۆك و ئەو شتەیە لێی دەویستریٚ، ئەوەش دەبێتە هۆی ترس لە خودا و بەو زانستە نیعمەتی خودا بەسەر مرۆڤ پیشان دەدات و هێزی بەڵگە بەسەر فێرخوازەوە دەردەکەوێت.

لە خودا دەپاڕێینەوە بێداری و ئاگاییەکی وامان بداتیٚ کە مەبەستمان تیٚ بگەیەنیٚ و پەرستراومان پیٚ بناسێنیٚ.

پەنا بە خوا دەگرین لە ڕێگای ئەو هەرچی و پەرچییانەی خۆیان بە زانا ناودەبەن، ئەو زانستەی پێیانە جڵەویان ناگریٚ و دەزانن و کاری پیٚ ناکەن و بە شتێکی نەکردنی خۆیان لە خەڵك بە گەورەتر دەزانن و کاڵای دونیا وەردەگرن کە نەهیشیان لیٚ کراوە لەوەی وەریدەگرن، تەبیاتیان بەسەریاندا زاڵ بووە و ئەو زانستەی دەیخوێنن و دەیڵێنەوە قاڵ و ڕامی نەکردوون، حاڵیان لەو ڕەشۆکییانە خراپتر و نزمترە کە نازانن: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ۝٧﴾ (الروم: ٧) واتە: ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دنیا بەدی دەکەن، لە بەرامبەر قیامەتیشەوە بێئاگان.

## ٣٣٦- له هه‌موو شتێك شتێك و له شتێك هه‌موو شتێك

زانا و فه‌قیه بۆی هه‌یه له هه‌ر زانست و هونه‌رێك شتێك بزانێت و بخوێنێته‌وه: له مێژوو و فه‌رمووده و زمان و هیتر، چونكه فیقه پێویستی به هه‌موو زانسته‌كانه، با له هه‌موو شتێك شتێكی گرینگ وه‌رگرێت.

فه‌قیهم دیتوه وتوویه‌تی: (ئه‌لشیبلی) و (شه‌ریك ئه‌لقازی) كۆبوونه‌وه! سه‌یرم پێ هات! چۆن دووریی نێوانیان نازانێ؟! (شه‌ریك له سالّی ١٧٧ی كۆچی مردووه و ئه‌لشیبلی له ٢٤٧ی كۆچی له‌دایك بووه!)

یه‌كێكی تر له گفتوگۆیه‌كدا گوتی: هاوسه‌رایه‌تیی نێوان فاتیمه و عه‌لی خوا لێیان ڕازی بێت (منقطعة الحكم) نه‌بوو بۆیه كه فاتیمه كۆچی دوایی كرد عه‌لی شووشتی! پێم وت: واوه‌یلا بۆ تۆ! عه‌لی دوای ئه‌و، ئومامه‌ی كچی زه‌ینه‌بی ماره كرد كه خوشكه‌زای فاتیمه بوو! ئیتر پچڕاوه (انقطع).

له كتێبی (إحیاءعلوم الدین)ی غه‌زالی له‌م جۆره هه‌ڵانه شتی سه‌رسوڕهێنم له فه‌رمووده و مێژوودا دیت، ئه‌و هه‌ڵانه‌م له كتێبێكدا كۆكردۆته‌وه.

له كتێبێكدا به ناوی (المستظهري) كه پێشكه‌شی (المستظهر بالله)ی كردووه باسی ئه‌وه‌ی كردووه گوایه: سوله‌یمانی كوڕی عه‌بدولمه‌لیك كه‌سێكی ناردووه بۆ لای

ئەبى حازم و پێی وتووە: لە نانی بەربانگت شتێکم بۆ بنێرە! ئەویش کولێرەیەکی برژاوی لە کەپەك دروستکراوی بۆ نارد، بەربانگی لەسەر کردەوە پاشان لەگەڵ ژنەکەی جووت بوو، عەبدولعەزیزی هێنا، پاشان ئەویش عومەری بوو!!

ئەمە تێکەڵ و پێکەڵکردنێکی کرێتە، عومەر کوڕی عەبدولعەزیزی کردۆتە نەوەی سولەیمان کوڕی عەبدولمەلیك! واتە سولەیمان باپیرەتی! لە ڕاستیدا ئامۆزایەتی.

(ئەبوو ئەلمەعالی ئەلجوەینی) لە کۆتاییی کتێبی (الشامل فى الاصول)دا وتوویە: کۆمەڵێك لە کەسانی متمانەپێکراو کە بایەخ بە گەڕان و لێکۆڵینەوە لە شاراوە و نهێنییەکان دەدەن باسی ئەوەیان کردووە کە: حەللاج و ئەلجەنابیی ئەلقیرمیتی و ئیبن ئەلموقەففەع ڕێك کەوتبوون و پێکهاتبوون لەسەر هەڵگێڕانەوەی دەوڵەت و تێکدانی مەملەکەت و ڕاکێشانی دڵەکان و، هەر یەکێکیشیان چووە هەرێمێکەوە، ئەلجەنابی لە ناوچەی (ئەلئەحسا) نیشتەجێ بوو، ئیبن ئەلموقەففەعیش چووە وڵاتی تورکەوە، حەللاجیش لە بەغدا نیشتەجێ بوو، هەردوو هاوڕێکەی حوکمی لەناوچوون و کەمتەرخەمی لە گەیشتن بە ئامانجیان بەسەر(حەللاج)دا سەپاند، لەبەرئەوەی خەڵکی بەغدا لە فریوخواردن دووربوون و وریا و ژیر بوون و ڕاستگۆیانە کەسەکانیان دەناسی.

وتم: ئەگەر ئەم پیاوە یان ئەوەی لێی گێڕاوەتەوە مێژووی زانیبا دەیزانی حەللاج بە ئیبن ئەلموقەففەع نەگەیشتووە، چونکە ئیبن ئەلموقەففەع لە لایەن ئەلمەنصوورەوە فەرمانی کوشتنی درا، لە ساڵی ١٤٤ی کۆچی کوژرا، ئەبوو

سەعیدی جەنابیی قیرمیتیش ساڵی ٢٨٦ی کۆچی دەرکەوت، حەللاج ساڵی ٣٠٩ کوژراوە، سەردەمی قیرمیتی و حەللاج لە یەکتر نزیکن، بەڵام ئیبن ئەلموقەففەع نا.

پێویستە هەموو خاوەن زانستێك پشکێکی لە هەموو زانستەکان هەبێت و لە هەر یەکێکیان شتێك بزانێت، چونکە هەموو زانستێك بە زانستێکی ترەوە پەیوەندییەکی هەیە.

بۆ فەرموودەناس ناشیرینە لە ڕووداوێك پرسیاری لێ بکرێ و نەزانێ، کۆکردنەوەی فەرمووده بێئاگای کردبێ.

بۆ فەقیە کرێتە پێی بگوترێ: واتای ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چییە؟ نە ڕاست و دروستیی فەرموودەکە بزانێ و نە واتاکەی!

داوای لە خوای گەورە دەکەین بە چاکە و لوتفی خۆی، هیممەتێکمان بداتێ کە بە کەموکورتی ڕازی نەبێت.

## ٣٣٧- هیممەتبەرزیی پێشینان

هیممەتی زانایانی دێرین بەرز بوو، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو دانراوانەیە کە پاڵفتەی تەمەنیانە بەڵام زۆربەی دانراوەکانیان لەناوچوون، چونکە هیممەتی قوتابییان لاواز و کز بوو، بەدوای کورتکراوەکان دەگەڕان و تاقەتی کتێبە درێژەکانیان نەبوو، پاشان تەنها بایەخیان بە هەندێ لەوانە دەدا کە دەیانخوێند، ئیتر کتێبەکان لەناوچوون و چیتر لەبەریان نەگیرایەوە !

ڕێگای ئەو قوتابییەی دەیەوێ لە ڕێگای زانستدا بگاتە کەماڵ ئەوەیە ئاگاداری ئەو کتێبانە بێت کە لە دوای دانەرەکانەوە بەجێماوە، با زۆر بخوێنێتەوە، لە زانستەکانی ئەو کەسانە و هیممەتبەرزییان شتگەلێکی وەها دەبینێ کە بیری تیژکاتەوە و ئیرادە و هەوڵی بجووڵێنێ، هیچ کتێبێکیش لە سوود خاڵی نییە.

پەنا بە خوا لە ڕەفتاری ئەوانەی هاوسەردەممانن! کەسێکی خاوەن هیممەتبەرزیان تێدا نابینین کە کەسی سەرەتایی شوێنپێیان هەڵگرێت، خاوەن پارێزێك نییە زاهید سوودی لێ وەربگرێت.

بۆ خاتری خوا! له ڕەفتار و ژیاننامەی پێشینان وردبنەوە و دانراو و هەواڵەکانیان بخوێننەوە، زۆر خوێندنەوەی کتێبەکانیان وەکوو دیتنی خۆیانە، هەروەك وتراوە (شاعیر الشريف الرضي):

فاتني ان ارى الديار بطرفي فلعلي أرى الديار بسمعي

له دەستم چوو هەوار بە چاوەکانم ببینم، بەڵکوو بە گوێیەکانم هەوار ببینم!

من باسی خۆم دەکەم: لە خوێندنەوەی کتێب تێر نابم، ئەگەر کتێبێك ببینم نەمدیتبێ وەکوو ئەوە وایە گەنجینەیەکم دۆزیبێتەوە! سەیری تۆماری کتێبە وەقفکراوەکانی خوێندنگەی (نیزامییە)م کرد دیتم نزیکەی شەش هەزار بەرگ کتێبی تێدایە، وە سەیری تۆماری ئەبی حەنیفە و کتێبەکانی ئەلحومەیدی و کتێبەکانی شێخمان عەبدولوەهاب کوڕی ناصر و کتێبەکانی ئەبی محەمەد کوڕی ئەلخەششابم کرد بارگەلێك بوون... هیتریش لە هەر کتێبێك دەستم کەوتبێت، ئەگەر بڵێم: بیست هەزار بەرگم خوێندۆتەوە هێشتا زیاترە، کەچی هێشتا هەر بەدوای کتێب و زانستەوەم! بە سەیرکردنی ئەمانە سوودم وەرگرتووە لە تێبینی و سەرنجدانی ڕەفتار و ژیاننامەی پێشینان و ئەندازەی هیممەت و لەبەرکردن و خواپەرستی و زانستی سەیر و سەمەرەیان کە ئەوەی نەخوێنێتەوە و ئاگادار نەبێت هیچ لەبارەیانەوە نازانێ، بۆیە وام لێ هاتووە بە چاوێکی کەم سەیری ئەو دۆخە دەکەم کە خەڵك تێیدایە و سووك سەرنجی هیممەتی زانستخوازان دەدەم...سوپاس بۆ خوا.

## ٣٣٨- سەرکێشی بە نەفسی خۆت

بۆ ئادەمیزاد هیچ شتێك لە نەفسی خۆی بەڕێزتر و بەنرختر نییە، سەیرم بەو کەسە دێت کە سەرکێشی بە نەفسی دەکات و تووشی لەناوچوون و فەلاکەتی دەکات! هۆکاری ئەوەش کەمهۆشی و بەدڕوانینە!!

هەیانە نەفسی تووشی لەناوچوون دەکات تاوەکوو بە گومانی خۆی ستایش بکرێ، وەکوو ئەو خەڵکانەی بۆ کوشتنی دڕندەکان دەچنەدەر! هەیانە سەردەکەوێتە کۆشکی کیسرا تاوەکوو پێی بوترێ: زیرەك و ئازا! هەیە سی فەرسەخ (٩٠ میل) دەڕوات! ئەمانە ئەگەر لەناوچوون دەخرێنە دۆزەخەوە، ئەگەر لەناوچوو ئەو نەفسە لەدەست دەچێت کە پارە و ماڵ لەبەر خاتری وی دەویسترێ.

سەیرتر لە هەمووان کەسێکە بێ ئەوەی بزانێت لە لەناوچوون و فەلاکەت سەرکێشی بە نەفسی دەکات، وەکوو ئەوەی تووڕە ببێت و موسڵمانێك بکوژێت و بە سزادانی ناو دۆزەخ ناخی دابمرکێنێتەوە!

لەمە سەیرتر جوولەکە و مەسیحییەکانن، کە یەکێکیان پێ دەگات لەسەری پێویست دەبێ سەیری پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بکات، ئەگەر کەمتەرخەمی کرد و مرد هەتاهەتایە لە دۆزەخ دەمێنێتەوە.

به هەندێکیانم گوت: ماڵوێران! لە سزایەکی هەتاهەتایی سەرکێشی بە نەفست دەکەیت!؟ ئێمە باوەڕ بە پێغەمبەرەکەتان دەکەین و دەڵێین: ئەگەر موسڵمانێك باوەڕی بە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) هێنا و پێغەمبەرەکەتان یان تەوراتی بەدرۆ خستەوە هەتاهەتایە لە ئاگردا دەمێنێتەوە، هیچ ناکۆکییەك لە نێوان ئێمە و ئێوەدا نییە!! ئێمە باوەڕمان بە ڕاستگۆیی و کتێبی پێغەمبەرەکەتان هەیە، ئەگەر تووشی ببین شەرمەزار نابین، بۆ نموونە ئەگەر سەرزەنشتی کردین و وتی: ئایا لە ڕۆژانی شەممە دەستتان لە کار هەڵگرت؟ ئەم شتە لە لقەکانە، لقەکانیش بە سزای هەتاهەتایی مانەوە لە ئاگر سزا نادرێ. سەرۆکی جوولەکەکان گوتی: داوای ئەمەتان لێ ناکەین چونکە کارنەکردنی ڕۆژانی شەممە تایبەتە بە بەنی ئیسرائیل و لەسەر ئەوان پێویستە. وتم: بە کۆدەنگیتان ڕازین و ئێوە لەناوچوون، چونکە لە سزایەکی هەمیشەییدا سەرچڵی بە گیانتان دەکەن!! سەیر لەو کەسەیە کە لە سەیرکردن و سەرنجدانی شتێك بێباکی دەکات کە ئەگەر سستی تێدا بکات دەبێتە هۆی مانەوەی هەمیشەیی لە سزای بەردەوام.

سەیرتر لە هەمووان ئەو کەسەیە نکوڵی لە خودای خوڵقێنەر دەکات لە کاتێکدا جوانی و ڕێکوپێکیی دروستکردن و دروستکراوەکان دەبینێ و دەڵێت: هیچ دروستکەرێك نییە!!

هۆکاری هەموو ئەم شتانە کەمهۆشی و بەکارنەهێنانیەتی لە سەرنجدان و بەڵگەدۆزی.

## ٣٣٩- شاردنەوەی نهێنی

نابێ کەسی ژیر نهێنییەك ئاشکرا بکات تا دەزانێ کە ئەگەر ئاشکرا بوو بە ئاشکرابوونی زیانی پێ ناگات.

دیارە کە هۆکاری بڵاوکردنەوەی نهێنی خواستنی ئیسراحەتە بە بڵاوکردنەوەی، ئەوەش ئازارێکی نزیکە، با ئارامی لەسەر بگرێت.

ڕەنگە کەسێك نهێنییەك بۆ ژنەکەی ئاشکرا بکات کە ئەگەر تەڵاق درا بڵاوی دەکاتەوە و ئەو لەناودەچێ، یان نهێنییەکەی بە هاوڕێیەکی دەڵێ، ئەگەر هاوشێوەی یەك بوون ئەوا لە حەسوودییان لێی ئاشکرا دەکات و ئەگەریش ڕەشۆکی بوو ئەوا ڕەشۆکی گەمژەترە.

ڕەنگە نهێنییەك ئاشکرا بکرێت ببێتە هۆکاری لەناوچوون.

## ٣٤٠- هەژارانی ئەهلی زانست و کردەوە

لە زانستخوازیدا هیچ کەس ناگاتە ئەوپەڕی تەنها ئاشقەزانست نەبێ، پێویستە ئاشق لەسەر ناخۆشییەکان ئارام بگرێت، یەکێك لە شتە پێویستەکانی کەسی مەشغوول بە زانست دووربوونە لە کەسب و کار.

لەوەتەی بەرپرس و براکان وازیان لە سۆراغکردن و بەسەرکردنەوەی زانستخوازان هێناوە ئەوانە گرفتاری هەژاری بوون، چاکە و فەزیلەتەکانیش بانگ ڕادەدێرن: ﴿هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ (الأحزاب: ١١) واتە: لەوێدا ئیمانداران تاقیکرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختییەکی زۆر توند و بەهێز بوون، تووشی دڵەلەرزەیەکی زۆر سەخت کران. کاتێ لە تاقیکردنەوە ترسا وتی:

لا تحسبن المجدَ تمرًا أنت آكلُه

لن تبلغَ المجد حتى تلعقَ الصَّبِرا

پێت وانەبێ سەرکەوتن و پایەداری خورمایەکە دەیخۆیت و تەواو، ناگەیتە پایەبەرزی تا هەنجیرەدڕکن (سوبێر) نەلێسیتەوە.

کاتێ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل خوا لێی ڕازی بێت زانستخوازی هەڵبژارد و هەژاریش بوو، ماوەی چل ساڵ بە زانستەوە خەریك بوو و ژنی نەدەهێنا.

پێویستە هەزار لەسەر هەزارییەکەی ئارام بگرێ هەروەك ئیمامی ئەحمەد کردی! جا کێ وەکوو ئەوی پێ دەکرێ و بەرگە دەگرێ؟! لە ماڵی دونیا پەنجا هەزار دیناری ڕەتکردەوە و نانی بە سرکە و خوێوە دەخوارد، بە هەوەنتە ئەم ناوە باش و جوانەی وەها بڵاو نەبۆتەوە، لەبەر واتایەکی سەیر نەبێ خەڵك سەردانی گۆڕەکەی ناکات. ئای ئەمە چ ستایشێکە دونیای پڕ کردووە و چ جوانییەکە بوونی ڕازاندۆتەوە و چ سەربەرزییەکە هەموو زەلیلییەکی هەڵوەشاندۆتەوە! ئەمە لە دونیا، پاداشتی دواڕۆژیش هەر وەسف ناکرێ.

تەماشای گۆڕی زۆربەی زاناکان بکە، نە دەناسرێن و نە سەردانیان دەکرێ...شلەڕەوییان کرد، تەئویلیان کرد، تێکەڵی سوڵتانەکان بوون، ئیتر بەرەکەتی زانست ڕۆیشت و پلەوپایە سڕایەوە، لە کاتی مردنیش دونیایەك پەشیمانبوونەوە! ئای ئەمە چ خەم و پەژارەیەکە کە قەرەبوو ناکرێتەوە و دۆڕان و زیانێکە چارە ناکرێ! هاوڕێیەتیکردنی چێژەکان چاوتروکانێك بوو و خەم و داخ و خەفەتیش هەمیشە و بەردەوام دەبێ.

ئەی خوازیاری چاکە و فەزیلەت، ئارام بگرە ئارام! چونکە چێژی خۆشی و ئاسوودەیی بە ئارەزوو یان بە نهێنی دەڕوات و خەم و خەفەت دەمێنێتەوە. ئیمامی شافیعی خودا لێی ڕازی بێت وتوویەتی:

یا نفس ما هي إلا صبر أيام … كأن مدتها أضغاث أحلام

يا نفس جوزي عن الدنيا مبادرة … وخل عنها فإن العيش قدامي

ئەی نەفس تەنها ئارامگرتنی چەند ڕۆژێکە وەك ئەوەی ماوەکەی هێندەی خەونێکی تێکەڵ و پێکەڵ بێت، ئەی نەفس پشت لە دونیا بکە و بەجێی بێڵە چونکە ژیانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لەبەردەممانە و دواتر دێت.

(نووسەر ئەم شیعرەی بە هی شافیعی داناوە بەڵام لە ڕاستیدا شافیعی هیچ شیعرێکی ئاوای نییە و شیعرەکەش بەم شێوەیە نییە، بەڵکوو شیعرەکە هی (ئەبوو ئەلعەتاهییە)یە و بەم شێوەیە:

يا نَفسُ ما هُوَ إلاّ صَبرُ أيّامِ كأنّ لذّتَها أضغاثُ أحلامِ

يا نَفسُ ما لِيَ لا أنفَكُّ مِن طَمَعٍ طَرفي إليهِ سَريعٌ طامِحٌ سامِ

يا نَفسُ كُوني عَنِ الدُّنيا مُباعِدَةً وَخَلِّفيها فإنّ الحقَّ قُدّامي

پاشان ئەی زانای هەژار! پێت خۆشە موڵکی سوڵتانێك لە سوڵتانەکانت هەبێ و ئەوەی لە زانست دەیزانی نەیزانیت؟! نەخێر، پێم وانییە کەسی هۆشیار ئەمە هەڵبژێرێت!

پاشان تۆ ئەگەر بیرێکی جوان یان واتایەکی سەیرت بۆ هات چێژێك دەبینی کە چێژوەرگری چێژە هەستییەکان نایبینێت. ئەوەی ئارەزووەکانی پێدراوە لەوە بێبەش کراوە کە بە تۆ دراوە، لە ژیانیشدا وەکوو ئەوانیت، تەنها زیادەیەك ماوەتەوە کە ئەگەر وەربگیرێت دوور نییە زیانی هەبێ. پاشان ئەوان بەزۆری لە بابەتی ئاخیرەت لە مەترسیدان و تۆش زیاتر ئەگەری سەلامەتیت هەیە.

براکەم! سەیری سەرەنجامی حاڵوبارەکان بکە و ئەو تەنبەڵییە سەرکوتکە کە لە چاکە و خووی جوان تەوەزەلت دەکات! زۆرێك لەو زانایانەی کەمتەرخەمانە مردن، لەناو خەم و ئاخ و پەژارەدا گینگڵ دەدەن.

پیاوێك (ئیبن ئەلزاغونی)ی شێخمانی لە خەودا بینی، شێخ پێی وت: زۆرترین شتی لای ئێوە بێئاگاییە و زۆرترینی کن ئێمەش پەشیمانییە.

بەر لە حەپسکردن ڕاکە – خوا سەرکەوتوو بکات – ! ئەو گرێبەستە دۆڕاوە هەڵوەشێنەوە کە لەسەر گرێبەستی ئارەزوو کردووتە! بزانە چاکە و فەزیلەتەکان بە نەرمەڕۆیشتن دەست ناکەوێ و، سستی و کەمتەرخەمییەکی کەم ڕووی چاکەکان ناشیرین و عەیبدار دەکات!

پەلە بکە پەلە! وا هێشتا هەناسەی نەفس دێت و دەچێ و فریشتەی مردنیش نادیارە و هێشتا نەهاتووە، ئیتر بە ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە هەستەوە:

إذا همّ ألقى بين عينيه عزمه ونكّب عن ذكر العواقب جانبا
ولم يستشر في رأيه غير نفسه ولم يرض إلا قائم السيف صاحبا

ئەگەر هەستایەوە و هەوڵیدا ئەوا ئیرادەی دەخاتە بەرچاوی خۆی و ئاوڕ ناداتەوە بە لای سەرەنجامەکانەوە، جگە لە خۆی پرسوڕا بە کەسی تر ناکات و تەنها بە هاوڕێیەتیی شمشێرهەڵکێش ڕازی دەبێت.

لەم ئیرادە پۆلاییینەوە دونیا و ئەهلەکەی ڕەتکەوە، دونیا پیرۆزی ئەهلی خۆی بێت، ئێمە دەوڵەمەند و ئەوان هەژارن، هەروەکوو ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم وتوویە: ئەگەر پاشا و پاشازادەکان بەو دۆخە بزانن کە ئێمەی تێداین ئەوا بە شمشێر شەڕیان لەگەڵ دەکردین و لێیان دەداین و لێیان دەسەندین.

ئەهلی دونیا، هیچ یەکێکیان پاروویەك ناخوات ئیللا بە حەرامی یان گومان نەبێت، ئەگەر خۆشی ئەوە هەڵنەبژێرێ ئەوا بریکارەکەی دەیکات، ئەویش بایەخ بە کەمدینی بریکارەکەی نادات، ئەگەر خانوویەك دروست بکەن بێگاری بە کرێکاران دەکەن و ئەگەریش ماڵ و سامانێکیان وەسەریەك نا ئەوا لە ڕێگای نەشیاوەوە دەبێ، پاشان هەر هەموویان دەترسێن بکوژرێن یان لە دەسەلات لابدرێن یان جوێنیان پێ بدرێت، ژیانیان خەم و ناخۆشییە.

ئێمە ئەوە دەخۆین کە ڕواڵەتی شەرع شایەتی ڕێپێدانی داوە و لە دوژمن ناترسین، نە دەسەلات و بەرپرسیارێتیمان قەبووڵی دوورخستنەوە دەکات، شکۆمەندی لە دونیا بۆ ئێمەیە نەك ئەوان، خەڵك ڕوو لە ئێمە دەکات، دەست ماچکردن و بەگەورەزانینمان لە لای ئەوان زۆرە و لە ئاخیرەتیش ئینشائەڵلا جیاوازیمان لەنێواندا هەیە.

ئەگەر دونیاویستان ئاوڕ بدەنەوە ئەوا ڕێزی چاکە و فەزیلەتی ئێمە دەزانن، ئەگەریش دەستیان لە پێدانمان بەسترا بێت ئەوا چێژی پاکی خۆشترە و تاڵیی منەتکاری بارتەقای وەرگیراو نییە، بەڵکوو ئەوە خواردنێکی خوار خواردنە و جلکێکی خوار جلکە و ڕۆژانێکی کەمن.

سەيرم بەو كەسە دێت كە نەفسى خۆى بەڕێز كردووە تا زانستى خواستووە — زانست تەنها نەفسبەڕێز دەيخوازێ — چۆن خۆى بۆ كەسێك سووك و نزم دەكات كە گەورەيى و شكۆمەنديى وى تەنها بە دينارە و هيچ شانازييەكيشى نييە مەگەر بە دەسەڵات و پلەوپايە نەبێ؟!

(ئەبوو يەعلا ئەلعەلەوى) ئەم شيعرەى بۆ وتم:

رُبَّ قومٍ في خلائقهم | عَرَرٌ قد صُيِّروا غُرَرا
سَتَرَ المالُ القبيحَ لهم | سَتَرى إن زالَ ما سَتَرا

ڕەنگە خەڵكێك ڕەفتاريان ناشيرين و ڕەوشتيان بەد بێت بەڵام بە هۆى پارە و سامانەوە پلەوپايەى بەرزيان دەست كەوتووە... پارە و سامان كردەوە و ڕەوشتى ناشيرينيانى داپۆشيوە، ئەگەر ئەو پارە و سامانە نەما ئەو كات ناشيرينى و كرێتييەكان دەبينيت.

خواى گەورە لە خەوى بێئاگايان بەخەبەرمان بێنێ و بيرى هۆشيار و بێدارانمان پێ ببەخشێ و بەگوێرەى زانست و عەقڵ بۆ كاركردن يارمەتيمان بدات...ئەو نزيكى وەڵامگۆيە.

## ٣٤١- له هه‌موو شتێك مامناوه‌ندێتی

نابێ مرۆڤ ئه‌رکێك بخاته سه‌ر جه‌سته‌ی که له توانایدا نییه، چونکه جه‌سته وه‌کوو باربه‌ر وایه، ئه‌گه‌ر ئاگات لێ نه‌بێ سوار ناگه‌یه‌نێته مه‌به‌ست.

خه‌ڵك هه‌یه جه‌سته‌ی له‌سه‌ر خۆشی پێگه‌یاندووه که‌چی زوهد ده‌کات و پشت ده‌کاته ئه‌وه‌ی ده‌قی پێوه گرتووه، ئیتر تووشی نه‌خۆشی ده‌بێت و له زۆرێك له په‌رستشه‌کان داده‌برێ.

وتراوه: هه‌ر جه‌سته‌یه‌ك ده‌قی به چییه‌وه گرتووه له‌سه‌ر ئه‌وه ڕایبهێنن!

سه‌رمازه‌ڵه (الضب) یان هێنایه به‌رده‌م پێغه‌مبه‌ری خوا (صلی الله علیه وسلم) فه‌رمووی: ((بێزم لێی ده‌بێته‌وه چونکه له وڵاتی خۆمان نییه.)) بوخاری و موسلیم گێڕاییتیانه‌وه.

((الضب) گیانه‌وه‌رێکه له شێوه‌ی تیمساح، له چۆڵ و بیابانه‌کاندا ده‌ژی، که ته‌واو گه‌شه ده‌کات درێژییه‌که‌ی ده‌گاته ٨٥ سم.)

له فەرموودەی هیجرەتدا هاتووە: ئەبوو بەکر خودا لێی ڕازی بێت بەدوای سێبەرێك بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕا و فەروەیەکی بۆ ڕاخست و ئەو دەفرەی شیری تێدا بوو ئاوی تێکرد تا ساردبوویەوە..

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چووە لای خەڵکێك و فەرمووی: ((ئەگەر ئاوێکتان لایە شەو لە کۆنەکوندەیەك ماوەتەوە بیهێنن بیخۆینەوە وەگەرنا لە شیرناو یان جۆگەیەك بینی پێوە دەنێین)).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گۆشتی مریشکی دەخوارد.. لە صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەزی لە شیرینی و هەنگوین بوو.

ئەگەریش نەیتوانیبا چی هەبووایە ئەوی دەخوارد.

سوێند بە خوا، لەناو عەرەب و دانیشتووانی دێهاتەکان خەڵك هەیە وشکەژیانی لە خواردن و جلوبەرگ کاری تێ ناکات، ئەوەش ئەگەر دوای تەوبەکردنی لەسەر عادەتی خۆی بڕوات زیانی نییە. بەڵام ئەوەی دەقی بە نەرمونیانی و خۆشییەوە گرتووە ئەوا ئەگەر حاڵەتی خۆی گۆڕی ئەوا جەستەی دەگۆڕێ و پەرستشی کەم دەبێتەوە.

حەسەن بەردەوام گۆشتی دەخوارد و دەیوت: نە دوو کولێرەکەی مالیك و نە دوو قاپەکەی فەرقەد.

ئیبن سیرین ماڵەکەی بێ شیرینی نەدەبوو.

سوفیانی سەوری سەفەری دەکرد و لە خوانەکەیدا بەرخی برژاو و لوقمەقازی هەبوو.

ڕابیعە وتوویەتی: ئەگەر جەستەیەك بۆ خواپەرستی لوقمەقازی بخوات هیچ نەنگییەك نییە.

هەر کەسێك دەقی بە خۆشگوزەرانی گرتبێت پێویستە تا دەتوانێ ئاگای لە نەفسی خۆی بێت و لەگەڵیدا نەرمونیان بێت.

ئەوەم لە نەفسی خۆمڕا زانی، ئەمن لە خۆشیدا گەورە بووم، کاتێ دەستم کرد بە کەمخۆری و وازهێنان لەو شتانەی حەزم لێیەتی، تووشی نەخۆشییەکی وای کردم کە لە زۆرێك لە پەرستشەکان دایبڕیم، تەنانەت من ڕۆژگارێك هەموو ڕۆژێك پێنج بەشی قورئانم دەخوێند، ڕۆژێکیان شتێکی نەشیاوم خوارد ئیتر ئەو ڕۆژە نەمتوانی هیچ بخوێنم، وتم: پارووە خواردنێك ببێتە هۆی پێنج بەشی قورئان کە لە هەر پیتێکی دە خێر و چاکە هەیە! بەڕاستی خواردنی خواپەرستییەکی گەورەیە! وە خواردنێك جەستە ئازار بدات و کردەوەیەکی خێری لە دەست بدات ئەوا پێویستە لێی دووركەوینەوە!

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی لە هاوەڵان دیت بە هۆی وشکەژیانییەوە گۆڕا بوو، پێی فەرموو: ((کێ فەرمانی ئەمەی پێ کردی؟)).

کەسی ژێر ئەو خۆراکانە دەداتە جەستەی کە بۆی گونجاوە..وا گومان مەبە من فەرمان دەکەم بە خواردنی ئارەزووەکان و زۆرخواردنی خواردنە بەتامەکان! بەڵکوو فەرمان دەکەم بە خواردنی ئەو شتانەی نەفس دەپارێزن و نەهی دەکەم لەوانەی جەستە ئازار دەدەن، بەڵام زۆرخۆری هۆکاری نووستنە و تێری دڵ کوێر دەکات و جەستە شل و بێهێز دەکات.

تێ بگە لەوەی ئاماژەم پێ کرد، ڕێگای ڕاست مامناوەندەکەیە.

## ٣٤٢- زیرەکی و بێئاگایی

ئەگەر عەقڵ کامڵ و تێروتەواو بوو ئەوا زیرەکی و ژیری بەهێز دەبێت و، کەسی زیرەکیش ئەگەر کەوتە نێو بەڵا و دەردێکەوە خۆی ڕزگار دەکات، هەروەکوو حەسەن وتوویە: دز ئەگەر زیرەك و زرنگ بێت دەستی نابڕدرێ، بەڵام گەمژە و بێئاگا خۆی گرفتاری بەڵایان دەکات.

براکانی یوسف – سڵاوی خوایان لێ بێت – یوسفیان لە باوکیان دوورخستەوە تاوەکوو خۆیان بچنە پێشەوە، نەیانزانی کە خەمی یوسف دەبێتە هۆی مەشغوولبوونی وی لەوان و تۆمەتبارکردنی ئەوان بە دوورخستنەوەی یوسف دەبێتە مایەی ڕقلێبوونەوەی ئەو لەوان!

پاشان فڕێیان دایە ناو بیرەوە و وتیان: ﴿يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ﴾ (یوسف: ١٠) واتە: هەندێ ڕێبوار هەڵی دەگرنەوە.

ئەو منداڵ نەبوو، مێرمنداڵ بوو، نەیاندەزانی کە ئەگەر ئەو هەڵبگیرێتەوە باسی حاڵی خۆی دەکات و هەواڵ دەگاتەوە باوکی! ئەمە بێئاگاییە!!

پاشان ئەوان گوتیان: گورگ خواردیتی، کەچی کراسەکەیان بەساغی هێنایەوە! ئەگەر بیاندڕاندبا ئەگەری هەبوو!

پاشـان کـه لـه میسـرِ چـوونه لای خـۆراك و گـەنم بێـنن، ئـەو گـوتی: ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ۝٥٩﴾ (یوسـف: ٥٩) واته: براکـەتان (بنیـامین) بێـنن... ئەگـەر تێگەیشـتبان دەیـانزانی کـه پاشـای میسرِ هیچ مەبەستێکی له براکەیان نییه.

پاشان به بیانوویەك گرتی و گلی دایەوه و گوتی: ئەم جامه پێم دەڵێ ئەمه و ئـەوه ڕوویداوه!

هەموو ئەمانه ڕوویدەدا و تێ نەدەگەیشتن!

کاتێ یـەعقووب – سـڵاوی خـوای لەسـەر بێـت – هەسـتی بـەم شـتانه کـرد گـوتی: ﴿يَٰبَنِىَّ ٱذْهَبُوا۟ فَتَحَسَّسُوا۟ مِن يُوسُفَ﴾ (یوسـف: ٨٧) واتـه: بـڕۆن سـۆراغی یوسـف بکەن..

یوسف به سروش (وەحی) نەهی لێ کرابوو بوونی خۆی به باوکی بڵێت، لەبـەر ئەمـه کاتێ بەیەك گەیشـتن بـاوکی پێـی وت: ده نامەیـەکت بـۆ بنووسـیبوومایه! یوسـف گوتی: جیبریل – سڵاوی خوای لێ بێت – ڕێگری لێ کردم.

کاتێ نەهی لێ کرا لەوەی هەواڵ به باوکی بدات بۆ ئـەوه بـوو تاقیکردنەوەکـه تـەواو بێت، ئەوەشی بـه براکـەی (بنیـامین) کـردی (لـه گلدانـەوه و هێشـتنەوەی) وەکـوو ئاگادارکردنەوەیەك بوو (بۆ باوکی).

سوێند به خوا یەعقووب لەسەر تێگەیشتنی یوسف گریا نەك تەنها لەسەر وێنه و شێوەکەی!

## ٢٤٣- غەمی ئاخیرەت

ئادەمیزاد کۆمەڵێك خواستی هەیە و بۆی دانراوە کە هەم و خەمی پەرشوبڵاو دەکات: چاو بینراو دەخوازێ، زمان قسەکردن دەخوازێ، سك داوای خۆراك دەکات، داوێن سەرجێی گەرەکە، سروشتی مرۆڤ حەزی لە کۆکردنەوەی ماڵە..

فەرمانمان پێ کراوە هەم و خەم و هزرمان بۆ یادی ئاخیرەت کۆبکەینەوە و ئارەزووش پەرتوبڵاوی دەکات، ئەی ئەگەر پێداویستییە پێویستەکانی وەکوو خۆراکی جەستە و نانی خاوخێزانی هاتەپاڵ دەبێ چۆن بێت؟!

ئەمە بەیانی زوو دەچێتە دوکانەکەی و بیر لە نان پەیداکردن دەکاتەوە و ئامرازی تێگەیشتن بۆ وەدەسهێنانی ئەوەی پێویستە بەکاردێنێ، ئیتر چ هەم و خەم و بیرێکی بۆ جەم دەبێ؟! بەتایبەتی ئەگەر چڵێس بێت، ئیتر تەمەن دەڕوات، لە دوکانەوە بۆ گۆڕ هەڵدەستێ، چۆن زانست یان کار یان دڵسۆزی یان فەزیلەت و چاکە بەدەست بێنێ؟!

هەر کەسێك ئاگایی و بێدارییەکی پێدرا پێویستە بۆ وەدەسهێنانی چاکە و فەزیلەتەکان ئارام بگرێ:

ئەگەر زاهید و بێ خاووخێزان بوو ئەوا هەوڵدانێکی کەم بەسە، (ئەلسەبتی) تەنها ڕۆژانی شەممە کاری دەکرد و بەشی هەفتەیەکی دەکرد.

ئەگەر ماڵ و دارایی هەبوو ئەوا با بیداتە کەسێکی متمانەپێکراو و دیندار تا بازرگانی بۆ پێوە بکات.

ئەگەر خاوەن خاووخێزان بوو با هەم و خەم و هەوڵی بە نیازی نان پەیداکردن بێت بۆ ماڵومنداڵی ئەو کات بۆی بە خواپەرستی دەژمێردرێ.

یان پارچە زەوییەکی هەبوو با بە نیوەتۆ بیدات و داهاتی خۆی لێ دابین بکات، تا پێی دەکرێ پەیوەندییەکانی کەم بکاتەوە بۆ ئەوەی هەم و غەمی بۆ یادی ئاخیرەت جەم بکات.

ئەگەر ئەوە نەکات ئەوا بە بێئاگاییەوە دەگیرێت و لە گۆڕدا پەشیمان دەبێتەوە.

ناشیرنترین حاڵ، حاڵی زانایەکی فەقیهە، هەر کات هەم و غەمی بۆ یادی ئاخیرەت کۆبکاتەوە پەیداکردنی نان و بژیوی خاووخێزان بیری پەرت بکات، ڕەنگە ئاتاجی دەستپانکردنەوە لە ستەمکاران و وەرگرتنی شتی گومانلێکراو و ڕووتکان بێت، ئەمە وا پێویست دەکات لە خەرجیدا تەقدیر بکات، ئەگەر لە ڕێگایەکەوە شتێکی دەست کەوت ڕێککاری و کارسازی تێدا بکات. نابێ هیواکورتی وای لێ بکات هەموو ئەوەی هەیەتی بیبەخشێ و خەرجی بکات، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((ئەگەر میراتگرانت بە دەوڵەمەند و بێنیاز لە خەڵك بەجێ بێڵیت باشترە لەوەی هەژار و دەستکورت بەجێیان بێڵیت دەست لە خەڵك پان بکەنەوە.))

له هەموو زەلیلییەك زەلیلتر دەستپانكردنەوەیە لە ڕەزیل و بەرپرسان، با ئەو كەسە كاروباری خۆی ڕێك بخات و پەیوەندییەكانی كەم بكاتەوە و پلەوپایە و شكۆی بپارێزێ، ڕۆژەكان كەمن و تێدەپەڕن.

ماڵ و داراییەك بۆ ئەحمەدی كوڕی حەنبەل نێردرا، كوڕەكەی داوای لێ كرد قەبووڵی بكات، ئەویش گوتی: ئەی صالح! بمپارێزە! پاشان وتی: داوای خێر و بژارە(الاستخارة) لە خودا دەكەم. بەیانی كردەوە و وتی: كوڕەكەم! داوام لێ كراوە ماڵەكە قەبووڵ نەكەم.

ئەمە و بەخششەكە زۆر و مفت بوو، لە چەند لایەكەوە بۆی هاتبوو! ئەمڕۆ شتەكە پێچەوانە بۆتەوە.

## ٣٤٤- مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵك

دابڕان لە خەڵك هۆكارى پاك و خۆشيى ژيانە، تێكەڵبوونى بە ئەندازە هەردەبێ ببێت. موداراتى دوژمن بكە و باوەگۆى بدەوە، ڕەنگە فێڵت لێ بكات و لەناوت ببات!

چاكە لەگەڵ ئەو كەسە بكە كە خراپەى لەگەڵ كردوويت و! بۆ جێبەجێكردنى كارەكانت سوود لە نهێنيپارێزى و شارەوايى وەربگرە!

با خەڵك هەموو ناسياوت بن بەڵام هاوڕێ نەبن، چونكە بەڕێزترين شت بوونى هاوڕێيە، لەبەرئەوەى هاوڕێ دەبێ لە ئاستى هاوشان بێت، ئەگەر ديتت ڕەشۆكييە ئەوا سوودى لێ وەرناگريت لەبەر بەدئاكارى و كەمزانستى و كەمئەدەبييەكەى، ئەگەر ديتت هاوشان يان نزيكتە ئەوا ئێرەييت پێ دەبات، ئەگەر وريا و هۆشيار بيت، لە كردەوەكانيڕا هەست بە ئێرەييەكەى دەكەيت: ﴿وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ﴾ (محمد: ٣٠) واتە: لە ئاواز و تۆنى قسەكردنيان دەيانناسيت.

ئەگەر ژيانت دەوێ ئەوا لە حەسوود دووركەوە، چونكە نيعمەتەكەت دەبينێ، ڕەنگە چاوى لێ بدات!

ئەگەر ناچاری تێکەڵبوونی بوویت ئەوا هیچ نهێنییەکی خۆتی پێ مەڵێ و پرسوڕای پێ مەکە، بە مەرایی و ماستاوکردنی و ئەوەی دەریدەخات لە دین و خواپەرستی فریو مەخۆ، چونکە حەسوودی بەسەر دیندار زاڵ دەبێ!

زانیوتە کە حەسوودی قابیلی بەرەو کوشتن برد! براکانی یوسف، یوسفیان بە نرخێکی کەم فرۆشت! (ئەبوو عامری ئەلڕاهیب) لە خواپەرستە ژیرەکان و (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) لە سەرۆکەکان بوو، ئێرەیی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرەو دووڕوویی و وازهێنان لە ڕێگای ڕاستی بردن.

نابێ داوای سزایەك بۆ حەسوودەکەت بکەیت زیاتر لەوەی تێیدایە، ئەو لە کارێکی گەورەی بەردەوامدایە، هیچ شتێك ڕازی ناکات مەگەر نەمانی نیعمەتەکەت. هەرچەند نیعمەتەکەت بەردەوام بوو و درێژەی کێشا ئەوا ئازاری ویش درێژە دەکێشێ، ئیتر ژیانی نییە!

ژیانی ئەهلی بەهەشتیش خۆش نەبوو تەنها ئەو کاتە نەبێ کە ئێرەیی و ڕق و کینە لە دڵیان دەرهێنرا، ئەگەر دەرنەهێنرابایە ئەوا ئێرەییان بە یەکتر دەبرد و ژیانیان ناخۆش دەبوو.

## ٣٤٥- چێژوەرگرتن لە خۆشییەکانی دونیا

هەر کەسێ لەگەڵ ئاوەز (عەقڵ) ڕۆیشت و پێچەوانەی ڕێگای ئارەزووی کرد و سەیری سەرەنجامەکانی کرد، دەتوانێ چەندان هێندەی ئارەزووپەرستان چێژ لە دونیا وەربگرێت. بەڵام پەلەکار پشکی دونیا و ناوی باش لەدەست خۆی دەدات و ئەوەش دەبێتە هۆی لەدەستدانی مەبەست و ئامانج لە چێژەکان، ڕوونکردنەوەی ئەمەش لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: ئەوەی بەرەو لای ئارەزووەکانی پەڕین (سەرجێی) دەشکێنێتەوە و زۆر دەکات ئەوا چێژوەرگرتنی کەم دەبێت و گەرمییەکەی لەناودەچێ، ئەوەش دەبێتە هۆی بەدینەهاتنی ئەو خواستەی لەوەدا هەیەتی! هەر کەسێکیش ئەوەی بە ئەندازەی ڕێپێدانی عەقڵ و بەرگەگرتنی بەکارهێنا ئەوا چێژوەرگرتنی زیاترە بە هۆی دووریی نێوان دوو پەڕینەوە، بە هۆی مانەوەی گەرمییش دەتوانێ دووبارەی بکاتەوە.

هەروەها ئەوەی لە مامەڵەیدا فێڵ یان ناپاکی بکات ئەوا کەس مامەڵەی لەگەڵدا ناکات و قازانجی مامەڵەی بەردەوامی لەدەست دەچێ لەبەرئەوەی جارێك ناپاکی کردووە، ئەگەر بە متمانەپێکراو بناسرێت ئەوا مامەڵەکردنی خەڵك لەگەڵیدا بەردەوام دەبێ و قازانجی زیاد دەبێ.

دووەم: هەر یەکێك لە خودا ترسا و بە زانست یان بە هێنانەدی زوهد سەرقاڵ بوو، ئەوا دەرگای ڕێپێدراوەکانی بۆ دەکرێتەوە کە چێژی زۆریان لێ وەردەگرێت، هەر کەسێکیش تەنبەڵی بووە هۆی کەمتەرخەمیکردن لە زانست یان ئارەزوو لە هێنانەدی زوهد ڕێگری لێ کرد ئەوا جگە لە کەمێك لە ئامانج و مەبەستی، چیتری دەست ناکەوێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾﴾ (الجن: ١٦) واتە: جا ئەگەر ئەو خەڵکە ڕێگەی ئیسلامەتی و دینداری بگرنە بەر ئێمە بارانی پڕ بەرەکەتیان بەسەردا دەبارێنین.

## ٣٤٦- ژیانی ڕاستەقینە

پێویستە هەموو کارێك بۆ خوا و لەگەڵ و لەپێناو ویدا بێت، هەر ئەو لە هەموو مەخلوقێك تۆی پاراستووە و هەموو خێرێکی بۆ هێناویت.

ئامان نەکەی بە هۆی سازانی ئارەزوو و ڕازیکردنی مەخلووق ڕووی لێ وەرگێڕیت، چونکە دواتر دۆخەکە بە دژی تۆ بەرەواژ دەکاتەوە و مەبەستەکە لە دەست دەدەیت، لە فەرموودەدا هاتووە: (( من أرضى الناسَ بسخطِ الله، عاد حامِدُهُ من الناسِ ذامّا)) حسن، رواه البزار و البيهقي.. واتە: ((هەر کەسێك خەڵك بە تووڕەبوونی خودا ڕازی بکات ئەوا ئەو کەسەی ستایشی دەکرد دەبێتە زەمکاری)).

خۆشترین و پاکترین ژیان، ژیانی ئەو کەسەیە کە لەگەڵ خوای گەورە دەژی. ئەگەر وترا: چۆن لەگەڵیدا دەژی؟

وتم: بە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە نەهییەکانی و پاراستنی سنوورەکانی و ڕازیبوون بە بڕیارەکانی و ئەدەبی جوان لە تەنیاییدا و زۆر یادکردنی و سەلامەتیی دڵ لە ڕەخنەگرتن لە قەدەرەکانی، ئەگەر ئاتاج بوویت داوای لێ بکەیت، ئەگەر پێی بەخشیت ئەوا باشە وەگەرنا بە پێنەبەخشین ڕازی بیت و بزانیت کە لەبەر ڕەزیلی نییە کە نەیبەخشیوە بەڵکوو لەبەر خاتری تۆیە، تۆش لە

داواکردن وازمەهێنە چونکە بەم داواکردنە خواپەرستی دەکەیت، هەر کاتێ لەسەر ئەوە بەردەوام بوویت ئەوا خۆشەویستیی خۆی و ڕاستگۆییی پشت پێ بەستنت پێ دەدات، ئیتر خۆشەویستی مەبەستەکەت، پێ نیشان دەدات و خۆشەویستیی ئەوت بۆ بەرهەم دێنێ، ئەو کات وەکوو ڕاستگۆ و دۆستانی خودا دەژیت...ژیانێکیش ئەوها نەبێ هیچ خێروبێرێکی تێدا نییە.

زۆربەی خەڵك لە ژیانیدا شڕ و شەپڕێوە، موداراتی هۆکارەکان دەکات و بە دڵەوە مەیلی دەکات و بەرەو لای دەچێ و بەرژدییەکی لە ڕادە بەدەر خۆی بۆ ڕۆزی پەیداکردن ماندوو دەکات و چاوی لە دەستی خەڵکە و لە کاتی دەست نەکەوتنی مەبەستەکان ڕەخنە دەگرێ و قەدەریش دەڕوات و گرینگی بە تووڕەیی نادات و جگە لەوەی بۆی تەقدیر کراوە چیتری دەست ناکەوێ، نزیکایەتی و خۆشەویستیی خودا و بەئەدەب بوون لەگەڵی لە دەست چووە..ئەو ژیانە ژیانی ئاژەڵانە.

## ٣٢٧- بەکارهێنانی عەقڵ سەلامەتیی دونیا و دوارۆژە

سەیری حیکمەتی خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و سەرجێیم کرد: دیتم کاتێ ئادەمیزاد لە بنچینەگەلێك خوڵقاوە کە شی دەبێتەوە و هەڵدەوەشێتەوە کە بریتییە لە ئاو و خۆڵ و ئاگر و هەوا، مانەوەشی بە گەرمی و تەڕی دەبێت، گەرمیش هەمیشە تەڕی شی دەکاتەوە، بۆیە دەبێ شتێك هەبێ جێی ئەوە بگرێتەوە کە دەپووچێتەوە.

کاتێ گۆشت هەر جێی گۆشت دەگرێتەوە بۆیە شەرع ڕێی بە سەربڕینی ئاژەڵ داوە تا ئەو مەخلووقەی لەو بەڕێزترە پێی بەهێز بێت.

کاتێ جەستەی پێویستی بە پۆشاك دەبێت و توانای جیاکردنەوەی هەیە و توانای هەیە لە لۆکە و خوری ئەو جلوبەرگانە دروست بکات لە ئازار دەیپارێزێ، لەسەر پێستەی شتێکی دانەناوە کە بیپارێزێ بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە، جا کاتێ مرۆڤ توانای داپۆشینی پێستەکەی نەبووە بۆیە خودا بە پەڕ و موو و خوری قەرەبووی کردۆتەوە.

کاتێ هەر دەبێ بنیادەم و گیانلەبەر لەناوبچن ئارەزووی پەڕینی بزواندووە بۆ ئەوەی نەوەکان جێی یەکتر بگرنەوە.

خواستی عەقڵ کە بۆ داواکردنی ئەم بەرژەوەندانە بزوێنراوە وا دەکات خواردن و خواردنەوە بەپێی پێویستی و بەرژەوەند بێت بۆئەوەی چێژوەرگرتنەکە بە لەشساغییەوە بێت، دەرد و بەلا ئەوەیە چێژ لە خواردن وەربگریت ئەگەر نەشیاو و ناباشیش بێت و زۆری لێ بخوێت و چڵێس بیت، پۆشاك و سەرجێییش بە هەمان شێوە!

ماڵ کۆکردنەوە و هەڵگرتنی بۆ پێداویستی و ڕۆژی تەنگانە لە گورجوگۆڵی و بڕیاری ژیرانەیە، بێئاگایی و گەمژەییە ئەوەی هەتە بیبەخشی، ڕەنگە پێویستییەکت بێتە پێش نەتوانی دابینی بکەیت، ئیتر نەبوونی کار بکاتە سەر جەستە یان ئابڕوو بە داواکردنی پێویستییەکە لە هیچوپووچان!

لە ناشیرینترین کارەکان ڕۆچوونە لە سەرجێی بۆ خواستن و دەسکەوتنی شێوە و وێنەکانی چێژ، لە بیری بچێتەوە کە ئەوە بێهێزی و داهێزرانی لێ دەکەوێتەوە و لە حەرامیشدا سزای زیاتری بۆ دەبڕێتەوە.

هەر کەسێك بە لای تەگبیر و ڕێکخستنی عەقڵدا وەرچەرخا ئەوا لە دونیا و ئاخیرەتی سەلامەت دەبێ، هەر کەسێکیش پشتی کردە ڕاوێژکردن بە عەقڵ یان لێ قەبووڵکردنی ئەوا لەناوچوونی خێرا دەبێ.

ئیتر لە مەبەستی ئەو شتانەی دانراون و حیکمەت و مەبەست لێیان تێ بگەن!

هەر کەسێك تێ نەگات و بەپێی ئەوەی تێی گەیشتووە کار نەکات ئەوا وەکوو نەزانترین ڕەشۆکییە ئەگەر زاناش بێت.

## ٣٤٨- تێکەڵبوونی دەسەڵاتداران

سەیر لەو کەسەی کەمێك عەقڵ یان دینی هەیە چۆن تێکەڵبوونیان هەڵدەبژێرێت؟!

بە تێکەڵبوونیان یان کارکردن لەگەڵیان هەمیشە لە لادان یان کوشتن یان ژەهرخواردکردن دەترسێت، بە خواستی فەرمانی ئەوان نەبێ ناتوانێ کاربکات، ئەگەر فەرمان بە شتی ناڕەوا بکەن ناتوانێ پەشیمان بێتەوە چونکە بەدڵنیاییەوە دینی بە دونیای وی فرۆشتووە، ترس ڕێگری لێ کردووە لەوەی فەرمانی خودا جێبەجێ بکات و ئاخیرەتیشی لەدەست چووە و جگە لە گەورەکردن چیتری بەدەستەوە نەماوە و تەنها دەبێ بڵێ: بە ناوی خوا و! فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت! ئەوەش لە سەلامەتیی دین دووری دەخاتەوە و ئەوەی لە دونیا چێژی لێ وەردەگرێ تێکەڵە بە ترسی لەکارلادان یان کوشتن.

## ٣٤٩- وردبوونەوە لە سەرەنجامەكان

هەڵەی گەورە ئەوەیە دەرهەق بەرپرسێكی لەكارلادراو قسەی نەشیاو بكرێت، چونكە هیچ گەرەنتییەك نییە جارێكی تر دەسەڵات بگرێتەوە دەست و تۆڵە بكاتەوە.

بە گشتی، ئەسڵەن نابێ دوژمنایەتی بۆ هیچ كەسێك دەربخرێت، ڕەنگە كەسی سووك و نزم بەرزبێتەوە و كەسانێك دەسەڵات بگرنە دەست كە حیسابی هیچیان بۆ ناكرێت.

بەڵكوو پێویستە ئەو ڕقوكینەیەی لە بەرانبەر دوژمنان لە دڵدایە بشاردرێتەوە، ئەگەر توانرا تۆڵەیان لێ بسەندرێ ئەوا لێخۆشبوون تۆڵەكردنەوەیە چونكە زەلیلیان دەكات.

پێویستە چاكە لەگەڵ هەموو كەسێك بكرێت بەتایبەتی كەسێك كە دەكرێ ببێتە خاوەن دەسەڵات و هەروەها لەكارلادراو خزمەت بكرێ ڕەنگە لە كاتی دەسەڵاتداریدا سوودێك بگەیەنێ.

گێڕدراوەتەوە کە پیاوێك ئیزنی چوونە ژوورەوەی لە (ئیبن ئەبی دوئـاد)ی دادوەری دادوەران وەرگـرت و گـوتی: بڵـێن ئـەبوو جەعفـەر لەبـەر دەرگایـە! کـاتێ دادوەر بیستی دڵخۆش و چالاك بوو و وتی: ئیزنی ژوورەوەی بدەن!

کە چووە ژوور لەبەری هەستایەوە و پێشوازی لێ کـرد و ڕێـزی زۆری گـرت و پێـنج هەزار دیناری پێدا و بەڕێزەوە بەڕێی کرد! پێی وترا: بۆ پیاوێکی ڕەشـۆکی ئەمـەت کرد؟! گوتی: ئەمن هەژار بووم و ئەمە هاوڕێم بـوو، ڕۆژێـك چـوومە لای و پـێم وت: برسیمە. وتی: دانیشە! ئیتر چـووە دەرێ و بـە گۆشـتی بـرژاو و شـیرینی و نانـەوە هاتەوە و گوتی: بخۆ. وتم: لەگەڵم بخـۆ. وتـی: نـا..وتم: سـوێند بـە خـوا نـاخۆم تـا تۆش لەگەڵم نەخۆیت! ئیتر خـواردی و خـوێن لـە دەمـی هـات! وتم: ئەمـە چـییە؟ وتی: نەخۆشی. وتم: سوێند بە خوا دەبێ پێم بڵێیـت. وتـی: کـاتێ تـۆ هاتیـت هـیچ شـتێکم نـەبوو و ددانەکانیشـم شـریتێکی زێـڕی تـێگیرا بـوو، لـێم کـردەوە و ئـەم خواردنەم پێ کڕی!

ئایا پاداشتی کەسێکی ئەوها نەدەمەوە؟!

(ئیبن ئەلزەییات)ی وەزیری (ئەلواسیق بیللا)ی خەلیفەی عەبباسی پێچەوانەی ئـەم شتانە بوو، بە قسەکانی لـە پلەوپایـەی (ئەلموتـەوەکیل)ی کـەم دەکـردەوە، کـاتێ متەوەکیل بووە خەلیفە بە جۆرەها شێواز سزای دا.

هەروەها (ئیبن ئەلخەزری)، بەر لە دەسـەڵات ڕێـزی (ئەلموستەڕشـید)ی نـەدەگرت، کاتێ دەسەڵاتی گرتە دەست دەرد و بەڵای زۆری تووش کرد.

عاقڵ ئەو کەسەیە لە سـەرەنجامەکان وردبێتـەوە و ڕەچـاویان بکـات و هـەموو ئـەو شتانە بێنێتە بەرچاو کە ئەگەری ڕوودانیان هەیە و بە گوێرەی بڕیاری یەکلاکەرەوە کاربکات.

لەوە کاریگەرتر وێناکردنی بوونی بەپەلە و خێرای مردنە، چونکە ڕەنگە لـەپڕ و بـێ نەخۆشی بێت، گورج و زرنگ ئەو کەسەیە خۆی بۆ ئامادە بکات، کاری وەهـا بکـات کە ئەگەر هات پەشیمان نەبێتـەوە و لـە گوناهـان وریـا بێـت چـونکە گونـاه وەکـوو دوژمنێکە لە بۆسەدا بێت و چاوەڕێی سزا بێت، وە کار و کـردەوەی بـاش بـۆ خـۆی پاشـەکەوت بکـات، چـونکە کـردەوەی بـاش وەکـوو هاوڕێیەکـە لـە کـاتی تەنگانـە سوودی هەبێ.

لە هەموو شت کاریگەرتر ئەوەیە ئیماندار بزانێت کە هەرچەند کاری زیاتر بـۆ چـاکە و فەزیلەتەکان بکات پلەوپایەی لە بەهەشت بەرز دەبێتەوە، ئەگەر کەمی کـرد کـەم دەبێتەوە، ئەگەر بچێتە بەهەشـتیش بـەراورد بـە کـەماڵیی غـەیر ئـەو لـە کەمیدایـە کەچی ئەو بێ ئەوەی هەست پێ بکات پێی ڕازی بووە.

ڕەحمــەتی خــوا لــەو کەســەی ســەرنجی ســەرەنجامەکانی دا و بــەگوێرەی ئــەو سەرنجدانە کاری کرد..

## ٣٥٠- دەسخەرۆبوونی خەڵك بە دونیا

کاتێ کتێبەکەم بە ناوی (المنتظم في تأريخ الملوك و الامم) کۆکردەوە و ڕێك خست، ئاگاداری ڕەفتار و ژیاننامەی خەڵکێك لە پاشا و وەزیر و زانا و ئەدیب و فەقیه و فەرموودەناس و زاهیدان و غەیری ئەوان بووم، دیتم دونیا گەمەیەکی وەهای بە زۆربەیان کردووە کە دینی بردوون، تەنانەت باوەڕیان بە سزا نەبووە.

میر و بەرپرس هەبووە بە ناهەق کاری کوشتن و دەسبەسەرداگرتن و بڕین و بەندکردنی ئەنجام داوە وەك ئەوەی هەموو شت بەدەست وی بێت یان لە سزای خودا پارێزراو بێت، لەوانەیە وا خەیاڵی کردبێت کە پاراستنی هاووڵاتییان بەرگریم لێ دەکات و سزام لێ دوور دەخاتەوە و لەبیری چووەتەوە کە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتراوە: ﴿قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ١٥﴾ (الأنعام: ١٥) واتە: ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بڵێ: بەڕاستی من زۆر لە سزای ڕۆژێکی گەورە دەترسم کە سزای ڕۆژی قیامەتە ئەگەر یاخی بم لە فەرمانی پەروەردگارم.

کۆمەڵێك لەوانەی بە زانست ناسراون چوونە ڕیزی گوناه و تاوانەوە بۆ وەدەسهێنانی مەبەستە دونیاییەکانیان و زانست سوودی پێ نەگەیاندن! خەڵکێکمان لە زاهیدان بینی بۆ وەدەسهێنانی مەبەستەکانیان سەرپێچییان کرد! ئەمە لەبەرئەوەی دونیا تەڵەیە و خەڵکیش وەکوو چۆلەکە وان، چۆلەکە دەنکۆڵەی گەرەکە و خنکاندنی بیردەچێتەوە.. زۆربەی خەڵك لەبەر مەیلیان بەرەو چێژە کاتییەکانیان دوارۆژیان بیرچۆتەوە و ڕوویان کردۆتە ئارەزووبازی و ئاوڕ بە لای ڕاوێژی عەقڵ نادەنەوە... بە چێژێکی کەم خێرێکی زۆریان فرۆشت و بە شەهوەتگەلێکی بێزراو شایستەی سزایەکی گەورە بوون... کە یەکێکیان تووشی مردن بوو وتی: خۆزگە نەبوومایە! خۆزگە خاك و خۆڵ بوومایە! دەوترێ: جا ئێستا؟!

داخ و مخابن بۆ لەدەسچوویەك کە قەرەبوو ناکرێتەوە و بۆ بارمتەکراوێك ناکرێ ئازاد بکرێت و بۆ پەشیمانییەك کاتی کۆتایی نایە و بۆ ئازاردراوێك ئیمان بە خودای لەسەر قورس بوو!

سوێند بە خوا، عەقڵەکان سوودیان نەبووە ئیللا بۆ کەسێك نەبێ ئاوڕی لێ بداتەوە و پشتی پێ ببەستێ و ناکرێ ڕاوێژی قەبووڵ بکرێ ئیللا بە ئیرادەی ئارامگرتن لەسەر ئەو شتانەی حەزی لێ دەکرێ.

لە میرەکان سەیری عومەری کوڕی خەتتاب و کوڕی عەبدولعەزیز بدە — خودا لێیان ڕازی بێت —، لە زانایان ئەحمەد کوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێت و لە

زاهیدان ئەوەیسی ئەلقەرەنی، ئەمانەی هەقی هەوڵ و کۆششیان دا و مەبەستی بوون تێ گەیشتن.

لەناوچووان تەنها بەهۆی کەم ئارامییان لە حەزلێکراو لەناوچوون، ڕەنگە تێیاندا بووبێت باوەڕی بە زیندووبوونەوە و سزا نەبێت.

لەوەشدا هیچ سەیر و سەمەرەیەك نییە، بەڵکوو سەیر و سەمەرە لە ئیماندارێکە یەقینی هەیە و یەقینەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ! لە سەرەنجامەکان تێ دەگات و عەقڵی سوودی پێ ناگەیەنێ!

## ٣٥١- هیمه‌تی به‌رز

هه‌ر كه‌سێك هیمه‌تێكی به‌رزی پێدرا به‌ ئه‌ندازه‌ی به‌رزییه‌كه‌ی ئازار ده‌چێژێ!

هه‌روه‌كوو شاعیر ده‌ڵێ:

وإذا كانت النفوسُ كباراً    تعبت في مُرادها الاجسامُ

ئه‌گه‌ر نه‌فسه‌كان گه‌وره‌ بوون ئه‌وا جه‌سته‌كان له‌ مه‌به‌ست و ئامانجه‌كانی ماندوو ده‌بن.

یه‌كێكی تر وتوویه‌:

ولكلِّ جسمٍ في النحولِ بليّة    وبلاءُ جسمي من تفاوت همّتي

هه‌موو جه‌سته‌یه‌ك له‌ لاوازیدا به‌ڵا و گرفتی هه‌یه‌، به‌ڵای جه‌سته‌ی من له‌ جیاوازیی هیمه‌تیه‌تی.

ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌و كه‌سه‌ی هیمه‌تی به‌رز بێت هه‌موو زانسته‌كانی گه‌ره‌كه‌ و ته‌نها به‌ هه‌ندێكیان واز ناهێنێ و له‌ هه‌ر زانستێك داوای ئه‌وپه‌ڕه‌كه‌ی ده‌كات، ئه‌وه‌ش جه‌سته‌ به‌رگه‌ی ناگرێ.

پاشان پێی وایە مەبەست کارکردنە بۆیە هەوڵی شەونوێژ و ڕۆژووی ڕۆژ دەدا، جا کۆکردنەوەی نێوان ئەوە و زانست سەختە.

پاشان پێی وایە دەبێ دەسبەرداری دونیا بێت و پێویستی بە هەندێ شتیش دەبێ کە ناچارییە و حەز لە باودان (إیثار) دەکات و توانای ڕەزیلی کردنی نییە و بەخشندەیی داوای بەخشینی لێ دەکات و نەفسبەرزی ڕێگری لە کەسب و کاری لە ڕێگای نزمی لێ دەکات، ئەگەر لەسەر تەبیاتی خۆی لە بەخشندەیی ڕۆیشت ئاتاج و هەژار دەبێ و جەستە و خێزانەکەی کاریگەر دەبن، ئەگەر دەستی قووچاند تەبیاتی ڕازی نابێ.

بەگشتی، ئاتاجی مەینەتی و کۆکردنەوەی دژەکان دەبێ، هەمیشە لە ماندووبوونی بێ بڕانەوە و ناکۆتادایە.

پاشان ئەگەر دڵسۆزی لە کارکردندا هێنایەدی ئەوا ماندوێتی زیاد و نەخۆشی بەهێز دەبێ.

ئەو لە کوێ و کەسی هیممەتنزم لەکوێ؟!

ئەگەر فەقیە بێت و لە فەرموودەیەك پرسیاری لێ کرا و گوتی: نایزانم! ئەگەر فەرموودەناس بوو لەبارەی پرسێکی فیقهییەوە پرسیاری لێ کرا و وتی: نازانم! باکی نەبێ بەوەی پێی بگوترێ: کەمتەرخەم!!

هیممەتبەرز کەمتەرخەمی لە هەندێ زانست بە حەیاچوون دادەنێ، عەیبوعاری ئاشکرا بووە و خەڵك عەورەتیان دیوە.

هیممەتکورت بایەخ بە منەتی خەڵك نادات و داوا لێ کردنیان بە ناشیرین نابینێ و لە ڕەتدانەوە خۆ ناپارێزێ! هیممەتبەرز ئەوە هەڵناگرێ. بەڵام ماندووبوونی هیممەتبەرز لە واتادا ئیسراحەت و پشوودانە، ئیسراحەتی هیممەتکورت ماندووبوون و عەیبەیە ئەگەر تێگەیشتن هەبێ.

دونیا خانەی پێشبڕکێیە بەرەو بەرزاییەکان، پێویستە خاوەن هیممەت کەمتەرخەمی لە غاردان نەکات، ئەگەر پێش کەوت ئەوا ئەوە مەبەست و ئامانجەکەیە، ئەگەریش وێڕای هەوڵ و کۆششی، ئەسپەکەی ساتمەی کرد ئەوا سەرکۆنە ناکرێ.

## ٣٥٢- لەخۆڕازیبوون

موسیبەتی گەورە ئەوەیە مرۆڤ لە خۆی ڕازی و بە زانستەکەی قایل بێت! ئەمە بەڵا و مەینەتییەکە تووشی زۆربەی خەڵك بووە:

یەهودی یان مەسـیحی دەبینـی پێـی وایـە ئـەو لەسـەر ڕێـی ڕاسـتە و ناکۆڵێتـەوە و سـەیری بەڵگـەی پێغەمبـەرێتیی پێغەمبـەرمان (صـلی الله علیـە وسـلم) ناکـات، ئەگەریش شتێکی بیست کە دڵی نـەرم دەکـات وەکوو قورئـان ئـەوا ڕادەکـات بـۆ ئەوەی نەیبیستیّ!

هەروەها هەموو خاوەن ئارەزوویەك کە لەسەری جێگیر بـووە جـا یـان لەبەرئـەوەی مەزهەبی باوك و کەسوکاریەتی یان لەبەرئـەوەی یەکـەم سـەرنج تێـی ڕوانیـوە و بـە ڕاسـتی زانیـوە و سـەیری ئـەوی دیکـەی نـەکردووە کـە هاودژیـەتی و لـە زانایـانی نەکۆڵیوەتەوە تا هەڵەکەی بۆ ڕوون بکەنەوە!

لەمەش حاڵی ئەوانەی لـە دژی ئیمـامی عـەلی مـیری ئیمانـداران دەرچـوون و ناویـان لێنرا (خەواریج)، ئەو کارەی خۆیان بـە بـاش زانـی و نەگەڕانـەوە لای ئـەو کەسـەی دەزانیّ، کاتیّ ئیبن عەبباس تووشیان بـوو هەڵەکـەی بـۆ ڕوون کردنـەوە دوو هـەزار کەس وازیان لە مەزهەبەکە هێنا.

یەکێك لەوانەی لە ئارەزووەکەی پەشیمان نەبوویەوە (ئیبن مەلجەم) بوو، پێی وابوو مەزهەبەکەی هەق و ڕاستە، کوشتنی میری ئیمانداران حەڵاڵ کرد و بە دینی زانی، تەنانەت کاتێ ئەندامەکانی بڕدرا لاری نەبوو، بەڵام کاتێ داواکرا زمانی ببڕدرێ نیگەران بوو و گوتی: چۆن ساتێك لە دونیا بە بێ یادی خوا بمێنم؟! وێنەی ئەمە دەرمانی نییە!

هەروەها حەجاج دەیگوت: سوێند بە خوا ئومێدی خێر و چاکەم نییە تەنها دوای مردن نەبێ!

ئەمە قسەیەتی و چەندان کەسی کوشت کە کوشتنیان دروست نەبوو وەکوو سەعیدی کوڕی جوبەیر.

گێڕدراوەتەوە کە لە بەندیخانەی حەجاجدا سی و سێ هەزار بەندکراو هەبوو، لەسەر هیچ یەکێکیان سزای دەسبڕین و کوشتن و لەداردان نەبوو، هەموویان بێتاوان بوون.

وتم: سەرجەم دەسەڵاتداران دەکوژن و دەبڕن بە گومانی ڕەوابوونی ئەوە! ئەگەر لە زانایانیان پرسیبایە بۆیان ڕوون دەکردنەوە.

هەموو ڕەشۆکییان بە پشتبەستن بە لێخۆشبوون تاوان و گوناه دەکەن و سزا لەبیر دەکەن!

هەیانە پشت بەوە دەبەستیٚ کە من لە ئەهلی سوننەتم یان چاکەگەلێکم هەیە سوودیان دەبیٚ، هەموو ئەمە بە هۆی بەهێزیی نەزانییەوەیە.

پێویستە مرۆڤ لە زانین و ناسینی بەڵگە باش بێت و گومانی نەهێڵێت و بە زانستی خۆی متمانە نەکات..

داوا لە خوای گەورە دەکەین لە هەموو دەرد و ئافەتەکان سەلامەتمان بکات.

## ٣٥٣- سەرەنجامی تاوان

بزانە پاداشت و سزا لە بۆسە و چاوەڕوانیدایە جا باش بێت یان خراپ. ئەوە جۆرێکە لە فریوخواردن کە گوناهبار گومان ببات ئەگەر سزای نەدیت چاوپۆشی لێ کراوە و بەخشراوە، ڕەنگە دوای ماوەیەك سزاکە بێت، زۆر کەم ڕوویداوە کەسێك گوناهێکی کردبێت ئیللا سزاکەی بۆ هاتووە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ (النساء: ١٢٣) واتە: هەر کەسێك کردەوەیەکی خراپ بکات سزاکەی وەردەگرێت.

ئەمە ئادەم، پاروویەکی خوارد، ئیتر دەزانن چی بەسەرهات.

(وەهب کوڕی مونەببیه) وتوویە: خوای گەورە سروشی بۆ ئادەم کرد و فەرمووی: ئایا تۆم بۆ خۆم دروست نەکرد و لە خانەی خۆم نیشتەجێم نەکردیت و وام لە فریشتەکان نەکرد کڕنووشت بۆ ببەن؟! تۆش سەرپێچیی فەرمانی منت کرد و پەیمانی منت لەبیرچوو؟! سوێند بە گەورەیی و شکۆمەندیی خۆم، ئەگەر هەموو زەوی پڕ بکەم لە هاوشێوەی تۆ، شەو و ڕۆژ خواپەرستی و تەسبیحات بکەن پاشان سەرپێچیم بکەن ئەوا حیسابی سەرپێچیکار و تاوانبارانیان بۆ دەکەم.

ئیتر جیبریل تاجەکەی لەسەر داکەند و میکائیلیش چەپکە گوڵەکەی لە نێوچەوانی کردەوە و پێشەسەری گرت و ناردرایە سەر زەوی، ئادەم سێ سەت ساڵ لەسەر چیای هیند گریا، فرمێسکەکانی لە دۆڵی چیاکان دەڕۆیشت، بەو ئەسرینانە ئەم درەختە پاك و بۆنخۆشانە شین بوون.

هەروەها داوود سڵاوی خوای لێ بێت، نەزەرێکی کرد بووە هۆی سەرزەنشتکردن و گریانی بەردەوام، تا ئەوەی بە هۆی فرمێسکەکانیەوە گژوگیا شین بوو.

هەروەها سولەیمان سڵاوی خوای لێ بێت خەڵکێك سکاڵایان بردە لای و ئەویش ئارەزووی لەگەڵ یەکێك لە نەیارەکان بوو، ئیتر لەسەر ئەمە سزادرا و لەبەرچاوی خەڵکدا گۆڕا و دەیگوت: خواردنم بدەنێ بەڵام کەس هیچی پێ نەدەدا.

یەعقووب دەوترێ: لەبەر چاوی دایکی گوێلکێکی سەربڕی، بە دابڕانی یوسف سزادرا.

یوسف لەبەر هیممەت سزادرا ﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ﴾ (یوسف: ٢٤)، هەر یەکێك لە براکانی دوازدە کوڕیان بوو ئەو لەبەر ئەو هیممەتە کوڕێکی کەمتر بوو.

پێغەمبەر ئەییووب، لە پێناو ئەسپێك کە لە لای بوو، لە نکوڵیکردن لە پاشایەکی ستەمکار کەمتەرخەمی کرد بۆیە تاقیکرایەوە.

(ئەم باسوخواسانە هەموویان بەشێکن لە ئیسرائیلییات و بنچینەی ڕاست و دروستیان نییە و نابێ مرۆڤ خۆیانی پێوە مەشغوول بکات، هەندێکیشیان شیاوی پایەی پێغەمبەرێتی نین).

یونس بە بێ ئیزنی خوای گەورە گەلەکەی بەجێهێشت، بۆیە ماسییەکە قووتی دا.

خوای گەورە سروشی بۆ ئەرمیا کرد: گەلەکەت ئەو فەرمانەی بە هۆیەوە ڕێزم لە باووباپیرانیان گرت تەرك کردووە، سوێند بە گەورەییی خۆم، سەربازگەلێکیان لە دژ دەجوولێنم کە بەزەییان بە گریانیاندا نەیەتەوە. وتی: خودایە! ئەوان نەوەی خۆشەویستت ئیبراهیم و نەتەوەی هەڵبژێردراوت مووسا و گەلی پێغەمبەرت داوودن. خوای گەورە سروشی بۆ کرد: بە هۆی گوێڕایەڵیکردنمەوە ڕێزم لە ئیبراهیم و مووسا و داوود گرت، ئەگەر سەرپێچیم بکەن حیسابی سەرپێچیکارانیان بۆ دەکەم.

خواپەرستێك سەیری کەسێکی جوانی کرد، شێخەکەی وتی: ئەم سەیرکردنە چییە؟! سەرەنجامەکەی دەبینی.. دوای چل ساڵ قورئانی بیرچوویەوە.

یەکێکی تر وتی: بە هۆی کەوتنی هەندێ ددانیەوە عەیبم لە کەسێك گرت! ددانەکانم هەڵوەران! سەیری ژنێکم کرد کە بۆم حەڵاڵ نەبوو، کەسێکی تر تەماشای ژنەکەمی کردەوە کە نەمدەویست!

یەکێك لە باوکی دا و بەرەو شوێنێك ڕایکێشا، باوکەکە وتی: تا ئێرە بەسە! منیش تا ئێرە باوکم ڕاکێشا!

ئیبن سیرین وتی: تانەی مایەپووچبوونم لە پیاوێك دا، خۆم مایەپووچ بووم!

نموونەی ئەمانە زۆرن.

لەو شتە زۆر سەیرانەی بیستوومە ئەوەیە کە لەبارەی (ئیبن حەصیر)ی وەزیرەوەیە کە بە (ئەلنیزام) ناسراوە: خەلیفە (ئەلموقتەفی) لێی توورە بوو و فەرمانی کرد دە هەزار دیناری لێ وەربگیرێت، کەسوکارەکەی بە خەمبارییەوە چوونە لای و پێیان وت: ئەو دە هەزار دینارە لەکوێ دێنیت؟! وتی: نە دە و نە پێنج و نە چوار هەزارم لێ وەرناگرێ! وتیان: بە چیڕا دەزانی؟ وتی: ئەمن ستەمم لە پیاوێك کرد و سێ هەزار دینارم سزادا و لێم سەند، زیاتر لەوە لێم ناسەندرێ... کاتێ سێ هەزار دینارەکەی دا، خەلیفە ئازادکردن و لێبووردنی لەوەی تر واژۆ کرد.

من لەبارەی خۆمەوە دەڵێم: تووشی هەر ئافەت یان خەم یان دڵتەنگییەك بوویم ئیللا بە هۆی هەڵە و خلیسکانێکەوە بووە کە دەیزانم، تەنانەت دەتوانم بڵێم: ئەمە بە هۆی ئەو شتەوە بووە. ڕەنگە دواتر تەئویلم کردبێت و سزاکەم دیوە.

پێویستە مرۆڤ چاوەڕێی ئەنجامی گوناهەکان بکات، زۆر کەم ڕوودەدات لێی سەلامەت بێت.

با لە تەوبەکردن کۆشش بکات، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((هیچ شتێك هێندە خێرا ناگات لە چاکەیەکی نوێ بە گوناهێکی کۆن)).. لەگەڵ تەوبەکردن لە گرتن دەترسێ و چاوەڕێی دەکات، خوای گەورە لە پێغەمبەران خۆش بوو، لە فەرموودەی شەفاعەدا هاتووە ئادەم دەڵێ: گوناهەکەم، ئیبراهیم و مووسا دەڵێن: گوناهەکەم...

ئەگەر یەکێك وتی: ئایەتی خوا: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ (النساء: ١٢٣) واتە: هەر کەسێك کردەوەیەکی خراپ بکات سزاکەی وەردەگرێت... هەواڵە و وا دەخوازێ کە لە گوناهکار خۆش نەبێت، ئێمەش زانیومانە کە تەوبە و چاوپۆشین لە هەڵەکاران قەبووڵ دەکرێ؟!

وەڵامەکە لە دوو ڕوویەوە:

یەکەم: وەها لێکبدرێتەوە کە ئەمە بۆ کەسێکە لەسەر تاوان بەردەوام بوو بێت و تەوبەی نەکردبێت، چونکە تەوبە هەموو ئەوانەی پێش خۆی دەسڕێتەوە.

دووەم: بە ڕەهاییە، ئەوەش ئەمن لایەنگری دەکەم و هەڵیدەبژێرم و بە نەقڵ و واتاوە بەڵگەی بۆ دێنمەوە: سەبارەت بە نەقڵ، کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ئەبوو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا لە بەرانبەر هەر کارێك سزا وەردەگرین؟ فەرمووی: ئایا نەخۆش ناکەویت؟ ئایا خەمبار نابیت؟ تووشی دەستەنگی نابیت؟ ئەمە ئەوەیە کە پێی سزا دەدرێن.)) حسن رواه الترمذی و أحمد وابن حبان و الحاكم...

سەبارەت بە واتاشەوە، ئیماندار ئەگەر تەوبەی کرد و پەشیمان بوویەوە، خەم و خەفەتی بەردەوامی لەسەر گوناهەکەی لە هەموو سزایەك بەهێزترە.

واوەیلا بۆ ئەو کەسەی تاڵیی سزای بەردەوامی زانیوە پاشان چێژی ساتێکی سەرپێچی هەڵبژاردووە!

## ٣٥٤- مخابن بۆ کەمتەرخەمییەکانم

ڕۆژێکیان وەکوو لێکۆڵەرێك بیرم لە نەفسی خۆم کردەوە، بەر لەوەی موحاسەبە بکرێ لێپرسینەوەم لەگەڵ کرد، بەر لەوەی بکێشرێت کێشام، لوتف و بەزەیی خواییم دیت:

لە منداڵییەوە تا ئێستا لوتف دوای لوتف، داپۆشینی ناشیرینی، لێخۆشبوون لەوەی شیاوی سزایە دەبینم، لە بەرانبەر ئەوەشدا تەنها سوپاسگوزاریی زارەکییم دیتووە !

بیرم لە هەڵەکان کردەوە، ئەگەر بە هەندێکیان سزادرابام ئەوا بەخێرایی لەناودەچووم، ئەگەر هەندێکیان بۆ خەڵك ئاشکرابایە ئەوا شەرمم دەکرد...لە کاتی بیستنی ئەمە کەس وا باوەڕ نەکات کە ئەمانە لە تاوانە گەورەکان بوون تا ئەو گومانەی لە لەرێلادەرانی هەیە لە منیشی بکات، بەڵکوو ئەمانە بە نیسبەتی من گوناهگەلێکی ناشیرین بوون کە بە تەئویلاتێکی گەند و بەد ڕوویان دا... وام لێ هاتووە کە دوعا دەکەم بڵێم: خودایە ! بە ستایش و داپۆشینمت، لێم خۆشبە !

پاشان داوام لە نەفسم کرد لەسەر ئەوە سوپاسگوزار بێت وەکوو پێویست نەمدیت. پاشان مەبەستەکانم سکاڵای قەدەر دەکەن و داوای ئارامگرتن لەسەر ناخۆشی یان سوپاسی نیعمەت لە نەفسم ناکەم.

ئیتر دەستم کرد بە شین و گریان لەسەر کەمتەرخەمیم لە سوپاسکردنی خودای نیعمەتبەخش و هەروەها لەوەی کە چێژ لە وەدەسهێنانی زانستی بێ کارپێکردن وەردەگرم! ئەمن ئومێدی پلەوپایەی گەورانم هەبوو، تەمەن ڕۆیشت و مەبەستەکە نەهاتەدی!! دیتم (ئەبوو ئەلوەفائیبن عەقیل) وەکوو من شین و گریانی کردووە، گریانەکەیم بەدڵ بوو، لێرە نووسیمەوە...بە نەفسی وت: ئەی گەمژە! واژەکان ڕاست دەکەیتەوە تا پێت بگوترێ: مشتومڕکار!! بەرهەمی ئەمەش ئەوەیە بگوترێ: ئەی مشتومڕکار! هەروەك بە زۆرانباز دەوترێ ئازا و چالاك و لێهاتوو.

بەڕێزترین و بەنرخترین شتی لای ژیرانت — کە ڕۆژانی تەمەنە — بەفیڕۆدا تا ئەوەی ناوت وەکوو مشتومڕکار بڵاوبوویەوە، پاشان کە دڵەکان ڕزی بوون و نەمان یادکەر و یادکراویش لەبیر دەچنەوە! ئەمە ئەگەر درەنگ مردیت، بەڵکوو لاوێکی لە تۆ چالاکتر و کارامەتر پەیدا بوو و پێ گەیشت، بۆیان ڕازاندەوە و ناوەکە بۆ وی بوو!! ژیرانیش لە خوا بێئاگا و مەشغوول بوون بەوەی ئەگەر مردن یاد و باسیان زیندووە بکاتەوە ئەویش کارکردنە بە زانست و سەیرکردنی پاکی نەفسیانە.

ئۆف بۆ نەفسم! ژمارەیەك بەرگ کتێبم لە جۆرەها زانست نووسی و هیچ فەزیلەتێکی پێوە نەنووسا، ئەگەر مشتومڕم کرد، بەرز دەبێ، ئەگەر ئامۆژگاری کرام خۆ بە گەورە دەگرێ، ئەگەر دونیا دەرکەوت وەکوو باڵندە بۆی دەفڕێ و

چەشنی قەلەڕەش دەنیشێتە سەر کەلاك! خۆزگە هەروەکوو کەسێکی ناچاری مردووخواردن لە دونیای ببردایە! ئەگەر مەبەستێکی نەهاتەدی بێزار دەبێ، ئەگەر نیعمەتی پێدرا ئاگای لە نیعمەتبەخش نامێنێ!!

سوێند بە خوا، ئەمڕۆ ئۆف لە من لەسەر زەوی و سبەش لەژێری! سوێند بە خوا، بۆگەنی جەستەم دوای سێ ڕۆژ لەژێر خاکدا کەمترە لە بۆگەنی تەبیات و سوخەتم لەنێو هاوڕێیان!

سوێند بە خوا، لەسەرخۆیی ئەم بەخشندەیە سەراسیمەی کردووم چۆن دامدەپۆشێ و من ئابڕووتکاوی دەکەم و، چۆن کۆمدەکاتەوە و ئەمن پەرشوبڵاو دەبم؟! بەیانیش دەوترێ: گەورەزانای پیاوچاك مرد، ئەگەر بەباشی و وەك خۆم بیانناسیبام ئەوا نەیاندەناشتم!

سوێند بە خوا، وەکوو کەسێك عەیبوعارەکانی بۆ دوژمنانی ئاشکرا بکات ئەوها بانگی نەفسی خۆم دەکەم و وەکوو ئەوانەی بۆ منداڵەکانیان دەگرین ئاوا شین دەکەم، چونکە هیچ شینگێڕێك نییە بۆ ئەم موسیبەتە شاردراوە و ڕەوشتە داپۆشراوانە کە خودای پێزان و ئاگادار دلیپۆشیون.

سوێند بە خوا هیچ خەسڵەتێك بۆ نەفسم نادۆزمەوە کە باش بێت تا پێی بپاڕێمەوە و بڵێم: خودایە! ئەوەم بەوە لێ خۆشبە.

سوێند بە خوا، هەرگیز ئاوڕم نەداوەتەوە ئیللا لە خوداوە چاکەیەکم دەست کەوتووە بەسم بووە و پارێزگارییەکم چنگ کەوتووە لەپاڵ زاڵبوونی دوژمنان

بمپارێزیّ، هیچ پێویستییەك نەهاتۆتە پێش دەستم بۆی درێژ کردبێت ئیللا جێبەجێی کردووە...

ئەمە کردەوەی وییە لەگەڵم و پەروەردگارێکی بێنیازە لێم، ئەمەش کردەوەی منە و بەندەیەکی هەژار و ئاتاجی ئەوم!!

هیچ بیانوویەکم نییە تا بڵێم: نەمزانی! یان بێئاگا بووم و لەبیرم چوو! سوێند بە خوا، ساغ و سەلیم دروستی کردووم و بە ژیری دڵی ڕووناك کردووم تەنانەت نادیار و شاردراوەکان بۆ تێگەیشتنم دەردەکەون.

ئای داخ و خەم لەسەر تەمەنێك لە شتگەلێك بەفیڕۆچوو کە هاوڕێکی ڕەزامەندی نەبوو! ئای لە بێبەشبوونم لە پلەوپایەی پیاوانی ژیر! ئای داخ و پەژارە لەسەر ئەو کارانەی بۆ خودام نەکردن و کەمتەرخەمیم کرد و دوژمن بە شکستم شادمان بوو! ئای لە بێهیواییی ئەو کەسەی گومانی باشی پێ بردم کاتێ ئەندامەکانی لەشم شایەتییان لە دژی دام! ئای لە کاتی بوونی بەڵگە لە دژم چەندە ڕیسوا و بێ پشت و پەنام!

سوێند بە خوا من کە ژیر و زیرەکم شەیتان گاڵتەی پێ کردم!

خودایە! تەوبەیەکی پاك و خاوێن لەم پۆخڵییانە و هەستانەوەیەکی ڕاستگۆیانە بۆ پاککردنەوەی ئەو خڵتەوپڵتانەی ماون! دوای پەنجا ساڵی بۆ لات هاتووم، زانست هەر دەیەوێت دەستم بەرەو سەرچاوەی بەخشندەیی ببات و هیچ هۆکارێکیشم نییە ئیللا ئاخهەڵکێشان و پەشیمانی نەبێ، سوێند بە خوا، لەبەرئەوە سەرپێچیم نەکردوویت چونکە ئەندازەی نیعمەتەکانتم نەزانیوە، چاکە و بەخشندەییەکانیشم لەبیرنەچووە، ئیتر لە کردەوەکانی ڕابردووم خۆشبە.

# ٣٥٥- ئێرەییی خزمان

دوژمنایەتیی خزمان سەختە، ڕەنگە وەکوو شەڕی (بەکر) و (تەغلەب) کوڕانی (وائیل) بێت، (عەبەس) و (زوبیان) کوڕانی (بەغیز)، (ئەوس) و (خەزرەج) کوڕانی (قەیله). (جاحیز) وتوویە: ئەم شەڕە چل ساڵی زیاتر خایاند.

هۆکاری ئەمە ئەوەیە کە هەر یەکێك لە خزمەکان پێی ناخۆشە خزمەکەی لەو بەرزتر بێت، ئیتر ئێرەیی پێك بردن ڕوویدەدا.

پێویستە کەسێك کە لە سەرووی خزمەکانێتی تەوازوعی بۆیان هەبێت و لەگەڵیان خاکەڕا بێت و بەپێی توانا هەوڵی بەرزکردنەوەیان بدات و لەگەڵیان نەرمونیان بێت بەڵکوو سەلامەت بێت.

پیاوێك بە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) گوت: خزمگەلێکم هەیە سەردانیان دەکەم کەچی پەیوەندیم لەگەڵ دەپچڕێنن؟ فەرمووی: ((وەکوو ئەوە وایە خۆڵەمێشی گەرمیان دەرخوارد بدەیت، تا لەسەر ئەو خووەش بەردەوام بیت ئەوا خودا پەنا و پاڵپشتت دەبێت.)) موسلیم گێڕایتیەوە.

## ٣٥٦- ئاوڕنەدانەوە بە لای حەسوود

سەگەلی شکارم (تانجی) دیت کە ئەگەر بە لای سەگەلی ماڵ و هەواردا تێپەڕیبایە ئەوان پێی دەوەڕین و زێدەڕۆییان دەکرد و بەدوایدا غاریان دەدا وەك ئەوەی ڕێزلێگیراو و شکۆدار بیبینیٚ، لەسەر ئەوە ئێرەیی پیٚ دەبرد! ئەو کات دەمبینی سەگەلی شکار ئاوڕی لیٚ نەدەدایەوە و گرینگی پیٚ نەدەدا و وەڕینەکەی بە هیچ دانەدەنا!

سەگەلی شکارم دیت وەك ئەوەی لە ڕەگەز و جۆری ئەو سەگانە نەبێت چونکە ئەو جەستەگەورەی تێکسمڕاوە ئەمانی نییە، ئەمەش نەرم و نیان و جەستەباریك (تاژی)، ئادابێکی هەبوو کە لەگەڵ ئێسکسووکییەکەیدا گونجابوو، ئەو نێچیرەکە بۆ خاوەنەکەی دەگریٚ لە ترسی سزادان یان بۆ ئەوەی سوپاسێکی دەست بکەوێت.

دیتم ئەدەب و هاوڕێیەتی و هاوژینیی جوان شوێنکەوتەی نیانیی جەستە و پاکیی ڕۆحە.

ئیمانداری عاقڵیش وایە، ئاوڕ ناداتەوە بە لای حەسوود و ئێرەییبەرەوە و بە شتێکی وای دانانیٚ، چونکە ئەم لە دۆڵێکە و ئەویش لە دۆڵێك، ئەو لەسەر دونیا ئێرەیی پیٚ دەبات و ئەمیش خەمی ئاخیرەتیەتی، ئیتر چ دوورییەك لەنێوان دوو دۆڵەکەدا هەیە!

## ٣٥٧- تەسلیمبوون بە حیكمەتی خودا

تێبینیكردن و سەرنجدانی ئەم بەشە لە گرینگترین شتەكانە:

پێویستە ئەوەی باوەڕی بە خوای گەورە هێناوە لە كردەوەكانیدا تەسلیمی ئەو بێت و بزانێت كە ئەو دانا و خاوەندار (حكیم مالك)ە و ئەو گەمە و گاڵتە ناكات، ئەگەر حیكمەتی كردەوەیەكی لێ ون بوو نەزانینەكە بداتە پاڵ خۆی و تەسلیمی دانای خاوەندار بێت، ئەگەر عەقڵ داوای حیكمەتی كردەوەكەی لێ كرد و وتی: بۆم ڕوون نەبۆتەوە، لەسەرم پێویستە بابەتەكە بە خاوەنەكەی بسپێرم.

خەڵكێك بە تەنها عەقڵ ڕوانیانە زۆرێك لە كردارەكانی خوای گەورە وەك ئەوەی لە مەخلووقێكەوە دەرچووبێت بینیان، درایە پاڵ دژی حیكمەت، خودایان دایە پاڵ ئەوە!! ئەمە كوفرێكی پەتیی و شێتییەكی ساردە! پێویستە نەزانین بدرێتە پاڵ خودەكان، عەقڵەكان لە زانینی حیكمەتی خودا ناكامن.

یەكەم كەس كە ئەوەی كرد ئیبلیس بوو، ئەو پێی وابوو خودا قوڕی لە ئاگر پێ باشترە و عەقڵیش پێی وایە ئاگر باشترە، ئیتر ڕەخنەی لە حیكمەتی خودا گرت.

ئـەم بەڵایـە خـەڵکێك لەوانـەی دەدرێنـە پـاڵ زانسـت و زۆرێـك لـە ڕەشـۆکییانی گرتۆتـەوە، چـەندان زانامـان دیـت ڕەخنـە دەگـرێ و ڕەشـۆکییەکیش بەرپـەرچ دەداتەوە و کافر دەکرێ!

ئەم بەڵایە زۆربـەی خـەڵکی گرتۆتـەوە، زانایـەك دەبیـنن ژیـانی لێ تـەنگ دەکرێ و لەڕێلادەرێك بۆی فراوان دەکرێ و دەڵێن: ئەمە شیاوی حیکمەت نییە!!

زانایان زانیویانە کە خوای گەورە زەکـات و خـەراج و جزیـە و دەسـکەوتی جـەنگ و کەففارەتی فەرز کردووە تاوەکوو هەژارانی پێ بێ نیاز بکات کەچـی سـتەمکارەکان دەستیان بەسەردا گرتووە. ئـەوەی زەکاتیشـی لەسـەرە فرتوفێـڵ دەکـات و تـەنها هەندێك لە زەکاتی ماڵەکەی دەردەکات، ئیتر هەژاریش برسی بوو! پێویستە زەمـی ئەم ستەمکارانە بکەین و ڕەخنە نەگرین لەوەی بـڕی پێویسـتی بـۆ هـەژاران دیـاری کردووە.

لـەم چوارچێوەیەشـدا سـزای سـتەمکاران دیـاری کـراوە لـەوەی هـەژارانیان لـە مافەکانیان بێبەش کردووە و هەژارانیش بە ئارامگرتن تاقیکراونەتەوە.

زۆرێـك لـەو ڕەخنەگرانـە لـە کـاتی گیـان دەرچـوون زۆر کـەم سـەلامەت دەبـن لـە ڕەخنەگرتنێك کە بەرەو کوفریان دەبات، ئیتر نەفس بە بێباوەڕی دەردەچێت.

چەندان ڕەشۆکی دەڵێ: فلان گرفتار بووە و شایستەی ئەو تاقیکردنەوەیـە نـەبوو! واتای ئەوەیە شتێکی پێ کراوە کە شیاوی ڕاستی نەبوو!

دۆڕاوێکی بێ ئابڕوو وتوویه:

أيا ربِّ تخلُقُ أقمارَ ليلٍ ... وقضبانَ بانٍ وكثبانَ رملِ
وتنهى عبادَك أن يعشقوا ... فيا حاكمَ الحُكمِ إذا حُكمُ عدلِ

ئـەی پـەروەرێن! هەیڤگـەلی شـەوان و لـق و پـۆپی ئەسـپیندار و گردۆلکـەی لم دەخولقێنیـت کەچـی نـەهی لـە بەنـدەکانت دەکـەیت عاشـق بـن ئـەی دادوەری دادپەروەری خاوەن حوکمی داد؟!

نموونـەی ئەمـە کۆمـەڵێك لـە زانایـان دەیڵـێن و پێیـان جوانـە، ئـەوەش کـوفرێکی پەتییە!!

ئەمانە لە نهێنیی نەهی و واتاکەی نەگەیشـتوون چـونکە نـەهی لـە عیشـق نـەکراوە بەڵکوو نەهی کراوە لە کارکردن بەگوێرە و خواستی عیشـق لـەو شـتانەی قەدەغـەن وەکوو سەیرکردن و دەستلێدان و کردەوەی ناشـیرین...وە خـۆگرتن لـە حـەزلێکراو بەڵگەیـە لەسـەر بـاوەڕ بـە بـوونی نـەهیکار، وەکـوو ئـارامگرتنی تینـوو لـە ئـاو لـە ڕەمەزاندا بەڵگەیە لەسـەر باوەڕ بە بوونی ئەو زاتـەی فـەرمانی بـە ڕۆژوو کـردووە و، تەسـلیمکردنی نــەفس بــۆ کوشــتن و جیهــاد بەڵگەیــە لەســەر بــاوەڕبوون بــە پاداشت...پاشـان جـوانکراو نموونـەی ئەوەیـە کـە ئامـادەکراوە، ئـیتر کـوا عـەقڵی ڕامێن؟!

نەخێر ئەگەر سەرنجی دابایە و کەمێك ئارامی بگرتایە ئەوا زۆر قازانجی دەکرد.

ئەگەر زیاتر ئەو ڕەخنانەی زانایان و ڕەشۆکییان باس بکەم کە دەیزانم ئەوا باسەکە درێژ دەبێتەوە.

باشترین نموونە و حاڵ لەم بارەوە ئەوەیە کە لە (ئیبن ئەلڕاوەندی) دەگێڕنەوە: ڕۆژێکیان زۆر برسی دەبێ، لەسەر پرد دادەنیشێ و برسێتی برستی لێ بڕیوە، ئەسپێکی ڕازاوە بە ئاوریشم و دیباج بەوێدا تێدەپەڕێ، وتی: ئەمە هی کێیە؟ وتیان: هی عەلی کوڕی بەلتەقی بەندە و غولامی خەلیفەیە! دواتر چەندە کەنیزەکێکی جوان بەلایدا تێپەڕین وتی: ئەمانە هی کێن؟ وتیان: هی عەلی کوڕی بەلتەقە! لەو کاتەدا پیاوێك بەوێدا تێپەڕی و دیتی شڕ و شەپرێوە، دوو کولێرەی بۆ فڕێدا، ئەویش هەڵیگرتنەوە و تێی هەڵدان و وتی: ئەمە بۆ عەلی کوڕی بەلتەق و ئەم دووانەش بۆ من؟! ئەو نەزانی گەمژەیە لەبیری چوو کە بە هۆی ئەو قسانەی دەیکات و ئەو ڕەخنانەی دەیگرێت و ئەو ڕەفتارانەی دەینوێنێ شیاوی ئەم برسێتییەیە.

ئەی ئەوانەی ڕەخنە لە زاتێك دەگرن کە هیچ نەنگییەك لە ڕەفتاریدا نییە و ئێوەش لەوپەڕیی کەموکورتیدان! ئێوە سەرەتا لە ئاو و قوڕ بوون، دووەم جار لە ئاوێکی سووك و بێنرخ، پاشان بەردەوام پیسایی هەڵدەگرن، ئەگەر هەواتان لێ بگیرێتەوە دەبنە کەلاکی بۆگەن، کەسە ژیرەکەتان چەندان بۆچوونی هەیە کە ئەگەر خراپە بەردەم کەسانی تر ئەوا ناشیرینیی ڕاوبۆچوونەکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە، پاشان گوناهەکانتان لە ڕادە بە دەرە، هیچتان نەماوە جگە لە ڕەخنەگرتن لە خاوەنداری دانا؟!

ئەگەر لەم بەڵایانە هیچ نەبێت جگە لەوەی تەسلیمبوونمان لێ بویستڕێت ئەوا بەسە.

ئەگەر خودا خەڵقی بۆ ئەوە دروست کرد تا بوونی بدۆزنەوە پاشان لەناوی بردن و زیندووی نەکردنەوە ئەوا مافی خۆیەتی چونکە خۆی خاوەنداره، بەڵام بە فەزڵ و بەخششی خۆی بەڵێنی زیندووکردنەوە و پاداشت و مانەوەی هەمیشەیی لە بەهەشتی داوە.

هەر کاتێ شتێك ڕوویدا کە هۆکارەکەی نەزانیت ئەوا ئەوە بۆ کەموکورتیی زانستەکەت بگەڕێنەوە.

کەسێك دەبینی بە ستەم کوژراوە و چەندان کەسی کوشتووە و ستەمی لە چەندانی تر کردووە تا ئەوەی بە هەندێك لە تاوانەکانی سزادرا.

زۆر کەم ڕوودەدات کەسێك تووشی دەردێك ببێت ئیللا شایستەیەتی، بەڵام ئەو دەردانەی سزای لەسەر دراوە لە ئێمە ونە و ئێمە تەنها سزاکەمان بینیوە.

## ٣٥٨- ڕۆژی جەژن بچووککراوەی قیامەتە

ڕۆژی جەژن خەڵکم دیت و حاڵەکەم بە قیامەت چواند:

ئەوان کاتێ لە خەو هەستان وەکوو چۆن مردوو لە گۆڕەکانیان دێنەدەر ئەوها بۆ جەژنەکانیان دەردەچن.

هەیانە ئەوپەڕی خۆی ڕازاندۆتەوە و هەیانە مامناوەند و هەیانە شەپڕێو.

لە ڕۆژی قیامەتیش حاڵی خەڵك ئاوایە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾ (مریم: ٨٥ – ٨٦) واتە: ڕۆژێك دێت ئێمە دەستە دەستە خواناس و پارێزکاران بۆ لای خوای میهرەبان بە ڕێ دەکەین (تا بەدیداری شادبن و بیانخاتە بەهەشتەوە).

تاوانبار و گوناهکارانیش بەپەلە و بەتینویەتی ڕابێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ.

مەبەست لە (وفدا) واتە بەسواری..

پێغەمبەر فەرموویەتی: ((خەڵك بە سواری و بەپیادە و لەسەر ڕوویان حەشر دەکرێن.)) صحيح رواه أحمد و الترمذي و الحاكم.

خەڵك هەیە لە قەرەباڵغیی جەژن دەکەونە بن دەستوپێیان، ستەمکارانیش بە هەمان شێوە خەڵك لە ڕۆژی قیامەت بە پێیان بەسەریان دەکەون.

خەڵك هەیە لە ڕۆژی جەژندا بێنیاز و دەوڵەمەندی خێرکەرە، هەروەها لە ڕۆژی قیامەتیش ئەهلی چاکە لە دونیا، لە ئاخیرەتیش هەر ئەهلی چاکەن.

هەیانە هەژارە و داوای دەکات پێی بدرێت، ڕۆژی قیامەتیش هەروایە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((شەفاعەتەکەم بۆ ئەهلی تاوانە گەورەکان ئامادە کردووە.)) صحیح رواه أحمد و أبو داوود و الترمذي.

هەیانە سۆز و بەزەیی بۆ نییە ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ۝١٠٠ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ (الشعراء: ١٠٠ - ١٠١) واتە: نە تکاکارمان هەیە و نە هاوڕێیەکی گەرموگوڕ و باش.

لە جەژندا ئاڵاکان بڵاو کراونەتەوە، لە ڕۆژی قیامەتیش ئاڵای لەخواترسان هەروایە و کەڕەنا لێ دەدرێ. حاڵی بەندە ڕادەگەینرێ و دەوترێ: ئەی ئەهلی هەڵوێست! فلان کەس وەها خۆشبەخت بووە کە هەرگیز بەدبەختی و ناخۆشی نابینێ، وە فیساریش وەها بەدبەخت و چارەڕەش بووە کە هەرگیز بەختەوەری نابینێ.

پاشان بە تایبەتەکانەوە دەگەڕێنەوە بۆ دەروازەی کۆشك و هەواڵی گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکان دەگەینن: ﴿أُولَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۝١١﴾ (الواقعة: ١١) واتە: ئەوانە نزیکن..واژۆکردنیان بۆ دەردەچێت: ﴿وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ۝٢٢﴾ (الإنسان: ٢٢) واتە: هەوڵ و کۆششەکانتان شیاوی سوپاسە..

ئەوەی لە خوار ئەوانەوەیە حاڵی جیاوازە: هەیانە دەگەڕێتەوە ماڵێکی ئاوەدان ﴿هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ۝٢٤﴾ (الحاقة: ٢٤) واتە: بە هۆی ئەو کردەوانەی لە ڕۆژانی ڕابردوو کردووتانە.

هەیانە مامناوەندە و هەیانە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێکی چۆڵ.

﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ۝٢﴾ (الحشر: ٢) واتە: ئەی خاوەن بیروهۆش و دووربینەکان دەرس و پەند و ئامۆژگاری وەربگرن.

## ٣٥٩- ئامۆژگاری بۆ زانا و زاهیدان

گەلۆ! زانیوتانە کە کردەوەکان بەپێی نیاز و نییەتەکانە، لەم ئایەتەش تێ گەیشتوون: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ﴾ (الزمر: ٣) واتە: دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە..

لە پێشینانتان بیستووە کە ئەوان هیچ ڕەفتار و گوفتارێکیان نەدەکرد تا نییەت و نیازیان پاك و ڕاست و دروست دەکرد.

ئەی فەقیهان: ئایا زەمان و کاتتان لە دەمەقاڵە و هاتوهاوار بەسەردەچێت و لە کاتی کۆبوونەوەی ڕەشۆکییاندا دەنگتان بەرز دەبێتەوە بە مەبەستی زاڵبوون؟! نەتانبیستووە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((هەر کەسێك زانست بخوازێت بۆ ئەوەی لە کن زانایان شانازی پێوە بکات و خۆی هەڵکێشێ یان دەمەقاڵە و مشتومڕی نەفامانی پێ بکات یان خەڵك بەرەو لای خۆی ڕاکێشێت ئەوا بۆنی بەهەشت ناکات.)) حسن رواه ابن ماجه و ابن حبان.

پاشان یەکێکتان بۆ فەتوادان سینگی دەردەپەڕێنێ و ئەهلی ئەم کارەش نییە، پێشینان فەتوادانیان لە خۆ دووردەخستەوە.

ئـــەی کۆمـــەڵی زاهیـــدان! خـــودا نهێنـــی و شـــاراوە دەزانـــیٚ! ئایـــا لـــە جلوبەرگـــەکانتان هـــەژاری و دامـــاوی دەردەخـــەن و ئارەزووەکـــانی نەفســـیش بەتێروتـــەواوی وەردەگـــرن و ســـەرکزی و گریـــان لـــە کـــاتی ئاشـــکرادا دەردەخـــەن و لـــە تەنیاییشـــدا وەهـــا نـــین؟! ئـــیبن ســـیرین قاقـــا پـــیٚ دەکـــەنی، کـــە بەتـــەنیا دەبـــوو زۆربـــەی شـــەو دەگریـــا. ســـوفیان بـــە هاوڕێکـــەی وت: چـــەند بـــیٚ ڕوویـــت! نوێژ دەکەیت و خەڵك دەتبینیٚ؟!

مخابن بۆ ڕیاکار لە ڕۆژێکدا﴿وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ﴾ (العاديات: ١٠) هەموو شتێکی ناو دڵەکان ئاشکرا دەبێت کە نییەت و نیازەکانە.

لە مەستیتان بەئاگا وەرنەوە و لە تاوانەکانتان تەوبە بکەن و لەسەر ڕیٚ بە ڕاست و دروستی بڕۆن: ﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ﴾ (الزمر: ٥٦) واتە: نەوەکوو یەکێك بڵێت: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادان و نادروستییانەی کە کردم لە فەرمان و بەرنامەی خوادا.

## ٣٦٠- ڕێبازی پێشینان

دیتم زۆربەی خەڵك لە شەریعەت لایانداوە و لەسەر ئەو خوو و عادەتە دەڕۆن کە دەقیان پێوە گرتووە، ڕەنگە دوو کۆمەڵ لێیان ڕزگار بن: زانایان و خواپەرستان..

سەرنجی زانایانم دا دیتم لە تێکەڵ و پێکەڵیدان:

هەیە تەنها گرینگی دەدات بە مامەڵەکانی دونیا و پشت لە مامەڵەکانی ئاخیرەت دەکات: یان لەبەرئەوەی لەبارەیەوە نازانێ یان لەبەرئەوەی لەسەر شانی قورسە، ئەو" ئەوەی زانست پێویستی دەکات و پێی قورسە لەسەری ناڕوات و لەوانیتریش دەبێتە شوێنکەوتەی خوو و عادەت! ڕەنگە خەیاڵ بکات کە لە هەڵەکان چاوپۆشییان لێ دەکرێت لەبەرئەوەی زانایە و لەبیری چۆتەوە کە زانست بەڵگەیە بەسەریەوە.

هەیانە لەگەڵ شێوەی زانست دەوەستێ و لە مەبەستی زانست بێئاگایە. هەیانە تێکەڵی دەسەڵاتدار دەبێ و بەو گوناه و ستەمەی دەیبینێ ئازاری پێ دەگات و ناتوانێ نکوڵی بکات و ڕەنگە ستایشیش بکات! هەروەها

ڕەشۆکییانیش ئازاریان پێ دەگات و دەڵێن: ئەگەر کاری سوڵتان ڕاست و لە شەریعەت نزیك نەبووایە ئەم زانایە تێکەڵی نەدەبوو!

ئەشرافەکانم دیت متمانە بە شەفاعەتی باووباپیرانیان دەکەن و لەبیریان دەچێتەوە کە یەهوود لە نەوەی ئیسرائیلن!

سەبارەت بە کۆمەڵی دووەم کە خواپەرست(عابید)ەکانن، دیتم زۆربەیان لە تێکەڵ و پێکەڵیدان:

ئەوانەیان کە مەبەست و نیازیان ڕاستە زۆربەی کاریان لەسەر ڕاستەڕێ نییە: کۆمەڵێك لە پێشینان (المتقدمین) کتێبگەلێکیان بۆ داناون کە شتی شاراوەی ناشیرین و فەرموودەی ناڕاستی تێدایە و تێیدا فەرمان بە شتگەلێك دەکەن کە پێچەوانەی شەریعەتە، وەکوو کتێبەکانی (الحارث المحاسبي) و (أبی عبدالله الترمذی) و (قوت القلوب)ی (أبي طالب المکي) و کتێبی (إلاحیاء )ی (أبي حامد الطوسي)، ئەگەر کەسی سەرەتا چاوی کردەوە و هەوڵیدا بەم کتێبانە ڕێگاکە بگرێتەبەر ئەوا بەرەو هەڵە و گوناهی دەبەن، چونکە بیروباوەڕیان لەسەر فەرموودەی لاواز بنیات ناوە.

زەمی دونیا دەکەن و نازانن چ شتێکی زەمکراو و خراپە؟ کەسی سەرەتا وادەزانێ زەمی خودی دونیایە، دابڕاو لە دونیا بەرەو چیاکان ڕادەکات و ڕەنگە نوێژی جەماعەت و هەینی لەدەست بچێت، تەنها بەڕوو و هەرمێ (کرۆسك) دەخوات و تووشی قۆڵۆن دەبێ، هەندێکیان بە خواردنەوەی شیر

قەناعەت دەکات و تەبیاتی سیس دەبێ، یان پاقلە و نیسك دەخوات و سکی تووشی قۆرەقۆر دەبێ!!

پێویستە ئەوەی حەج دەکات گرینگی بە وشترەکەی بدات بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بگات، ئەی نابینی کەسی ژێری تورکەکان بەر لەوەی خواردنی خۆی پەیدا بکات بایەخ بە ئەسپەکەی دەدات؟!

ڕەنگە چیرۆکخوێن باسی حاڵوباری خەڵکێك لە پێشینان و زاهیدان بکات و موریدیش شوێنیان بکەوێت و بەوە ئازار بخوات! هەر کاتێ ئەم قسەیەمان ڕەتکردەوە و هەڵەی بکەرەکەمان ڕوون کردەوە نەفامان دەڵێن: ئایا بەرپەرچی زاهیدان دەدەیتەوە؟! بەڵکوو پێویستە شوێنی ڕێی ڕاست بکەوین و سەیری ناوی ئەو کەسانە نەکەین کە لە دڵەکاندا گەورە کراون، ئێمە دەڵێین: ئەبوو حەنیفە وتی، پاشان شافیعی پێچەوانەی وی دەڵێ! پێویستە شوێن بەڵگە بکەوین.

(ئەلمەروزی) وتی: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ستایشی هاوسەرگیری کرد، پێم وت: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتوویەتی...هاواری کرد و گوتی: کەوتووینەتە نێو ڕێچکۆرە و بزنەڕێیانەوە! پێویستە پابەندی ئەوە بیت کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی لەسەری بوون.

ئەحمەد لەبارەی (الحارث المحاسبي) قسەی کردووە و ڕەتی (سەری ئەلسەقیتی) داوەتەوە کاتێ وتوویە: کاتێ خودا پیتەکانی دروست کرد

(ئـەلیف) ڕاوەسـتا و (بـاء)یـش کرنووشـی بـرد! گـوتی: خـەڵکی لێ دوورخەنەوە.

هەق نابێ موجامەلە بکات چونکە ئەو ڕەسەن و پایەدارە.

مـن دەبیـنم زۆربـەی خـەڵك لـە شـەریعەت لایانـداوە و قسـەی زاهیـدان بۆیـان وەکوو شەریعەتی لێ هاتووە!

دەوتـرێ: ئـەبوو تـالیبی ئەلمـەککیی وتوویـە: لـە پێشـینان کەسـی وا هـەبوو ئەنـدازەی قاپێـك خـواردنی دەخـوارد، هـەموو ڕۆژ کـەمی دەکـردەوە!! ئەمـە شـتێکە نـە پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) زانیویـەتی و نـە هـاوەڵانی، ئـەوان بـێ تێربـوون دەیـانخوارد، بـەڵام بـەزۆر برسـیکردنی نـەفس نـەهی لێکراوە.

دەڵێـت: داوودی تـائی بـە سـوفیانی وت: ئەگـەر تـۆ ئـاوی سـارد دەخۆیتـەوە کـەی حـەز لـە مـردن دەکـەیت؟! ئـاوی لـە دنـگ دەخـواردەوە(دنگ دەفرێکـە ئاوی تێ دەکەن و لەژێر خاك دەنرێ تاوەکوو سارد نەبێ)!

نـەیزانیوە کـە نەفسـیش مـافی خۆی هەیـە و خواردنـەوەی ئـاوی گـەرم زیـان بـە گـەدە دەگەیـەنێ و پێغەمبـەری خـواش (صـلی الله علیـه وسـلم) ئـاوی سـارد دەکرد.

یەکێکی تریان دەڵێ: پەنجا ساڵە ئارەزووی گۆشتی برژاو دەکەم پارەیەکی خاوێنم دەست نەکەوتووە!! یەکێکی تر دەڵێ: حەز دەکەم گێزەرێك بخەمە ناو دۆشاو تا ئێستا بۆم نەلواوە!!

دەیانبینی دەنكۆڵەیەكیان دەوێت كە لەوەتەی لە سەرچاوەكەیەوە دەرچووە نەچووبێتە ناو شوبهەیەكەوە؟! ئەمە شتێكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەیری نەكردووە!! ئەگەرچی خۆپاریزی (ورع) باشە بەڵام نەك لەسەر بار و ئەركی قورس و گران.

ئەمە بیشری حافی دەڵێ: نامەوێ قسە بكەم چونكە حەز دەكەم قسە بكەم!!

ئەمە پاساوێكی نەگونجاوە چونكە مرۆڤ فەرمانی پێ كراوە هاوسەرگیری بكات و ئەوە لە گەورەترین ئارەزووەكانە.

(بیشر) پێخواس بوو تا پێی وترا: (حافی) پێخواس! ئەگەر جووتە پێڵاوێكی لەبەركردایە گونجاوتر بوو، پێخواسی ئازاری چاو دەدات و هیچ پەیوەندی بە دونیاشەوە نییە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوو پێڵاوی هەبوو.

ڕەفتار و ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی بەو شێوەیە نەبوو كە ئەمڕۆ زاهیدان لەسەرین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێ دەكەنی و گاڵتەی دەكرد و ژنی جوانی هەڵدەبژارد و پێشبڕكێی

لەگەڵ عائیشە دەکرد، گۆشتی دەخوارد و حەزی لە شیرینی بوو و ئاوی بۆ شیرین دەکرا..ڕێبازی هاوەڵانیشی لەسەر ئەمە بوو.

زاهیدەکان ڕێگەلێکیان دەرخست وەك ئەوەی بڵێی سەرەتای شەریعەت بێت و هەمووشی لەسەر ناڕاستەڕێ بوو و بەڵگە بە قسەی ئەلموحاسیبی و ئەلمەککی دێننەوە! هیچ یەکێکیان نە قسەی هاوەڵێك نە تابیعییەك نە پێشەوایەك لە پێشەوایانی ئیسلام ناکاتە بەڵگە!! ئەگەر زانایەك ببینن جلکێکی جوانی پۆشیوە یان ژنێکی جوانی هێناوە یان بەڕۆژوو نەبووە یان پێکەنیوە عەیبەی لێ دەگرن!!

پێویستە بزانرێ زۆربەی ئەوانەی مەبەست و نیازیان ڕاست و پاکە لەسەر ڕاستەڕێ نین لەبەر کەمیی زانستیان، تەنانەت هەندێکیان دەڵێن: ماوەی هەشتا ساڵە پاڵم نەداوەتەوە و ڕانەکشاوم!! یەکێکی تر دەڵێ: سوێندم خواردووە ساڵێك ئاو نەخۆمەوە!! ئەمانە لەسەر ڕێی ناڕاستن، چونکە نەفس مافی خۆی هەیە.

بەڵام ئەوەی نیاز و مەبەستی خراپە لەوانەی دووڕوو بووە و ڕووپامایی کردووە بۆ وەدەسهێنانی دونیا و دەست ماچکردن، ئەوانە هیچ قسەیەکیان لەگەڵ ناکرێ و زۆرینەی سۆفییەکان وەهان، جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگەکانیان پینە کردووە تاوەکوو خەڵك بە چاوی ئەوەوە بیانبینێ گوایە تەرکی جوانکارییان کردووە.. خەڵکی پێشینان لەبەر هەژاری پینەیان کردووە...بەڵام ئەمانە لەناو چێژ و خۆشی و کۆکردنەوەی ماڵ و وەرگرتنی

شـــوبوهات و بـــەكارهێنانی ئاســـوودەیی و ئیســـراحەت و یـــاری و تێكـــەڵبوونی دەســـەڵاتداران دان....ئەمانـــە دەمامكیـــان لابـــردووە و لـــە زوهـــدی بەراییـــەكانیان جیابوونەتەوە ! !

بەڵێ، سەیرتر لەوان ئەوەیە كە پارەیان لێ خەرج دەكات !

## ٣٦١- نموونەی مرۆڤ

خــوای گــەورە چــەند نموونەیــەکی بــۆ ئــادەمیزاد دانــاوە تــا پەنــدی لێ وەربگرێت:

لــە نموونــەکان دۆخــەکانی مــانگ کــە بــە بچــووکی دەســت پــێ دەکـات پاشـان کامـڵ دەبــێ و دەبێتــە تابان(چواردەشــەوە) پاشــان کــەم دەبێتــەوە و جـاری واش هەیــە شــتێکی بەســەردێ دەیشــێوێنێ وەکــوو گــیران، مــرۆڤیش ئەوهایــە: ســەرەتاکەی دڵۆپــەئاو و نوتفەیەکــە پاشــان لــە ناتەواوییــەوە بــەرەو چـاکبوون و تــەواوی دەڕوات، کــە تێروتــەواو بــوو وەکــوو مــانگی چــواردەی تــەواوی لێ دێـت، پاشــان حــاڵی بەلاوازییــەوە بــەرەو کەمبوونــەوە دەچـێت، ڕەنگــە بــەر لــەوە مــردن پــەلاماری بـدات وەکـوو پــەلاماری گـیران بـۆ ســەر مـانگ. شـاعیر دەڵێ:

والمرءُ مِثلُ هلالٍ عند طلعتهِ ... يبدو ضئيلاً لطيفاً ثم يتّسقُ

يزدادُ حتى إذا ما تمّ أعقبه ... كرُّ الجديدين نقصاً ثم يَنمحِقُ

مـرۆڤ وەکـوو مـانگی یـەك شـەوەیە، سـەرەتا کـەم و گچـکە و نیانـە پاشـان گـەورە دەبـێ و زیـاد دەکـات، کـە تـەواو بـوو هاموشـۆی شـەو و ڕۆژ بـەرەو کەمی دەبات پاشان ون دەبێ.

لـە نموونـەکانی حـاڵی مـرۆڤ، کرمـی ئاوریشـمە، سـەرەتا هێلکۆکەیەکـە تـا ئـەوەی ڕووەکـی هێـزی دەسـت پـێ دەکـات کـە گـەڵای تـووە، کـە گەڵایەکـە سـەوز بـوو گیـانی دێتـە بـەر، پاشـان وەکـوو منـداڵ لـە حاڵێکـەوە دەچـێتە حـاڵێکی تـر، پاشـان وەکـوو بێئاگـایی مـرۆڤ لـە سـەیرکردنی سـەرەنجامەکان دەخـەوێت، پاشـان بـەئاگا دێتـەوە لەسـەر خـواردن ڕژد دەبـێ وەکـوو ڕژدیـی چـلێس لەسـەر وەدەسـهێنانی دونیـا، پاشـان داوەکـانی ئاوریشـم لـە خـۆی دەئـاڵێنێ هـەروەکوو مـرۆڤ گوناهـەکان دەخاتـە سـەر شـانی، لـەم حەپسـەدا گـیر دەخـوات هـەروەك مـردوو لـە گـۆڕدا گـیر دەخـوات، پاشـان لەناودەچـێ و شـتێکی تـری لێ دێتـەدەر هـەروەك مردووەکـان بـە سـونەتنەکراوی و سـاغی زیندوو دەبنەوە.

خـودا زیندووبوونـەوەی بـە مـرۆڤ نیشـان داوە، سـەرەتا وەکـوو مردوویـەك نوتفەیەکـە پاشـان دەبێتـە مـرۆڤ، فڕێـدانی دەنکێـك بـۆ ژێـر زەوی کـە تێکدەچێت پاشان بە سەوزی دێتەدەرێ.

إذا المرءُ كانت له فِكرةٌ      ففي كلِّ شيءٍ له عِبرةٌ

ئەگەر مرۆڤ بیر و هۆشی هەبێ ئەوا لە هەموو شتێك پەندێکی تێدایە.

## ٣٦٢- وریای سەرەنجامەکان بن

گـەورەیی و فـەزڵی هـۆش و عـەقڵ بـە سـەرنجدان و وردبوونەوەیـە لـە سـەرەنجامەکان، بـەڵام کـەمهۆش تـەنها حـاڵی ئێسـتا دەبینـیێ و سـەیری سـەرەنجامەکەی ناکـات: دز بردنـی مـاڵ و پارەکـە دەبینـیێ و دەسـتبڕینەکەی بیردەچێت!

بێکـار و تەنبـەڵ چـێژی ئیسـراحەت دەبینـیێ و لەدەسچـوونی زانسـت و دەسـکەوتنی مـاڵی بیردەچـێتەوە، کـاتێ گـەورە بـوو و لـە زانسـت پرسـیاری لێ کـرا؟ نازانێـت، ئەگـەر ئاتـاج بـوو سـواڵ دەکـات و زەلیـل دەبـێ، ئـەو خـەم و خەفەتـەی دەیخـوات زیـاترە لـە چـێژی تەنبـەڵی، پاشـان بـە وازهێنـانی لـە کارکردن لە دونیا پاداشتی ئاخیرەتیشی لەدەست دەچێت.

هـەروەها مـەیخۆر، ئـەو سـاتە چـێژ وەردەگـرێ و ئـەو دەرد و بەڵایانـەی بیردەچێتەوە کە لە دونیا و ئاخیرەت تووشی دەبێ!

هـەروەها زینـا و داوێنپیسـی، مـرۆڤ ئەنجامـدانی شـەهوەتەکە دەبینـیێ و حەیاچـوونی دونیـا و حـەددی بیردەچـێتەوە، ڕەنگـە ژنەکـە مێـردی هـەبێ و منداڵەکە لەمەوە بەو بلکێنرێ و ئیتر بابەتەکە درێژبێتەوە...

قیـاس لەسـەر ئـەم کورتەیـە بکـە و وریـای سـەرەنجامەکان بـە و چـێژێك هەڵمەبـژێرە کـە خێرێکـی زۆرت لـەکیس دەدات و بەرگـەی ناخۆشـی بگـرە قازانجێکی فرەت دەست دەکەوێ.

## ٣٦٣- قەناعەت گەنجینەی زانا و زاهیدە

لە دونیادا ژیان نییە تەنها بۆ زانا یان زاهید نەبێ. بەڵێ، ڕەنگە هەندێ جار سەفای حاڵیان لێڵ ببێت ئەویش ئەوەیە کە زانا بە زانستەوە خەریکە یان لە کارکردن دادەبڕێ و ڕەنگە خێزانی هەبێ، لەوانەیە تووشی داواکردن لە سوڵتان ببێتەوە ئیتر حاڵی تێکدەچێ، هەروەها زاهیدیش.

پێویستە زانا و خواپەرست جووڵە بۆ پەیداکردنی بژێوی بکەن وەکوو: نووسینەوە بە کرێ یان کاری پەلکەخورما.. ئەگەر شتێکی دەست کەوت بە کەم قایل دەبێ و کەس نایکاتە کۆیلەی خۆی، هەروەکوو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرێیەکی هەبوو ڕەنگە نەگەیشتبێتە دینارێك بەڵام پێی دەژیا. هەر کاتێ قەناعەتی نەبوو ئەوا تێکەڵبوونی سوڵتان و ڕەشۆکییان دینەکەی لێ تێك دەدات و خراپ دەکات.

خەڵك هەیە دەیەوێ لە خواردندا فراوانکاری بکات، هەیانە لەگەڵ ژیانی وشك و سەخت ناسازێ، زۆر دوورە دین لەگەڵ وەدەسهێنانی چێژەکان ڕێك و ڕاست بێت!

ئەگــەر زانــا و زاهیــد بەوەنــدەی بەشــیان دەکــات قایــل بــوون ئــەوا هــیچ یــەکێکیان بــۆ ســوڵتان خــۆی نــزم ناکاتــەوە و بــە هامۆشــۆکردنی دەرگاکــەی ناکرێتە خزمەتکار و زاهیدیش ئاتاجی مەرایی و ماستاوکردن نابێ.

ژیـانی خـۆش بـۆ ئـەو دابڕاوەیـە کـە خـۆی سـووك و نـزم ناکـات و منـەتی کـەس هەڵناگرێ.

## ٣٦٤- جیاوازیی تێگەیشتن

خەڵك لە تێگەیشتندا چەندە لە یەکتر جیاوازن! تەنانەت زانایانیش لە بنچینە و لقەکاندا (الاصول و الفروع) زۆر جیاوازن:

خەڵکێك دەبینی فەرموودەکانی سیفاتی خوای گەورە دەبیستن و بەگوێرە و خواستی هەست لێکی دەدەنەوە وەکوو ئەوەی دەڵێن: خودا بە زاتی خۆی دێتە ئاسمانی دونیا و دەگوازێتەوە! ! ئەمەش تێگەیشتنێکی خراپە چونکە گوازراوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك دەبێ و ئەوەش وا پێویست دەکات شوێنەکە لەو گەورەتر بێت و پێویستی بە جووڵە هەیە، هەموو ئەوانەش بۆ خودا نابێ و ئەستەمە.

بەڵام لە لقەکانەوە (الفروع)، هەروەك لە داوودەوە گێڕدراوەتەوە کە لەبارەی فەرموودەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم): ((هیچ کەسێکتان میز لەناو ئاوێکی وەستاودا نەکات پاشان دەسنوێژی لێ بگرێت)) وتوویە: ئەگەر غەیر میزی تێدا کرد جائیزە ! !

لــه مەبەســتی پیســبوون تــێ نەگەیشــتووە بــەڵکوو فەرموودەکــەی تــەنها بــە واژە وەرگرتـــووە!! هـــەروەها دەڵـــێ: گۆشـــتی بـــەراز حەرامـــە نـــەك پێستەکەی!! پەنا بە خوا لە خراپ تێگەیشتن و بەدحاڵیبوون.

(لێرەدا نووسەر باسی چەند وردەکاریی چەند شیعرێك دەکات، بە پێویستم نەزانی وەریانبگێڕم چونکە بۆ خوێنەری کورد پێویست و گرینگ نییە).

## ٣٦٥- چێژەکانی دونیا

هەر کەسێك سەرنجی دایە دونیا دەزانێ کە ئەسڵەن هیچ چێژێکی تێدا نییە، ئەگەر چێژێکیشی دیت ئەوا بە ناخۆشی و تاڵی ئاوێتە کراوە کە چەندان هێندە لە چێژ زیاترە.

یەکێك لە چێژەکان ژنانن، ڕەنگە ژنی جوان جێگیر نەبێ و ڕەنگە مێردی خۆشنەوێت، هەر کاتێ پیاو ئەوەی زانی لێی دادەبڕێ، لەوانەیە ژنەکە ناپاکی بکات و ئەوەش لەناوچوونە، ئەگەر مەبەستەکان هاتنەدی، ئەوا باسکردنی دابڕان ئازاری لە چێژوەرگرتن زیاترە.

هەروەها منداڵ یەکێکە لە چێژەکان: وە موعاناتی کچ تا شوو دەکات و ئەو شتانەی لە مێردەکەیەوە تووشی دەبێ و ترسی عەیب و عاری، ئەمانە بەلا و مەینەتیی قێزەونن. وە کوڕیش ئەگەر نەخۆش کەوت دڵ دەتوێتەوە و ئەگەر بەد و خراپ بوو ئەوا خەفەت زۆر دەبێ، ئەگەر دوژمن بێت ئەوا ئامانجی مردنی باوکیەتی، پاشان ئەگەر مەبەستەکە هاتەدی ئەوا باسی دابڕانی دڵ دەتوێنێتەوە.

ئەگەر لەرێلادەرێك حەزی لە كوڕی لووسكەڵە بوو، لە دونیا ئابڕووی دەچێت و دینی دەڕوات پاشان زۆر نابات سیفەت و خووی دەگۆڕێ و لە لای خەڵك بوغزێنراو دەبێت لەپاڵ حەیاچوون و گوناهی پێشوو.

چەندان جار ڕوویداوە پیاو زەوقی هەستاوە و لەگەڵ كەنیزەكی ڕەش جووت بووە و منداڵەكەی ڕەش دەرچووە، ئیتر وەكوو عەیبەیەك بەسەریەوە مایەوە.

هەر لەم جۆرە، چێژوەرگرتنە لە ماڵ و لە وەدەسهێنانیدا گوناهگەلێك هەیە و دابڕانی خەفەتە و تەمەن ڕۆیشتن تێیدا دۆڕان و زیانە.

ئەمە نموونەیەكە بۆ ئەوانەی باس نەكراون!

كەسێك خودا یارمەتی دابێت پێویستە تەنها ئەو شتە پێویستانە دەست بخات كە سەلامەتیی دین و جەستە و لەشساغی تێدایە و دەسبەرداری ئەو ئارەزووە ببێت كە ناخۆشی و تاڵییەكەی چەندان هێندەی چێژەكەیەتی.

هەر كەسێكیش بە نیازی سوود لە سەرەنجامدا ئارامی گرت لەسەر ناخۆشی و حەز پێ نەكراوەكان ئەوا چەندان هێندە چێژ وەردەگرێ، وەكوو زانستخواز كە كەمێك ماندوو دەبێ و لەپاڵ سەلامەتیی سەرەنجام خێری دونیا و دوارۆژی دەست دەكەوێ.

بـۆ خـاترى خـودا لێ نەگـەڕێیت ئـارەزووى دونیـایى بەسـەرتدا زاڵ بێـت، هـەر كـاتێ ئـارەزوو هـەوڵى بـازدانى دا ڕێگـرى لێ بكـە و دونیـاى بـە دواڕۆژى بكێشە... تەنها خاوەن هۆش و عەقڵەكان بیردەكەنەوە.

## ٣٦٦- فرتوفێڵی ئیبلیس

دیتم ئیبلیس بە جۆرەها فرتوفێڵ، فێڵی لە خەڵك كردووە و زۆربەیانی لەو زانستە لاداوە كە چرای ڕێبوارە، وای لێكردوون لە تاریكاییەكانی نەزانیدا پەل بكوتن و بە كاروباری هەست سەرقاڵی كردوون، ئەوەی هەست پێی باش و جوانە ئەوانیش بە باش و جوانی دەزانن و ئاوڕ بە لای ڕاوێژی عەقڵدا نادەنەوە.

ئەگەر ژیانی یەكێكیان تەنگ و ناخۆش بوو یان تووشی نسكۆ و ساتمە بوو ئەوا ڕەخنە دەگرێ و كافر دەبێ:

هەیانە ئەوە دەداتە پاڵ ڕۆژگار! هەیانە جوێن بە دونیا دەدات! ئەمەش نزمی و سووكییە چونكە ڕۆژگار و دونیا نایكەن بەڵكوو ئەمە عەیبگرتنە لە تەقدیركار!!

هەیانە شتەكە بەرەو نكوڵیكردن لە حیكمەتی دەبات و دەڵێ: چ سوودێك هەیە لە هەڵوەشاندنەوەی بنیاتنراو؟!

هەیانە پێی وایە گەڕاندنەوەی هەڵوەشاوە تەسەووڕ ناكرێ و ئینكاری زیندبوونەوەیان كرد و دەڵێن: تا ئێستا كەس نەهاتۆتەوە! لەبیریان چوو

کە هێشتا بوون کۆتایی نەهاتووە، ئەگەر شوێنمان گیرایەوە ئەوا ئیمان بە غەیب دەبووە بە چاودیتن و بۆ بەڵگە لەسەر زیندوبوونەوە دروست نییە بە زیندووان بەڵگە بێنینەوە.

پاشان ئیبلیس سەیری کرد، لە موسڵمانان خەڵکێکی بینی زیرەکی و ژیرییان تێدایە، وای پیشاندان کە وەستان لەسەر ڕواڵەتەکانی شەریعەت حاڵەتێکە ڕەشۆکییان هاوبەشیانن، بۆیە زانستەکانی کەلامی بۆ جوان کردن و بە قسەکانی بوقرات و جالینوس و فیساگۆرس بەڵگەیان دێنایەوە!!

ئەمانە یاسادانەر نین و شوێنکەوتەی پێغەمبەرمان نین (صلى الله عليه وسلم)، بەڵکوو بە ئارەزووی خۆیان قسەی خۆیان کردووە.

پێشینان کە منداڵێکیان دەبوو بە لەبەرکردنی قورئان و بیستنی فەرموودە مەشغوولیان دەکرد، ئیتر ئیمان لە دڵیدا دەچەسپا، خەڵك لەمە سست بوونەتەوە، کوڕی زیرەك مەشغوول بووە بە زانستی سەرەتاکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فڕێ دەدات و دەڵێ: هەواڵگەلی تاك و تەران (أخبار احاد) و فەرموودەناسانیش ناویان دەنێن: حەشوییە! (خەڵکێك بوون تەنها بایەخیان بە ڕواڵەت دەدا).

ئەمانە باوەڕیان وایە کە زانستی ورد بریتییە لە زانستی بازدان و هەیوولی و ئەو بەشەی دابەش ناکرێ... پاشان بەرەو قسەکردن لەبارەی سیفاتی

خودا هەڵدەکشێن، بە قسەکانیان فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕەت دەکەنەوە:

موعتەزیلە دەڵێن: خودا نابینریٚ، چونکە بینراو لە شوێن و لایەك دەبیٚ! سەرپێچی فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکەن کە دەفەرمویٚ: ((ئێوە چۆن مانگ دەبینن ئەوها خوداتان دەبینن، لە بینینی ماندوو نابن.)) رواه البخاری.

ئەم فەرموودەیە هەڵبژاردنی دیتنی پێویست کردووە ئەگەر لە چۆنییەتیی دیتنەکەش دەستەوسان بین.

ئەم گەمژانە لە مەشغوولبوون بە قورئان دابڕاون و وتوویانە: قورئان مەخلوقە! ئیتر بەمە حورمەت و ڕێزی لەناو خەڵك نەما. لەبارەی سوننەشەوە وتیان: فەرموودەی تاك و تەران (أخبار احاد)! مەزهەبیان وەرگرتنە لە بوقرات و جالینوس. (أخبار احاد: ئەو فەرموودانەن کە یەك هاوەڵ لە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) گێڕاوەتەوە.)...

ئەوەی شوێن فەیلەسووفان کەوتووە سوودی ئەوەی وەرگرتووە لە کۆڵ ماندووبوونی نوێژ و ڕۆژوو بۆتەوە!

گەورەزانایان زەمی زانستی کەلامیان دەکرد تا ئەوەی شافیعی وتوویەتی: حوکمی من لەبارەیانەوە ئەوەیە سواری ئێستران بکرێن و حەیایان ببردریٚ

و ناویـان بزڕێنـری و بـوترێ: ئەمـە سـزای ئـەو کەسـەیە تـەرکی قورئـان و سوننەت بکات و بە زانستی کەلامەوە سەرقاڵ بێت.

تـا گەیشـتن بـەوەی پێیـان وابێـت کـە ئـەوەی نووسـینەوەی بەڵگـەی تەوحیـد نەزانی موسڵمان نییە ! !

بـۆ خـاتری خـوا نەکـەن تێکـەڵی بیدعەچـییان بـبن، دەسـت بـە قورئـان و سوننەتەوە بگرن ڕێی ڕاست دەدۆزنەوە.

## ٣٦٧- بەفیڕۆنەدانی کات

لـە بـەفیڕۆدانی کاتـدا دیـتم خـوو و عـادات بەسـەر خەڵکـدا زاڵ بـووە، پێشـینان هۆشدارییان لەوە داوە و لە کات بەفیڕۆدان ترساون:

فوزەیـل وتوویـەتی: کەسـی وا هەیـە دەیناسـم کـە وتـە و قسـەکانی لـە هەینییەوە بۆ هەینی دەژمێرێت!

چـوونە لای پیاوێـك لـە پێشـینان (سـەلەف)، وتیـان: پێدەچـێ مەشـغوولمان کردبیـت؟! وتـی: ڕاسـتیتان پـێ بڵـێم: دەمخوێنـدەوە، لەبـەر خـاتری ئێـوە وازم لە خوێندنەوەکە هێنا.

پیاوێـك لـە خواپەرسـتان هاتـە لای (سـەری ئەلسـەقیتی)، دیتـی کۆمـەڵێك لـەلای دانیشـتوون، وتـی: بوویتـە گـەوڕی بێکـار و تەنبـەڵان؟ پاشـان ڕۆیشـت و دانەنیشت.

هـەر کـاتێ سـەردانکراو (خانـەخوێ) نـەرم بـوو، سـەردانکەر (میـوان) تـەماعی تێ کرد و زۆر دانیشت ئەوا لە ئازار سەلامەت نابێ.

کۆمەڵێك لای مەعرووف دانیشتبوون، زۆر مانەوە، وتی: پاشای خۆر لە ڕواندنیدا سارد و بێتاقەت نابێ، ئەوە ئێوە ناتانەوێ هەستن؟!

یەکێك لەوانەی زۆر ئاگای لە کات و ساتەکان بوو (عامیر کوڕی عەبد قەیس) بوو، پیاوێك پێی وت: بوەستە قسەت لەگەڵ بکەم. وتی: هەتاو ڕاگرە.

داوودی تائی وردەنانی بەوشکی دەخوارد و دەیوت: لەنێوان خواردنی وردەنان و ناندا خوێندنەوەی پەنجا ئایەت هەیە.

عوسمان ئەلباقلانی بەردەوام زیکر و یادی خوای دەکرد، وتوویەتی: لە کاتی بەربانگکردنەوەدا هەست دەکەم ڕۆحم دەردەچێ لەبەر مەشغوولبوون بە خواردن و بێئاگابوونم لە زیکر.

یەکێك لە پێشینان ئامۆژگاریی هاوڕێکانی کرد و پێی وتن: کە لە لای من ڕۆیشتن پەرت بن، ڕەنگە یەکێکتان لە ڕێگادا قورئان بخوێنێت، چونکە هەر کات کۆببنەوە قسان دەکەن.

بزانە، کات لەوە بەنرخترە ساتێکی لێ بەفیڕۆ بچێت، لە صەحیحدا هاتووە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((هەر کەسێك وتی: سبحان الله العظيم، ئەوا بەم زیکرە دارخورمایەکی لە بەهەشت بۆ دەچێنرێت.)) رواه الترمذی و النسائی وابن حبان و الحاكم و البغوي.

مرۆڤ چەندان کات و سات بەفیڕۆ دەدات و تێیدا پاداشتی گەورەی لەدەست دەچێ.

ئەم ڕۆژانە وەکوو باخ و بێستان وان، وەك ئەوەی بە مرۆڤ وترابێت: هەرچەند دەنکێك بوەشێنیت قەزناغێکت بۆ بەرهەم دێنین، جا دروست و ڕەوایە کەسی ژیر لە تۆو وەشاندن بوەستێ و سستی بکات؟!

ئەوەی هاوکاریی مرۆڤ دەکات لە سوودوەرگرتن لە کات: تەنهایی و دابڕانە تا بتوانێت، تەنها سڵاوکردن یان پێویستییەکی گرینگی کەسێك کە تووشی دەبێ، کەمخۆری، چونکە زۆرخۆری هۆکاری نووستنی زۆر و لەدەستدانی شەوە.

هەر کەسێ سەیری ڕەفتار و ژیانی پێشینان بکات و باوەڕی بە سزا و پاداشت هەبێ ئەوا ئەوەی بۆم باسکرد بۆی ڕوون دەبێتەوە.

## ٣٦٨- باسی هەندێ ڕەفتار لەگەڵ ژنان

پێویستە مرۆڤی ژیر ژنێکی باش لە ماڵێکی باش هەڵبژێرێت کە هەژار بن تاوەکوو ئەوەی پیاوەکە بۆی دەهێنێت بەلایەوە زۆر بێت!

با کەسێك بێنێ کە لە تەمەندا لێی نزیك بێت، بەڵام ئەگەر پیرەپیاو کچۆڵەیەکی هێنا ئەوا کچەکە ئازاری دەدات و ڕەنگە بەرەو بێڕەوشتی بڕوات یان بیکوژێت یان داوای تەڵاق بکات و ئەویش خۆشی دەوێت ئیتر ئازار دەخوات، با پیاوەکە کەموکورتییەکەی بە ئاکاری جوان و زۆر خەرجکردن پڕ بکاتەوە.

نابێ ژن زۆر لە پیاوەکەی نزیك بێتەوە و پیاوەکە بێزار ببێت و لێشی دوور نەکەوێتەوە لەبیری بکات، با کاتی لێ نزیکبوونەوەشی پاکوخاوێن و جوان بێت.

با ژن وریا بێت لەوەی پیاو داوێنی یان هەموو جەستەی ببینێ چونکە جەستەی مرۆڤ جوان نییە! هەروەها پێویست ناکات جەستەی خۆی پێ نیشان بدات، بەڵکوو جوتبوون با لەناو جێدا بێت!

(ئەم قسانە ڕای نووسەر خۆیەتی و بنچینەی ڕاست و دروستی نییە، زانستی نوێی پەیوەندییەکان پێچەوانەی ئەمە دەڵێ و هەروەها زۆربەی بۆچوونی زانایانیش پێچەوانەی ئەم ڕایەن لەوەی بۆ ژن و پیاو دروستە هەموو جەستەی یەکتر ببینن).

ڕۆژێك کیسرا دیتی چۆن ئاژەڵ کەوڵ دەکرێ و لێ دەنرێ، سەرودڵی تێکچوو و حەزی بە گۆشت نەما، ئەوەی بۆ وەزیرەکەی باس کرد، ئەویش وتی: ئەی پاشا! خواردن لەسەر خوان و ژنیش لەناو جێگا! واتە: لەوە مەکۆڵەوە.

عائیشە وتوویەتی: ((نە من داوێنی پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) دیوە نە ئەویش هی من.)) ضعیف، رواه الترمذی..شەوێکیان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڕووتی هەستایەوە پێشتر جەستەیم نەبینیبوو..

ئەمە ژیری و گورج و گۆڵییە و بەوە پیاو عەیبە لە ژن ناگرێ چونکە عەیبەکانی نەبینیوە.

با ژن جێخەوی خۆی و پیاویش جێخەوی خۆی هەبێت، کۆنەبنەوە تەنها لە حاڵی کەماڵ و تێروتەواویدا نەبێ! (ئەمەش تەنها ڕای نووسەرە و لە ئێستادا یەکێك لە بنەماکانی خۆشەویستیی نێوان ژن و پیاو بەیەکەوە نووستنیانە نەك لێك دوورکەوتنەوە).

خەڵك هەیە سووك سەرنجی ئەم شتانە دەدات و ژن بە شەپڕێوی دەبینێ و دەڵێ: ئەمە باوكی منداڵەكانمە! ئیتر ئەویش شڕ و شەپڕێو دەبێ! ئیتر هەر یەكێكیان شتگەلێك لەویتر دەبینێ كە حەزی پێ ناكات و پێی خۆش نییە، بۆیە دڵیان تەرە دەبێ و هاوژیانی و جووتبوون بە بێ خۆشەویستیی ڕوودەدات.

ئەم بەشە پێویستە سەرنجی بدرێ و كاری پێ بكرێ، چونكە بنچینەیەكی گەورەیە.

## ٣٦٩- قنیاتکردن به کەم

لە دونیادا ژیانی ڕاستەقینە نییە تەنها بۆ کەسێك نەبێ کە بە کەم ڕازی و قایلە. چونکە هەر کات سووربوون لەسەر زێدەبژیوی زیاد بوو ئەوا خەم زیاد دەبێ و دڵ پەرت دەبێ و مرۆڤ دەکرێتە کۆیلە. بەڵام کەسی بەقنیات و قەناعەت، پێویستی بە تێکەڵبوونی کەسی سەرووی خۆی نییە و گرینگیش نادات بەوەی هاوشێوەی خۆیەتی چونکە لە هەبووندا وەکوو یەکن.

خەڵکانێك قەناعەتیان نەکرد و داوای ژیانی خۆشیان کرد دینی خۆیان عەیبدار کرد و خۆیان زەلیلی غەیر کرد بەتایبەتی زانستپەروەران، ئەوان سەردانی بەرپرسانیان کرد و ئەوانیش بەکۆیلەیان کردن، خراپە و شتی قێزەونیان دیت و نەیانتوانی نکوولّی لێ بکەن، ڕەنگە بۆ خۆپاراستن لە خراپەی، ستایشی ستەمکاریشیان کردبێت، ئەو زەلیلی و کەمدینییەی تووشیان بوو چەندان هێندەی ئەو شتانە بوو لە دونیا دەستیان کەوت.

ئەو کەسە حاڵی لە هەموو خەڵك ناشیرینترە کە داوای وەرگرتنی دادوەری و شایەتی دەکات یان قەبووڵیان دەکات. پێشتر ئەمانە دوو پۆست و ئاستی جوان بوون:

(عەبدولحەمیـــدی دادوەر) خـــزم خزمێنـــە و واســـیتەی لـــە کـــەس قـــەبووڵ نـــەدەکرد، ڕۆژێـــك نـــاردی بـــەدوای خەلیفـــە (ئەلموعتەزیـــد) و پێـــی وت: چـــەند وەقفێکت بە کرێ گرتووە، کرێیەکەی بدە! ئەویش دای.

موعتەزیـد پێـی وت: فـلان مـردووە و ئێمـەش پارەمـان لەسـەریەتی. پێـی وت: تـۆ لەبیرتـە کـاتێ ئـەم ئەرکـەت پـێ سپاردم پێت وتم: ئـەم کـارەم لـە ئەسـتۆی خـۆم کـردەوە و خسـتمە ئەسـتۆی تـۆ. ئەمـەی دەیڵێیـت قـەبووڵ ناکـەم ئـیللا بە دوو شایەت نەبێ.

هەروەها شایەتەکانیش وابوون:

کۆمـــەڵێك چـــوونە لای خەلیفەیـــەك، خزمـــەتکار وتـــی: بـــەوە شـــایەتی لەســـەر گـــەورەمان بـــدەن! ئـــەوانیش شـــایەتییان دا، (ئەلمـــەجزوعی) چـــووە پـــەناوە و وتـــی: ئـــەی مـــیری ئیمانـــداران! بـــەوەی لـــەم کتێبەدایـــە شـــایەتیت لەســـەر دەدەم؟ وتـی: شـایەتی بـدە. گـوتی: ئەوەنـدە بـەس نییـە، شـایەتی نـادەم تـا دەڵێیت: بەڵێ...وتی: بەڵێ.

بـەڵام لـە سـەردەمی ئێسـتامان، ئـەم بنـەما و یاسـایانە لـە کـن هـەمووان گـۆڕاون بەتایبـەتی کەسێك کـە بـە پـارە و مـاڵ لێـی نزیـك دەبنـەوە بـۆ ئـەوەی شـایەتی بـدات، دەیبینیـت ڕادەکێشـرێت بـۆ ئـەوەی شـایەتی لەسـەر شـتێك بـدات کـە نایبینێ و نەیبینیوە!

ئـەبوو ئەلمـەعالی کـوڕی شـافیع پێـی وتم: دەبرامـە کـن هەنـدێ خـەڵکی عێـراق کـە بەنـدکراو بـوو و شـایەتیم لەسـەری دەدا، دەزانم ئەگـەر فرتـوفێڵی نەبووایـە بە قاچەکانی دەهاتە لام، من لەوە داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم.

شـایەتەکان هـیچ کرێیـەکیان نییـە تـا لەپێناویـدا ئـەوە بکـەن، بـەڵکوو ئـەوەی ڕوودەدات ڕاکێشـانی شـاڵی سـەوز و لـە دەرگـادان و قسـەی ناسـێنەرە: خـودا بە شایەتیت نیعمەتەکەت بپارێزێ!

کـاتێ بـە ئیـبراهیم ئەلنەخـەعی وتـرا: دەبیتـە دادوەر! کراسـێکی سـووری لەبەرکرد و لە بازاڕ دانیشت، وتیان: ئەمە ناگونجێت!

هەنـدێ پیـاوی گـەورە چـوونە لای هـاڕوون ئەلڕەشـید – ئەویشـی هێنـابوو دادوەریـی پـێ بسـپێرێ – سـڵاوی کـرد و پێـی وت: ئـەتوو و منداڵـەکان چۆنن؟ وترا: ئەمە شێتە!

ئـای خوایـە! ئـەم شـێتییە هـۆش و ژیرییـە. پـێم وایـە ئیمـان بـە دوارۆژ لـە زۆربـەی دڵـەکان هـەژاوە، لـە خـوای گـەورە داوای سـەلامەتی لـە دیـن دەکـەین، ئەو توانادارە.

## ٣٧٠- ڕازیبوون بە قەدەر

ڕەنگە واتای ئەمانە لەم کتێبەدا دووبارە بووبنەوە بەڵام دووپاتکردنەوەی لەسەر دڵەکان گرینگە نەوەك لە هاوشێوەی و وێنەیان بێئاگا بین:

پێویستە ئیماندار بزانێت خوای گەورە خاوەنداری دانایە و یاری و گاڵتە ناکات. ئەم زانستە وا پێویست دەکات ڕەخنە و پەڵپ لە قەدەر نەگرین. خەڵکێك ڕەخنەیان گرت و تانەیان لە قەدەردا، ئەوەش کوفرە. یەکەمیان ئیبلیس بوو کە وتی: ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾ (ص: ٧٦) واتە: من لەو باشترم، منت لە ئاگر و ئەوت لە قوڕ دروست کردووە.

واتای قسەکەی ئەوەیە کە بە خودای وت: تەفزیلکردن و باودانی قوڕ بەسەر ئاگرەوە حیکمەت نییە.

ئەمە لەبەرئەوەیە چونکە ڕەخنەگر سەیری شێوە و ڕووکەشی کردارەکە دەکات، ئەگەر شێوەی کردارەکە لە مەخلووقێکی هاوشێوەی خۆمان دەرچووبێت ئەوا ڕەخنە لێگرتنی باش و ئاسایی بوو بەڵام لەبارەی ئەو زاتەی کە فامەکان لە زانین و ئاگاداربوونی حیکمەتی نەقوستانن ئەوا ڕەخنەگرتنی ناتەواو و نەقوستانی نەزان لەو خودایە شێتییە.

بەڵام ڕەخنەگرتنی دۆڕاو و بێ ئابڕووەکان ئەوا بەردەوامە چونکە دەیانویست شتەکان بە دڵ و مەبەستی ئەوان بەڕێوە بچێت، هەرکاتێ شتێك بە دڵی یەکێکیان نەبوو ئەوا ڕەخنە دەگرێ، هەیانە دەچێتە سەر باسی مردن و دەڵێ: بنیاتی نا و هەڵیوەشاند!

هاوڕێیەکمان هەبوو، قورئان و قیرائاتی خوێند و فەرموودەیەکی زۆری بیست، پاشان کەوتە نێو تاوانەوە و زیاتر لە حەفتا ساڵ ژیا، کاتێ مردن یەخەی گرت بۆیان باس کردم وتوویە: دونیا تەنها لە ڕۆحی من تەنگ بوویەوە!

لەم جۆرە لە کەسێکم بیست لە کاتی مردندا دەیگوت: خواکەم ستەمم لێ دەکات!!

لەمە زۆرە و باش نییە باسی قسەی دۆڕاو و بێ ئابڕووەکان لەبارەی شێتی و ڕەخنە ساردوسڕەکانیان بکەین.

ئەگەر تێگەیشتبان کە دونیا گۆڕەپانی پێشبڕکێ و نەخۆشخانەی ئارامگرتنە تاوەکوو بەوە شوێنەواری خودای خولقێنەر ڕوون بێتەوە ئەوا ڕەخنەیان نەدەگرت، ئەو سەلامەتی و گەیشتنە ئامانجانەی داوایان کردووە وا لەبەردەمیانە ئەگەر تێگەیشتبان، وەکوو ئەو قوڕکارەی جلوبەرگی بە قوڕ پیس دەبێ کە تەواو بوو جلکی خاوێن لەبەردەکات.

کاتێ ویسترا ئەم جەستەیە کە بە کەڵکی مانەوە نایەت هەڵبوەشێنرێتەوە نەفسە بەڕێزەکەی لێ لادرا و بە شێوەیەك بنیات نرایەوە کە بەردەوام بێت.

دوای ئەمە بە ڕەخنەگر بڵێ: ﴿فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾﴾ (الحج: ١٥) واتە: دەبا پەتێك بە بەرزییەوە هەڵبواسێت (ملی خۆی پیادا بکات) ئینجا بیبڕێت و خۆی بخنکێنێت با تەماشا بکات و بزانێت ئەو پیلان و فێڵ و نەخشەیەی، ڕق و کینە و بوغزی لادەبات؟!

پێی بڵێ: ئەگەر ڕەخنەی گرت، ئەوە ڕێ لە بەڕێوەچوونی قەدەر ناگرێ، ئەگەر تەسلیم بوو ئەوا قەدەر ڕێچکەی خۆی دەگرێ، جا قەدەر بڕوات و ئەویش پاداشتکراو بێت باشترە لەوەی بڕوات ئەو گوناهبار بێت.

بێدەنگیی (وضاح الیمن) چەند باش و جوان بوو کاتێ خۆی لە سندووقێکدا شاردەوە، سوڵتان وتی: ئەی سندووق! ئەگەر ئەوەت تێدایە کە گومان دەبەین ئەوا شوێنەوارمان سڕیتەوە، ئەگەریش نەبوو ئەوا شاردنەوەی تەختەدارێك گوناه و تاوان نییە. ئەگەر هاواری کردبا هیچ سوودێکی وەرنەدەگرت، ڕەنگە دەربهێنرایە و بە ناشیرینترین شێوە بکوژرایە.

## ٣٧١- دوورکەوتنەوە لە دونیا

هەر کەسێك سەرنجی حاڵوباری دونیا بدات دەزانێ مەبەستی خودا لێ دوورکەوتنەوەیەتی؟

هەر یەکێ مەیلی ڕێپێدراوی دونیا بکات بۆ چێژوەرگرتن ئەوا لەگەڵ هەر خۆشییەك خەمێك دەبینێ، لەپاڵ هەر ئیسراحەتێك ماندووبوونێك، لە کۆتایی هەموو چێژێك ناخۆشییەکی زیاتر، هیچ شتێك لە دونیا بەرز نەکراوەتەوە ئیللا نزم کراوەتەوە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عائیشەی خۆشویست، قسە و باسی (ئیفك) هات، مەیلی زەینەبی کرد ئەمە هات: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا﴾ (الأحزاب: ٣٧) واتە: کاتێ زەید پێویستی پێی نەما..

پاشان ئەوەندە بەسە ئەگەر خۆشەویستەکەی بەدەست هێنا خودی عەقڵ جیابوونەوەی پێ باشە، بۆیە لە کاتی بوونیدا خەم و خەفەت دەخوات، هەروەك شاعیر دەڵێ:

أتمّ الحزن عندي في سرور تيقّن عنه صاحبه انتقالا

کەسی ژیر دەزانێ کە مەبەستی خودا لەم ناخۆشکردنە دوورخستنەوەیەتی لە دونیا، ئیتر بای پێویست لە دونیا وەربگرێ و واز لەو شتانەی تر بێنێ کە مەشغوولی دەکات، ئیتر بیر و خەم بۆ خزمەتی هەق جەم دەبێ، هەر کەسێ لەمە لابدات ئەوا لەسەر لەدەستدان و لەدەسچوون پەشیمان دەبێتەوە.

## ٣٧٢- كەسی ژیر

كەسی ژیر ژیانی لە دونیا بە هۆش و ئاوەزەوە بەڕێ دەكات و ڕێك دەخات:

ئەگەر هەژار بوو كار و پیشەیەك دەكات كە لە زەلیلی بۆ خەڵك بیپارێزێت، پەیوەندییەكان كەم دەكاتەوە و قنیات بەكاردێنێ، ئیتر دوور لە منەتی خەڵك و سەربەرزانە لەنێویاندا دەژی.

ئەگەر دەوڵەمەند بوو پێویستە لە خەرجكردندا بەتەگبیر و ڕێكخستن بێت لە ترسی ئەوەی نەوەك هەژار بكەوێت و حەوجە و زەلیلی دەستی خەڵك بێت، بەڵا ئەوەیە لە خەرجیدا دەسبڵاوی بكات و شانازی پێوە بكات تا خەفەت بداتە دوژمنانی، وەك ئەوەی بەوە خۆی تووشی چاوەزار بكات! پێویستە لە هەموو حاڵەكاندا مامناوەند بێت و ئەوەی دەكرێ بشاردرێتەوە بیشارێتەوە.

تەگبیر و ڕێكخستن بریتییە لە پاراستنی ماڵ و دارایی و مامناوەندبوون لە خەرجكردن و شاردنەوەی ئەوەی دەرخستنی باش و گونجاو نییە.

هەڵیە ژن لە بڕ و ئەندازەی ماڵ ئاگادار بکرێت، چونکە ئەگەر کەم بێت پیاوەکەی لە کن سووك دەبێ و ئەگەریش زۆر بێت داوای زێدەخەرجی لە جلوبەرگ و خشڵ دەکات! خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ﴾ (النساء: ٥) واتە: ماڵ و داراییتان مەدەنە دەست نەفامەکانتان..

کوڕیش بە هەمان شێوە..

هەروەها نهێنییەکان پێویستە بپارێزرێن و لەو و لە هاوڕێش وریا بیت، ڕەنگە هاوڕێ بگۆڕێ و هەڵگەڕێتەوە، شاعیر وتوویە:

احذر عدوّك مرّة ... واحذر صديقك ألف مرة

فلرّبما انقلب الصديق ... فكان أعلمَ بالمضرّة

یەك جار وریای دوژمنەکەت بە بەڵام هاوڕێکەت هەزار جار، چونکە ڕەنگە هاوڕێ هەڵگەڕێتەوە و باشتر کەموکورتییەکانت دەزانێ و چاکتر دەتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ.

سوپاس بۆ خوا ئەوەی بیری لاواز دەیویست لە کۆکردنەوەی بەرهەمی قەڵەم لە شکاری هزر هاتەدی، تێیدا باسی وازهێنان لە نەخۆشییە دەروونییەکان و خۆڕازاندنەوە بە ئادابە شەرعییەکان و ڕەوشتە جوانەکان کراوە، خوای گەورە بیکات بە باشترین ڕێنوێن لەسەر مینبەری ئامۆژگاری و ڕێنیشاندان و بیگێڕێ بە سوودبەخشترین کتێب بۆ هیدایەتی بەندەکان..

لە سەرەتا و کۆتایی هەر سوپاس و ستایش بۆ خودا، درووود و سڵاو لەسەر گەورەمان موحەممەد و یار و یاوەرانی.

٢٠٢٠/١٠/٣٠....هەولێر

## ناوەڕۆك